

# مێژووی نووسینەوەی فەرمووده و گومانەکانی ڕۆژهەڵاتناسان


د.حاکم عبیسان موتێڕی

وەرگێڕانی: سەرهەنگ عەبدولواحید قادر



لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٦٥)



مێژووی نووسینەوەی فەرمووده و گومانەکانی ڕۆژهەڵاتناسان

د.حاکم عبیسان موتێڕی




فەرموودەکانی پێغەمبەر سەرچاوەی دووەمن لە سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلامی، (سوننەت)یش وتە و کردار و دانپێدانان (تقریرات) ەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەگرێتەوە، قورئانی پیرۆز شوێنکەوتنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) و گوێڕایەڵکردنی لە زۆر ئایەتدا پێویست کردووە، فەرموودەش هەروەک ڕوونکەرەوەی قورئانی پیرۆزە پەرتوکێکی ڕاڤەییشە بۆ دەقەکانی، وەک ئەو یاسایانەی گوزارشت لە بنەما گشتییەکان دەکەن کە دەستوری سیستەمەکانی ئەم ڕۆژگارە لەخۆیدەگرن.

ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکە بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێک لایەنی گرنگی ئەم بابەتە، کە تا ئێستاش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی زیاترە تا چارەسەری کێشەکانی بکات، وەڵامی ئەو پرس وگومانانە بداتەوە کە لەلایەن ڕۆهەڵاتناسانەوە وروژێنراوە کە دەنگۆکەیان لە هەندێک لە ناوەندی ڕۆشنبیریی عەرەبی و ئیسلامیی ئەم سەردەمەدا دووبارە دەکرێنەوە.



# مێژووی نووسینەوەی فەرموودە و
# گومانەکانی ڕۆژهەڵاتناسان

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی
بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی ژمارە ( ٦٥ )

- وەرگێڕانی: سەرهەنگ عەبدولواحید قادر.
- بابەت: ئاینیی.
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد.
- چاپ: یەکەم. ٢٠١٨ - ناوەندی ڕینوێن.

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (٣٦٢ )ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.

سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
www.zahawi.org
ناونیشان: شەقامی سالم
تەلاری جەمالی حاجی عەلی نزیک پردی خەسرەوخاڵ
07702422171

## ناوەڕۆك

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی وەرگێڕ

سوننەتی پێغەمبەر (درورد و سلاوی خودای لێبێت) دووەم سەرچاوەی شەریعەتە، چونکە سوننەت ڕوونکەرەوە و شیکەرەوەی قورئانی پیرۆزە، خودای گەورە هەروەك چۆن قورئان فێری کردووین و پاراستویەتی، بەهەمان شێوە سوننەتی فێرکردووین و پاراستوویەتی، هەروەك دەفەرموێ: ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِنْكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُمْ مَا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ﴾.(البقرة١٥١)، واتە: (هەر وەکو "بۆ تەواوکردنی ناز و نیعمەتم" لەنێوتاندا پێغەمبەرێکم لە خۆتان بۆ ڕەوانەکردوون، کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروون و ڕوواڵەت و ئاشکراتان خاوێن دەکاتەوە، فێری قورئان و حیکمەت و داناییتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات، کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی). جا زانایان دەڵێن: (الحكمة) واتە: سوننەتی پێغەمبەر (درورد و سلاوی خودای لێبێ).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾(الحجر٩)، واتە: (بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین "و نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە شتێکی تێبخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاریکردنی نەزۆکە"). زانایان دەڵێن: وشەی (الذکر) نەك تەنها قورئان، بەڵکو سوننەتیش دەگرێتەوە، هەروەك زاراوەی سرووش (وەحی) هەردووکیان لەخۆدەگرێت. پەکخستن و بەدرۆزانینی سوننەت، بەبێ ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە فەرمووەدەناسان باسیان لێوەکردووە، بەلایەنی کەم پەکخستنی نیوەی پەیامی خودای بالادەستە، بۆیە بەدڵنیاییەوە گومانم هەیە بەرامبەر بەو کەسانەی ناویان لە خۆیان ناوە قورئانی، کە باوەڕیان بە قورئان بێت، لەم سەردەمەماندا هێرشێکی ناڕەوا دەکرێتە سەر سوننەت، لە هەموو لایەکەوە دژبەرانی ئەم پەیامە دەخوازن گومان لەسەر سوننەت دروست بکەن و موسوڵمانان سارد بکەنەوە، چونکە بە دوورخستنەوەی سوننەت لە شانۆی

ژیـان، واتــه پەكخسـتنی كـاركردن بـه نـاوەڕۆك و مەبەسـتی قورئـان، بـەلاّم نـاتوانن و بەدڵنیاییەوە شكسـتدێنن، چـونكە مێـژووی نووسـینەوەی فـەرمووده ئەوەنـده زولاڵ و ڕوونـه بـۆ خـۆی، خـرت و خاڵەكـەی كـه سـوننەت نییـه فڕێـی دەداتـه كـەنار. لـه كوردستانیش بەم دواییانه هێرشكردن بۆ سەر فـەرمووده چـووەته قۆنـاغی دیـاردەوە، بۆیه هەتا موسوڵمانانیش جاری وا هەیه خۆیان ئەم گومانانـه دووبـاره دەكەنـەوە، جـا له نیازپاكی بێت، یاخود شتی دی.

ئاشنایەتی من لەگەڵ ئەم پەرتووكه كاتێك بـوو، كـه لەگـەڵ چـەند كەسێك لەسـەر سوننەت گفتوگۆمان كرد، ئەوان خۆیان یەكلایكردبووه باوەڕیـان نـەماوه بـه سـوننەت، بۆ بەرگری لەم باوەڕەشیان چەندین گومانیان دەوروژاند، لەوانـه: پـاش دووسـەد یـان سێسەد ساڵ سوننەت نووسراوەتەوە! پێغەمبەر (درووده خـودای لێبێـت) بـه ڕەهـایی قەدەغەی كردبوو سوننەت بنووسرێتەوە! ئەمانه و چەندین گومـانی تـر. پـاش ئـەوەی وەلاّمی ئەم گومانانەم دایەوە، منیش بڕیارمـدا كـه وردتـر لـەوبارەوە بخوێنمـەوە، ئـەم پەرتووكەش یەكێك بوو لەوانەی كه خوێندمەوە، جا لەبەر پـوختی و بـەهێزی و وردی و تۆكمەیی له ڕەواندنەوەی زۆربەی گومانەكان، بڕیارمدا كه بۆ موسـوڵمانی خۆشەویسـت و خوێنەری حەقویست و توێژەرانی ئەكادیمی بیخەمه سەر زمانی كوردی.

لەكۆتاییدا، له خـودای گـەوره داواكـارین لێمـان وەرگرێـت و بیخاتـه سـەر كـردەوه چاكەكانمان. سوپاس و پێـزانین بـۆ هـەر سـێ بـرای بـەڕێز: (زێبـار عزیزخـان، مهـاجیر محەممەد، ئەبوبەكر پشدەری)، بەوەی ئـەركیان كێشـا لـه پێداچـوونەوە و هەڵەچـنینی ئەم بەرهەمە، هەروەها سوپاسی سەنتەری زەهـاوی بـۆ لێكۆڵینـەوەی فیكریـی دەكـەم كه ئەركی لەچاپدانیان گرته ئەستۆ، هـەروەها زۆر سوپاسـی بـەڕێز د.دیـاری ئەحمـەد قەساب دەكەم كه پێداچوونەوەی وردی بۆ ناوەرۆكی كتێبەكه كرد، تكـام وایـه خـودای گەوره به گەورەیی خۆی پاداشتیان بداتەوە.

وەرگێڕ

سەرهەنگ عبد الواحد

# پێشەکی ( ئە نجومەنی بڵاوکردنەوەی زانستی- زانکۆی کوەیت )

سوپاس و ستاییش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، درووود و سڵاو لەسەر پێغەمبەرمان موحەمەد، هەروەها لەسەر خانەوادە و هاوەڵانی. ئەم توێژینەوەیە بەشێکە لە نامەی توێژینەوەی نووسەرە بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا لە لایەن (مركز الدراسات الإسلامية) لە زانکۆی (بێرمینگهام – ئینگلتەرا) بە ناونیشانی: (ساغکردنەوەی پەرتووکی: (إحكام الذريعة إلى أحكام الشريعة)، دانراوی: (الحافظ السرمري الحنبلي)، لەگەڵ لێکۆڵینەوە لە قۆناغەکانی نووسینەوەی فەرموودە و تاوتوێکردنی بۆچوونی خۆرهەڵاتناسان لەم بارەوە).

پێم وابوو کە ئەمە زۆر گرنگە بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی عەرەبی، کە تا ئێستا پێویستی زۆری بەو توێژینەوە ئەکادیمیانەیە، کە لە زانکۆکانی ڕۆژئاوا پێشکەشکراون لەسەر ئیسلام، مێژووەکەی، سەرچاوە یاساییەکانی وەربگێڕدرێن، ئێمەش ئەم دوو بەشەمان هەڵبژارد لە نامەکەدا (مێژووی نووسینەوەی فەرموودە) و (گومانەکانی ڕۆژهەڵاتناسان دەربارەی نووسینەوەی)، لەگەڵ هەندێك لە بەشی سێیەم(پەرتووکەکانی فەرموودە فیقهییەکان)، لەوانەیە خوێنەر شتێکی نامۆ و سەیر ببینێت لە نمایشکردن، یاخود شێوازەکەی، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەمە لە بنەڕەتدا بۆ دوواندنی عەقڵی ڕۆژئاوایی و گفتوگۆکردن لەگەڵی نووسراوە، ئەو عەقڵەی کە ڕێگەی بیرکردنەوەی، شێوازی، ڕۆشنبیرییەکەی جیاوازە لە عەقڵی عەرەبی.

بەڵکو ئەم توێژینەوەیە هەوڵێك بێت بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێك لایەنی گرنگی ئەم بابەتە، کە تا ئێستاش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی زیاترە، بۆ چارەسەری کێشەکانی و وەڵامی ئەو پرسانە بدەداتەوە کە دەربارەی نووسینەوەی فەرموودە لێرە و لەوێ دەوروژێنرێن.

# پێشەکی

فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ)، سەرچاوەی دووەمە لە سەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلامی، (سوننەت)یش وتە و کردار و دانپێدانان (تقریرات)ەکانی [1] پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) دەگرێتەوە، قورئانی پیرۆز شوێنکەوتنی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) و گوێڕایەڵیکردنی لە زۆر ئایەتدا پێویست کردووە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ﴾ (آل عمران٣١)، واتە: (بە ئیمانداران بڵێ: ئەگەر ئێوە خوداتان خۆشدەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەو کاتە خوداش ئێوەی خۆشدەوێت). هەروەها دەفەرموێت: ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ (النساء٨٠) ، واتە: (ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) بکات، ئەوا بەڕاستی فەرمانبەرداری خودای کردووە).

فەرموودەش ڕوونکەرەوەی قورئانی پیرۆزە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت[2]: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ (النحل٤٤)، واتە: (ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند، تا بۆ خەڵکی ئەوە ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە). فەرموودە بۆ قورئان وەك ڕێبەرێکی ڕاڤەییە بۆ دەستوور بە زمانی ئەم ڕۆژگارە، وەك ئەو یاسایانەی گوزارشت لە بنەما گشتییەکان دەکەن کە دەستووری سیستەمەکانی ئەم ڕۆژگارە لەخۆیدەگرن.

---

١- بڕوانە: فصول في الأصول للجصاص (٣/٢٣٥)، والإحكام في أصول الأحكام، ابن حزم (٢/٦)، ط٢، ١٤٠٨هـ، تحقيق: أحمد شاكر، كراتشي، هەروەها: (١/٩٦)، و (١/١٠٤)، و (٤/١٢٨)، ومجموع فتاوى ابن تيمية (١٨/٧)، وإرشاد الفحول للشوكاني (٣٣).

٢- بڕوانە: الرسالة للإمام الشافعي (٣٣).

ئەمە هۆکاری سەرەکی بوو کە وای لە هاوەڵە زاناکان و ئەوانەی دوایش کرد کە وەك لەبەرکردن، نووسینەوە، فەتوا و دادوەریکردن، زانست و کردار، وەك تێگەیشتن و یادخەرەوەیەك، گرنگییەکی زۆری پێبدەن، تاکو(زانستی فەرموودە) هونەرەکانی دەرکەوتن، ئەو پەرتووکانەی لەبارەی (فەرموودە) و(فەرموودەکانی پێغەمبەر) نوسران، گەیشتووەتە هەزاران پەرتووك، هەزاران زانا بەشداری تێدا کردووە، هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە تا ئەم ڕۆژگارەی ئێستا[1].

لەنێوەندی زانستی و هەروەها لای هەندێك بیرمەند و توێژەرانی ئەم ڕۆژگارە، کە گرنگی بە فیقهی ئیسلامی و سەرچاوەکانی یاسادانان (قورئان و سوننەت) دەدەن، ئەوە لاسەنگ دەکەن و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە (فەرموودە) بەردەوام تا سەدەی دووەمی کۆچی بە زارەکی گواستراوەتەوە و گێڕدراوەتەوە، پاشان دوای ئەم کاتە درێژە، نووسینەوە دەستیپێکردووە، ئەمەش گومان لە دروستی فەرموودە دروست دەکات!

بێگومان ئەم بۆچوونە پێویستی بە زیاتر لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوەیە، بۆ دۆزینەوەی ڕادەی دروستی و بەراوردکردن لەگەڵ واقیعدا.

پێش ئەوەی دەست بە توێژینەوەی ئەم بابەتە بکەین پێویستە باس لە چەند شتێك بکەین، کە هاوکار دەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی چەند لایەنێکی ئەم بابەتە:

**یەکەم:** جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان وشەکانی: (تدوین) و (تألیف) و (تصنیف) ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە، جیاوازی هەیە لەگەڵ وشەی نووسینەوە(کتابة) لە زمانی عەرەبیدا.

---

١- بڕوانە: الرسالة المستطرفة للكتاني. کە چەندین لە پەرتووکەکانی فەرموودەی باسکردووە.

ئەم سیٚ وشەیەی سەرەتا، واتا پەرتووکێك نوسراوەتەوە، کە لە چەندین پەڕاو پێك هاتووە و لەنێوان دوو بەرگ، بەشێوەیەك کۆی هەموو ئەمە پەرتووکێك پێك دێنێت، یاخود پێیدەوترێت: (پەرتووك).

(الديوان): کۆی صەحیفەکان[1]، ئەو پەراوەی کە تێیدا دەنووسرێت[2].

(التدوين): کارەکە و دروستکردنی دیوانەکە.

(التأليف): کۆکردنەوەی ئەو ماددە جیایانە و پێکەوەنانی و بەشێوەیەك ببێتە پەرتووکێك،[3] ئەویش پێی دوترێت: موئەللەف(مُؤَلَّف).

(التصنيف): بریتییە لە جیاکردنەوە[4] و ڕێکخستن و پۆلینکردن، بەشێوەیەك ببێتە پەرتووکێك کە بەسەر چەند بەشێك دابەشکرابێت.

سەبارەت بە (الكتابة): بەشێوەیەکی گشتی هیچ مانایەك نادات، تەنها نووسین، یاخود ژمارە لەسەر پەڕاوێك، یاخود تابلۆیەك، یاخود دیوارێك. لە پەرتووکی (اللسان)دا هاتووە: (كتب الشئ... خطه)[5]. هەروەها بە پەڕاو یاخود سەحیفە، یاخود پەیامێکی نوسراو دەوترێت: (كتاب)[6].

پێویستە بە وردی لەو وێژانە بگەین، بۆ ئەوەی بە ئاسانی مەبەستی زۆرێك لەو زانایانەی کۆن بزانین کە قسەیان لەسەر ئەم بابەتە کردووە. بەڵکو پێویستە لە زاراوەی هەموو زانست و هونەرەکان بگەین و ڕەچاوی بەرەوپێشچوون و

---

١- لسان العرب: مادة (دون).

٢- النهاية في غريب الحديث.

٣- لسان العرب: مادة (ألف). تعريفات الجرجاني، علي بن محمد الشريف الجرجاني (٥٠) حرف التاء.

٤- لسان العرب: مادة (صنف).

٥- لسان العرب: مادة (كتب).

٦- لسان العرب: مادة (كتب).

جیاوازی ئاماژەکانی بکەین، لەنێوان ئەم سەردەمە و یەکێکی تر، چونکە ئەمە دەروازەی هەرە دروستە بۆ تێگەیشتنی هەر بابەتێك بە دروستی.

کەواتە پێویستە ڕەچاوی ئاماژەکانی ئەم وێژانە بکەین لە کاتی توێژینەوەی ئەم بابەتە، بە نموونە: وتەی تورمزی: (زیاتر لە ئیمامێکمان بینی کە دەستی بە کاری ڕێکخستن و دەروازەدانان، یاخود پۆلێنکردن (التصنیف) کرد، کە پێش ئەوان هیچ کەسێك ئەم کارەی نەکردبوو ...)[١]، یاخود وتەی ئیبن حەجەر: (لە کۆتاییەکانی سەردەمی شوێنکەوتووان، وتەکانی هاوەڵان بە پەرتووك کران و هەواڵەکانیش بەش بەش کران و دەروازەیان بۆ دانرا)[٢].

یاخود ئەو وتەیان کە دەڵێن: (یەکەم کەس کە زانستی لە پەرتووکێك نووسییەوە و کۆیکردەوە ئیبن شیهاب بوو)[٣]. هاوشێوەی ئەم گوزارشتانە کە لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی پێشتر ڕوونکرایەوە تێدەگەیت لە جیاوازی نێوان ئەم گوزارشتانە لە کاتی بەکارهێنانی. هیچ ناکۆکییەك لەنێوان ئەو وتانەیاندا نییە کە دەڵێت: (التصنیف) و (التدوین) دەروازەبۆدانان و نووسینەوەی لە چوارچێوەی پەرتووکێك لەکۆتایی سەردەمی شوێنکەوتووان (تابعین)، هەروەها لەنێوان ئەو وتەیەی ئەوان کە هاوەڵان و شوێنکەوتووان فەرموودەکانیان دەنووسییەوە، یاخود سەحیفە و پەرتووکی خۆیان هەبوو[٤]. هەروەك دواتر لە توێژینەوەکە باسی دەکەین.

---

١- سنن الترمذي (٥/٦٩٤): كتاب (العلل الصغير) کە لە کۆتایی (السنن)دا چاپکراوە.

٢- هدي الساري مقدمة فتح الباري (٦).

٣- سير أعلام النبلاء (٥/٣٣٤).

٤- لەبەر ئەوە دکتۆر موحەمەد مستەفا ئەعزەمی بە هەڵەدا چووە، کاتێك لە دەستەواژەی حافزی ئیبن حەجەر تێنەگەیشتووە کە وەریگرتووە و گفتوگۆی لەبارەوە کردووە و هەوڵی داوە ڕاڤەی بکات، تێبینی مانای نێوان (دوّن)، و مانای (کتب)ی نەکردووە. بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (١/٧٢- ٧٣).

**دووەم:** هەروەك لە كاتی توێژینەوەی ئـەم بابەتـەدا زۆر پێویسـتە ڕەچـاوی بـارودۆخی دەرەكـی و دەوروبـەریی بكرێـت، ئـەویش بـارودۆخی كۆمەڵگـەی عەرەبییـە بـە گشـتی، هـەروەها ڕەچـاوی كۆمەڵگـەی ئیسـلامی لـە سـەردەمی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و بەتایبەت سەردەمی هاوەڵان بكـەین، ئەم بارودۆخەش خۆی دەبینێتەوە لە:

١. بەڕاسـتی نەتـەوەی عـەرەب پـێش ئیسـلام نووسـین و خوێندنـەوەیان نەدەزانی، بەو زانستانە ئاشـنا نـەبوون كـە نەتـەوەكانی تـر خـەریك بـوون، وەك زانستی لۆژیك، فەلسەفە، ماتماتیك، پزیشكی... تاد، بەڵكو تاكە هونەر و زانست كە تێیدا لێهاتووبوون، تێیدا گەیشـتبوونە لوتكـە، هونـەری ڕوونبێـژی (البیـان)، زاستی زمان (لسان)، شیعر، پەخشان بوو، تاكو گەیشتنە ئەوەی كـە سـاڵانە لـە بازاڕە بەناوبانگەكانیان كۆنفرانسـی سـاڵانە ببەسـتن –وەك بـازاڕی عوكـاز و زی مەجاز– شاعیران و وتاربێـژان لـە هـەموو تیرەكـان پێشـبڕكێیان دەكـرد لەسـەر ئەوەی كامەیان باشترە و وتارەكەی بەهێزتر و چاكترە[1]، هونەرە ئەدەبییـەكان (زمانەوانییـەكان) تـا ئاسـتی هـەرە بـەرز بەرەوپێشچـوون، زمـان پـاراوی، ڕەوانبێژی، ئیجاز، جوان وێنەكێشانی زارەكی، وردەكارییەكەی بووە تاكە هونەر كـە عـەرەب تێیـدا گەیشـتنە ترۆپكـی پێشـكەوتن، تـا ئـەوەی شـیعری وایـان ڕێكدەخسـت و دەیـانووت كـە هـەموو نەتـەوەكانی سـەر ڕووی زەوی پێینەگەیشتبوون[2].

---

١– بڕوانە: تأریخ ابن خلدون (١/ ٤٠٤–٤٠٥) كە باسی نەزانیی عەرەب دەكات لە بواری پیشەسـازیدا و، (١/ ٤٩٦) لە باسی هەڵكەوتنیاندا لە بـواری شـیعر و هونەرەكانیـدا، وحضـارة العـرب – گوسـتاف لوبون (٤٤٦) بەشی (الأدب العربي).

٢– سەرچاوەی پێشوو (٤٤٨).

لەبەرئەوە قورئانی پیرۆز وەك تەحەددایەك بۆ ئەوان هات لەو هونەرەی کە تێیدا گەیشتبوونە لوتکە ئەویش هونەری ڕوونبێژی (البیان) بوو، کە (شێوازی قورئان) تەحەددایان دەکات کە سورەتێك لە هاوشێوەی سورەتی قورئان بێنن، کاتێك دەستەوەستان بوون و لە هەمان کاتدا زانییان کە ئەمە حەق و ڕاستە، هەروەها لەسەرووی توانای ئەدیب و شاعیرەکانیانە[1].

لەبەر هۆکاری گرنگیدانی لە ڕادەبەدەریان بە هونەری (ڕوونبێژی)، یەکێك بوون لە بەتواناترین نەتەوە لە گوزارشتکردنی ئەوەی لە دەروونیاندابوو بە جوانترین و کورتترین شێوە و ڕوونترین وێژە، هەروەها بەتواناترین بوون لە تێگەیشتن لە ئاخاوتن و مەبەستەکانی.

بەهۆی ئەو نەخوێندەوارییەیان مێشکیان خاڵی بوو لەو زانست و مەعریفەیە کە لای نەتەوەکانی تر بوونی هەبوو، لەبەرئەوە ئامادەگی ئەوەیان تێدابوو بۆ وەرگرتنی (قورئان) و (سوننە) و ئەو یاسایانەی کە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ڕوونی دەکردنەوە، هەروەها گرنگیدان بەم پەیامە و لەبەرکردن و تێگەیشتنی، هیچ زانستێکی سروشتی یاخود عەقڵی نەبوو تا توانا و کاتیان بەمانە بەفیڕۆبچێ، لەبەرئەوە هەموو چالاکی زانستیان تەنها لەبەرکردن و تێگەیشتن بوو لە قورئان و فەرموودە.

٢. لەبەرئەوەی عەرەب نەخوێندەواربوون نووسین و خوێندنیان کەمبوو، ئەوا لەبەرکردن و پشتبەستن بە یادگە ئامرازی سەرەکی بوو بۆ پاراستنی کلتوری مێژوویی و ئەدەبی خۆیان، ڕەچەڵەك و مێژوو و سروت لەسەر دڵ ومێشکی خۆیان دەپاراست، لەو کارامەییەشیان پێشبڕکێیان دەکرد، ئاخۆ کامیان زیاتر و باشتر ئەم کلتورەی لەبەرکردووە، شاعیری عەرەبی کاتێك شعرێکی دەهۆنیەوە و

---

١- البحر المحيط للزركشي (١/٤٤٤-٤٤٦).

لەناو خەڵکی دەوتەوە، بە ماوەیەکی کەم دەیان کەس ئەم شیعرەی لەبەردەکرد و دواتریش لەوانەوە سەدان کەس لەبەری دەکرد، بەمشێوەیە لەنێو تیرەکانی دوورگەی عەرەبی بڵاودەبووەوە، لە دڵ و مێشکی سەدان کەس دەپارێزرا و هیچ ناکۆکی گەورەش لەسەر گێڕانەوەکان دروست نەدەبوو، ئەم ڕێگەیەش تا ئەم سەردەمە لەنێو تیرەکانی کەنداوی عەرەبیدا هەر بەردەوامە.

٣. گێڕانەوە ڕێگەیەکی نوێ و داهێنراو نەبوو پاش سەردەمی هاوەڵان، بەڵکو لای عەرەب لە سەردەمی نەزانیی بەناوبانگترین و باشترین ئامرازی فێرکردن و ڕاگەیاندن بوو[1]، هەموو شاعیرێکی عەرەب گێڕەرەوەیەکی لەگەڵ بوو، هەموو شیعرەکانی لەبەر دەکرد، هەروەها لێی فێردەبوو، هەر کاتێك شاعیر قەسیدەیەکی دەهۆنییەوە –هەندێك جار زیاتر لە سەد دێڕ دەبوو– بە گوێی گێڕەرەوەی قوتابییەکەیدا دەچرپی[2]، تاکو دڵنیادەبوو کە زۆر بە باشی لەبەری کردووە، بۆ ئەوەی لە شوێنە گشتییەکان و لەناو خەڵکی بیگێڕێتەوە و دووبارەی بکاتەوە.

٤. هەروەك ڕەوشتی عەرەب لە پێش ئیسلام ڕاستگۆیی، دەستپاکی، وەفاداری بەرامبەر بە پەیماندان هەبوو لە ئاخاوتن، لای ئەوان ئەم خەسڵەتە ڕەوشتییانە زۆر گەورە بوون، لەبەرئەوە ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب نەیتوانی درۆ لەگەڵ (هیرەقل)دا بکات دەربارەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێ)، کاتێك بۆ بازرگانی چووە شام ساڵی (٦)ی کۆچی، پێش ئەوەی موسوڵمان ببێت،

---

١– بڕوانە: مصادر الشعر الجاهلي (٢٥٥) ناصر الدين الأسد، ط١، ١٩٧٠م، بيروت، والمفصل في تأريخ العرب، د. جواد علي (٩/ ٢٦٥) ط١، ١٩٧٢م، دار العلم– لبنان. وتأريخ التراث العربي، فؤدا سزكين، ترجمة: محمود فهمي، ط١، ١٩٨٣م، نشر جامعة محمد بن سعود– الرياض (١/١٢٥).

٢– هەموو ئەمە ئەوە ڕەتناکاتەوە کە عەرەبەکان پێش ئیسلام نووسینیان زانیوە و هەندێك کەلتووری خۆیان نووسیوەتەوە، بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (١/٤٣)، وتأريخ ابن خلدون (١/٤١٨). ومصادر الشعر الجاهلي (٦٦).

(هیرەقلّ) هەواڵی پێغەمبەری لێپرسی، هەروەها لێی پرسی کە خەڵکی بۆچی بانگ دەکات، لەو کاتەدا ئەبو سوفیان بە ڕاستگۆیی وەڵامی دایەوە و نەیتوانی درۆ بکات، لە ترسی ئابڕوچوون، کاتێك وتی: (ئەگەر شەرم و حەیا کاریگەری لەسەرم نەبووبایە، ئەوا درۆم لەبارەوە دەکرد)[1]. لەگەڵ سەرسەختی دوژمنایەتی ئەبوسوفیان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێ)، بەڵام نەیتوانی درۆ دەربارەی پێغەمبەر بکات لەلای پادشای ڕۆم، لە شەرم و ترسی عەرەب.

٥. پێغەمبەری خودا (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) لە قورەیشییەکان بوو، ئەوانیش زمانپاراوترین تیرەی عەرەب بوون[2]، لەنێو ئەوانیشدا پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) زمان پاراوترین و ڕەوانبێژترینیان بوو[3]، ئەمەش یارمەتیدەر بوو بۆ ئاسان لەبەرکردنی فەرموودەکانی، لەبەر ڕۆشنی و جوانیەکەی، عەرەبیش شێوازی جوانی ئاخاوتن جادوویان لێدەکات.

٦. کاتێك پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) قسەی دەکرد، بەکورترین وێژە قسەکانی دەکرد، وشەکانی سێ جار دووبارە دەکردەوە، تا ئەوەی هاوەڵانی فەرموودەکەیان لەبەردەکرد، خزمەتکارەکەی ئەنەسی کوڕی مالیك، دەڵێت: (کاتێك قسەیەکی دەکرد سێ جار دووبارەی دەکردەوە، تاکو لێی تێدەگەیشتن)[4].

---

١- بڕوانە: صحيح البخاري ح رقم (٧).

٢- بڕوانە: الشفا للقاضي عياض اليحصبي (٧٠/١)، طبعة دار الكتب العلمية -لبنان، تأريخ ابن خلدون (٤٣٨/١)، و (٥٤٦/١)، وحضارة العرب (ص: ٤٣٩) فصل (اللغة العربية).

٣- بڕوانە: تأريخ الإسلام للذهبي، قسم السيرة النبوية (ص: ٤٦٣).

٤- رواه البخاري في صحيحه حديث رقم (٥٩)، و (٦٢٤٤)، هەروەها بڕوانە: إحكام الأحكام (١٣٩/١)، والأنوار الكاشفة (ص: ٦٤).

٧. هەروەك هاوەڵان هەر كاتێك گوێبیستی فەرموودەیەكی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) دەبوون، لە مزگەوت، كۆڕ و ماڵەكانیان، ئەوا پیاوان و ژنان لەنێوان یەكتری دەیانوتەوە و قسەیان لەسەر دەكرد، چونكە باوەڕیان وابوو كە ئەمە ئەركێكی ئایینییە، قورئانی پیرۆز فەرداری كردووە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ﴾ (النساء٥٩)، واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردار و گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر و فەرمانڕەواكان بكەن كە لە خودی خۆتانن لە بیروباوەڕو پابەندیدا). هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَنْ كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ (الأحزاب٢١)[١]، واتە: (سوێند بەخودا بەڕاستی لە پێغەمبەری خودادا چاكترین نموونەی تەواو و ڕێكوپێك هەیە، تا چاوی لێ بكەن و شوێنی بكەون، بەتایبەت بۆ ئەو كەسانەی ڕەزامەندی خودایان مەبەستە، سەرفەرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خودا بەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو). هەتاكو ئەوان ڕۆڵەكانیشیان هەروەك قورئانی پیرۆز، فەرموودەكانی پێغەمبەریشیان لەبەردەكرد، هەروەك لە سەحیحی بوخاری هاتووە: (سەعدی كوڕی ئەبی وەقاس فەرموودەكانی فێری منداڵەكانی دەكرد، هەروەك چۆن مامۆستا قوتابییەكەی فێردەكات)[٢].

ئەگەر یەكێك لە هاوەڵان لە كۆڕی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ئامادە نەبووایە، ئەوا پرسیاری لەوانە دەكرد كە لەوێ ئامادە دەبوون كە پێغەمبەر چی فەرمووە، هەروەك لە چیرۆكی عومەر لەگەڵ دراوسێكەی

---

١- بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية (١٩/ ٨٣- ٨٦).

٢- ح رقم (٢٨٢٢)، وفتح الباري (٦/ ٣٥).

دەردەکەوێت، کە بە نۆبەت لە کۆڕی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لـێبێ)[1] ئامادە دەبوون، بەم یادخستنەوە و قسە لەسەرکردنەی ڕۆژانە لەنێوان هاوەڵان، ئـەو فەرموودانـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێبێ) زیـاتر لـە دڵ و مێشـکیان جێگەی دەگـرت، هــەروەها زۆر بەباشـی فـەرموودە و کردارەکـانی پێغەمبــەریان لەبــەر دەکــرد، لەبەرئــەوەی ڕوونکــەرەوە و شــیکەرەوەی قورئــانی پــیرۆزە، بەتایبــەت پێغەمبــەر (درووود و ســڵاوی خــودای لــێبێ) هــەر فەرموودەیــەك کــە بیفەرموایــە زۆر دووبــارەی دەکــردەوە، لــە شــوێنی جیــاواز و کــاتی جیــاواز بەگوێرەی پێویستی[2].

٨. پاش ئەوەی قورئان بۆ سەر پێغەمبــەر (درووودی خـودای لـێبێ) دابــەزی، بیست و سێ ساڵان ژییا، لەم ساڵانەش سێزدە ساڵان لە مەککە، دە ساڵانیش لە مەدینە ژیانی بەسەر بـرد، ئەمـەش ماوەیـەکی زۆر ئـەو هاوەڵانـەی هــەموو کـات لەگەڵی بوون، هەموو ئەوەی لێی فێربوون لەبەریان کرد، واتە: درێژترین ماوەیـە کە قوتابییەك پێویستیەتی، هەر لە منداڵیەوە، تـاکو ئـەوەی بڕوانامـەی دکتـۆرا بەدەستدێنێت، لە هەر بوارێك لەم ڕۆژگارەدا.

٩. پێغەمبـــەر (درووودی خـــودای لـــێبێ) فـــەرمودەی وتـــەیی بـــە هـــاوەڵان لەبـەردەکرد، بەتایبـەت ئەوانـەی پێویسـتیان بـە لەبـەرکردنی پیتـاوپیتی بـوو، هەروەك لەگەڵ بەرائی کوڕی عازەب ئەم کارەی کرد: بەراء دەڵێت: چەند جارێك بۆ پێغەمبەرم دووبارەکردەوە، کاتێك گەیشتمە (اللهم آمنت بکتابـك الـذي أنزلـت ورسولك)، پێغەمبەر فەرموی: نا.(ونبيك الذي أرسلت)[3].

---

١- بڕوانە: صحيح البخاري حديث رقم (٨٩)، فتح الباري (١/١٨٥).

٢- بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية (١٨/٢٨)، و (١٨/٢٣).

٣- بڕوانە: صحيح البخاري: حديث (٢٤٧)، الأحكام (٢/٨٦).

پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ڕەتی کردەوە کە بەڕاء وشەی (نبی) بە (رسول) بگۆڕێت، لەگەڵ ئەوەی بە نزیکی یەك مانایان هەیە.

جابیر دەڵێت: پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) چۆن سوورەتێکی قورئانی پیرۆزی فێردەکردین، ئاواش ئیستیخارەی فێردەکردین[١].

ئیبن عەبباس دەڵێت: پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) چۆن سووڕەتێکی قورئانی پیرۆزی فێر دەکردین ئاواش شەهادەی فێردەکردین[٢].

١٠. پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ئەو شاندانەی فێر دەکردن کە لە تیرەکانی عەرەب دەهاتنە لای، هەروەك لەگەڵ تیرەی عەبدلقەیس کردی، یاساکانی ئیسلامی فێرکردن، پاشان پێی فەرموون: (لەبەری بکەن و بە خەڵکانی خۆتانی بگەیەنن)[٣]، هەروەها ئەم کارەشی لەگەڵ مالکی کوڕی حوێرس کرد[٤].

١١. هەروەك هاوەڵاَن ئەگەر لە شتێکدا ناکۆکیان کەوتبایە ناو ئەوا بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێ) یان دەگەڕاندەوە، تاکو ڕاستییەکەی نیشان دەدان[٥]، بەمشێوەش کاتێك لەسەر قورئان تووشی کێشەیەك دەبوون، یاخود لە فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێ) دەگەڕانەوە لای، تاکو بۆی ڕووندەکردنەوە، هەروەك عائیشە ئەم کارەی دەکرد: (کاتێك گوێبیستی شتێك دەبوو و نەیدەزانی ئەوا ڕاستەوخۆ دەگەڕاوە لای، تاکو فێردەبوو)[٦].

---

١- صحيح البخاري: حديث (١٠٦٩).

٢- التميز لمسلم: حديث رقم (١٨٩)، تحقيق: د. محمد الأعظمي، ط٣، ١٩٩٠م، الكوثر- الرياض.

٣- صحيح البخاري: حديث رقم (٨٧)، وأحمد (٢٠٦/٤).

٤- صحيح البخاري: حديث رقم (٦٨٥).

٥- صحيح البخاي: حديث رقم (٨٨)، فتح الباري (١٤٨/١).

٦- صحيح البخاري: حديث رقم (١٠٣)، فتح الباري (١٦٩/١).

١٢. پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) گەورەترین کەسایەتی بوو لە دوورگەی عەرەبی دەرکەوت، نەگەڕایەوە لای پەروەردگاری تاکو دەوڵەتی دروستکرد، کە هەموو دوورگەی عەرەبی گرتەوە، شوێنکەوتە و هاوەڵانی گەیشتنە دەیان هەزار کەس، لە کۆتایی ژیانی حەجی لەگەڵ کردن کە ژمارەیان دەگەیشتە سەد هەزار کەس، لە هەموو تیرەکانی عەرەب، هەروەك ئەوانەی لەگەڵی بوون لە مەدینە کە هاوەڵە نزیکەکانی بوون، نزیکەی چوار هەزار کەس بوون.

حاکم دەڵێت: "لە پێغەمبەری خوداوە (درووود وسڵاوی خودای لێبێ) چوار هەزار پیاو و ئافرەت ریوایەتییان کردووە، بیست و شتێك ساڵ هاوەڵێتی پێغەمبەریان کرد، لە مەککە پێش کۆچکردن، پاشان لە مەدینە پاش کۆچکردن، فەرموودە، کردار، نووستن، هەڵسان، جووڵە، دانیشتنەکانی ... پێغەمبەریان لەبەر دەکرد"[1].

گومانی تێدا نییە کە ئەم بارودۆخانە گەورەترین کاریگەرییان هەبوو لەسەر فەرمووده و یاساکانی، کەسایەتییەکی نادیار و ون نەبوو کە بە ئاسانی قسەی لەبارەوە هەڵبەستن، لەبەرئەوە کاتێك وتاری بۆ موسوڵمانان دەدا لە حەجی ماڵئاوایی، بنەماکانی ئایین و شەریعەتەکەی فێردەکردن، پێی دەوتن: (ئەوەی لێرە ئامادەیە با ئەم وتانە بەو کەسانە بگەیەنێت کە لێرە ئامادەنەبوون)[2].

---

١- المدخل في علم الحديث، الحاكم النيسابوري، (ص: ١١) طبعة ١٩٥٣م، لوزاك، تحقيق روبنسون، والإحكام (١٧٦/٤)، هەروەها بڕوانە: فتح الباري (١١٨/٨-١١٧) ح رقم (٤٤١٨) دەربارەی ژمارەی هاوەڵان لە غەزای بەدردا.

٢- صحيح البخاري: حديث رقم (١٠٥).

١٣. هـاوەڵانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) لـە ڕادەبـەدەر پێغەمبەریان خۆشدەویست، ئەمەش لە بەجێهێشتنی کـەس و کـار، ڕۆڵـە، بـرا و خوشك، تیرەکانیان بەدەردەکەوت، هەروەها کۆچکردنیان لەگـەڵی بـۆ مەدینـە، جەنگان لەپێناوی هەتاکو دژی باوك، برا، تیرەکانیـان، لـەپێناو بـەرگریکردن لـە پێغەمبەر و ئەم ئاین و پەیامە پیرۆزە شـەهید دەبـوون، لـە مەدینـە بـە هـەژاری لەگـەڵیان دەگوزەرانـد، دوای ئـەوەی لـە مەککـە دەوڵەمەنـد بـوون و لـە خۆشـگوزەرانیدا بـوون، ئەمـەش بەڵگـەی ئەوەیـە کـە پێغەمبـەریان زۆر خۆشدەویست، هەتا ئـەوەی عـورووەی کـوڕی مەسـعودی سـەقەفی -ئـەو کاتـەی قورەیش ناردی بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ بکات لە (پەیماننامەی حودەیبییە)- وتی: (سـوێند بـەخودا وەك شـاند چـوومەتە لای پادشـاکان، وەك شـاند بـۆ لای قەیسـەر، کیسـرا، نەجاشـی، هـەرگیز نـەمبینیوە هـیچ پادشـایەك لەلایـەن شوێنکەوتووانی بـەم شـێوەیە بـە گـەورە تەماشـای بکرێـت، هـەروەك هـاوەڵانی موحەمەد، موحەمەدیان خۆشدەوێت)[١] .

پێغەمبـەری خـودا (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) ، موسـوڵمانانی زۆر بـە توندی لەوە ئاگادارکردۆتەوە، کـە قسـەی بەدەمـەوە هەڵنەبەسـتن، لـەو بـارەوە دەفەرموێت: (هەر کەسێك درۆیەك بەدەمی منەوە هەڵبەستێت، بـا شـوێنێك لـە ئاگر بۆ خۆی دابنێت)[٢] . لەبەرئەوە زۆرێك لە هاوەڵان زۆر خۆیان پاراستووە لـە گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، لە ترسـی تێکـەڵکردن و هەڵـەکردنی بـێ مەبەسـت لـە گێڕانـەوەکان، ئـەم ئەرکەشـیان بـۆ لەبەرکارەکان (الحفاظ) وازلێهێنا[٣] .

---

١- صحيح البخاري: حديث (٢٧٣١)

٢- صحيح البخاري: حديث رقم (١٠٧).

٣- صحيح البخاري: حديث رقم (٢٨٢٤)، هەروەها بڕوانە: فتح الباري (٦/ ٣٦/٣٧).

١٤. هاوەڵان لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێ) نوێژیان دەکرد، هیچ یەکێك لەوان نەبوو ئامادە نەبێت، تەنها بە پاساوێك نەبێت، واتە: ئەوان لە مانگێکدا سەد و پەنجا جار بە پێغەمبەر دەگەیشتن، کاروباری ئاینی فێردەکردن، قورئانی بۆ دەخوێندن، لە هەر ئایەتێك تێنەگەیشتبنایە، ئەوا بۆی ڕاڤەدەکردن. هەروەك پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێ) هەموو هەفتەیەك ڕۆژی هەینی دوو وتاری بۆ دەدان، واتە: لە ساڵێکدا سەد جار وتاری گشتی بۆ دەدان، ئەمە جیا لەو وتارانەی کە لە هەندێك بۆنەو یادەکان دەیدا، هاوەڵانیش هیچ کارێکیان نەبوو تەنها گوێگرتن نەبێت لە وتاری پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێ) ، پاشان لەبەرکردن و تێگەیشتن و جێبەجێکردنی، دە ئایەت تێپەڕی نەدەکرد تاکو لە ئایەتەکان نەگەن و کاریان پێنەکەن[1].

١٥. کۆمەڵێ لە هاوەڵان تایبەت بوون بە هەندێك زانستی شەرعی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لێبێ) هەموو هاوەڵەکانی تری لەسەر وەرگرتنی زانست لەو هاوەڵانە هاندەدا، بەشێوەیەك پێغەمبەر گەواهی ئەوەی دا کە مەعازی کوڕی جەبەل پسپۆڕە لە زانستی حەڵاڵ و حەرام، گەواهیدا کە زەیدی کوڕی سابت پسپۆڕە لە زانستی میرات (الفرائض)، هەروەها گەواهیدا کە ئوبەی کوڕی کەعب و عەبدوڵلای کوڕی مەسعود پسپۆڕن لە جوان خوێندنەوە و لەبەرکردنی قورئان، فەرمووشی کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب زانایە لە دادوەریدا،

---

١- مسند أحمد برقم (٢٢٩٧١).

عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبباسـیش لـە ڕاڤـەی قورئـان... تـاد[1]، ئـەم پسـپۆڕانەش هەریەکێکیان لەوی تر سوودمەند دەبوو[2].

١٦. بەڕاستی یاسا و حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی لە سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) بە جارێك دانەبەزی، بەڵکو بـە پلـە بەنـدی دابـەزی لـە چەند قۆناغێکدا، کە بیست و سێ سـاڵی خایانـد، زۆرێکیـان بـە چـەند ڕووداوێـك دەبەسترێنەوە، کە ڕوویاندا لەو سـاتەوەختەش بـۆ چارەسـەرکردنی دابـەزیوە و حوکمی شەرعی لەبارەوە ڕوونکردۆتەوە، ئەمەش بووە هۆی سـانا لەبـەرکردنی، جێگیربوونی لە مێشك و هزری هاوەڵان بەتایبـەت ئەوانـەی لـەناو ئـەو ڕووداوانـە ژیان، زۆر بە گرنگی و تاسەوە چاوەڕێی حوکمی پێغەمبـەر دەبـوون، لـە هـەموو ڕووداوێکی گرنگدا، جا ئەگەر حوکمەکە لەلایـەن پێغەمبـەرەوە (درووود و سـڵاوی خودای لێبێ) دەردەچـوو، ئـەوا دەبـووە بابـەتی هـاوەڵان لـە مزگـەوت و مـاڵ و دانیشتن و کۆڕەکانیان، ئەو کاتیش بۆ هەمووان دەبووە شتێکی زانراو، بێگومان بەستنەوەی زانیارییەك بە ڕووداوێکی دیاریکراو، ئەوا زیاتر و باشـتر لـە مێشـك و بیر دەچەسپێت[3].

---

١- الترمذي برقم (٣٧٩٠)، وابن ماجة برقم (١٥٥). صحيح البخاري ح برقم (٣٨٠٨)، وفتح الباري (٧/ ١٣٦)، و ح (٣٨١٠)، والفتح (٧/ ٣٨١).

٢- مصـنف عبـد الـرزاق (١١/٣٢٧- ٣٢٨)، وأخبـار القضـاة (١/١٠٥)، وإعـلام المـوقعين (١/١٥)، و (١/١٨)، و (١/٢١).

٣- وەك لە سورەتی ( المجادلـة١-٤)، و سـورەتی (الممتحنـة١٠-١٢)، و سـورەتی (الجمعـة ٩-١١)، بڕوانە: تأريخ ابن خلدون (١/٤٣٨)، بابەتی هاتنەخوارەوەی قورئان بەپێی ڕووداوەکان.

١٧. پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) هاوەڵە زاناکانی لە شەریعەت بۆ هەرێمەکان دەنارد، بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو هەرێمانە فێری کاروباری ئایین بکەن و لە کاتی ناکۆکی و کێشەدا دادوەرییان بۆ بکەن، هەروەها سنوور و فەرزەکان بەرپابکەن، پێغەمبەری خودا (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ئەبو عوبەیدەی جەڕاحی بۆ ناو خەڵکی نەجران نارد، مەعازی کوڕی جەبەل و عەلی کوڕی ئەبو تالیبی بۆ یەمەن نارد[1]...تاد. ئەمانەش هەموویان زانای گەورە بوون، هەموویان قورئان و سوننەتیان لەبەر بوو، لە هەمان کاتدا لەو کەسانە بوون بەدرێژایی چەندان ساڵ هەر لەگەڵ پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) بوون، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەمانە گەیشتبوونە پلەی ڕادۆزی (ئیجتیهاد) کە ئامادەن بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە گەورەیە.

١٨. هەروەك ئەو دەوڵەتەی کە پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) دروستی کرد، لەدوای مردنیشی هەر بەردەوام بوو، لەدوای پێغەمبەر هاوەڵان حوکمیان کرد، ئەبوبەکری سدیق یەکەم جێنشین بوو، لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ، یەکەم کەس لە پیاوان کە باوەڕی پێهێنا، زاناترین هاوەڵ بوو بە سوننەتی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، چونکە زۆر نزیك بوو لە پێغەمبەرەوە، هەروەها هەموو کات لەگەڵ پێغەمبەر بوو، لە ماوەی بیست و سێ ساڵ لە مەککە و مەدینە، لەسەر سوننەتی پێغەمبەر دەڕۆیشت، کاتێك کێشەیەکی دەهاتە پێش، یاخود ڕووداوێك ڕوویدەدا،

---

١- بڕوانە: صحيح البخاري: كتاب (٩٥) باب (١) في خبر الواحد وباب (٤)، والإحكام، ابن حزم (١٠٩/١-١١٢)، ودراسات في الحديث النبوي، د. محمد مصطفى الأعظمي (٥٣/١) ط٣، ١٩٨١م، شركة الطباعة، الرياض، والسنة قبل التدوين لمحمد عجاج الخطيب (٧٠/١)، ط٥، سنة١٩٨١م، دار الفكر - لبنان.

هـيچ شـتێکی لـه قورئـان و سـوننەتی پێغەمبـەر نەدەدۆزییـەوە، ئـەوا سـەردانی هەموو هاوەڵانی دەکرد، دەربارەی سوننەتی پێغەمبەر پرسیاری لێدەکردن، هەر کاتێك پێیـان وتبایـە ئـەویش ڕاسـتەخۆ کـاری پێـدەکرد. جێنشـینی دووەمـیش عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمان و عەلی (ڕەزای خودایان لێبێت)، هـەمان ئـەو کـارەی ئەبوبـەکریان کـرد[1] تـاکو شـەریعەت، یاسـا ئیسـلامییەکان، دادوەری، فیقهی ئیسلامی جـێگیر بـوو، لەسـەر دوو بنـەمای سـەرەکی، ئـەویش قورئـان و فەرموودەی پێغەمبەرن له ماوەی چل ساڵدا، ئەمەش ماوەی دەوڵەتی پێغەمبـەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) و جێنشینه سەرڕاستەکان بوو.

لەو ماوەیەدا چوارچێوە و بناغەی دەوڵەت تەواو بوون، ڕێکخستنی کارگێڕی، داوەری، ئابووری دانران[2]، پاش ئەمەش گۆڕینی ئـەم سیسـتەمە بـووە شـتێکی سەخت، لەم ماوەیەدا نەوەیەکی نوێ لەدایکبوو و پێگەیشت، ئەمانەش ڕۆڵەکانی هاوەڵان بوون، کە زانستیان لە هاوەڵان وەرگرتبوو، ئـەوەیان بینیبـوو کـە چـۆن حوکم دەکەن، دادوەری لەنێوان خەڵکی دەکـەن[3]، چـۆن موفتیـەکان فـەتوایان دەدا[4]، له زۆرێك لەو ڕوودا و کێشانەی له شار و هەرێمەکان و دەوڵەتی ناوەندی ڕوویاندەدا، کە هەموو دوورگەی عەرەبی گرتبووەوە، ئێران، عێراق، شام، میسڕ، لیبیا، بە پشتبەستن بـە دەقـەکانی قورئـانی پـیرۆز و فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) ، لـەژێر چـاودێری و سەرپەرشـتیکردنی چـوار

١- الإحكام (٢/١٢٦)، وإعلام الموقعين (١/٦٢).

٢- التراتيب الإدارية للكتاني (١٨٠- ١٨١) طبعة سنة ١٣٤٦هـ، فاس- المغرب، والرياض النضرة في مناقب العشرة للمحب الطبري (٢/٣)، ط٢، ١٩٥٣م، دار التأليف -مصر.

٣- أخبار القضاة (١/٤)، وكتاب القضاء في عهد عمر، د. الطريفي (٢/٧٦٣-١٠٠٤)، ط١، ١٩٨٦م، دار المدني- جدة.

٤- الإحكام (٤/١٧٧)، وإعلام الموقعين (١/١٢).

هاوەڵە سەرڕاستەکان[1] کە زانست و زانیارییەکی لە ڕادەبەدەریان دەربارەی ئەم شەریعەتە هەبوو، زۆر سووربوون لەسەر ئەوەی دەبێت دادوەر و شەرعناسان پەیوەست بن بە سوننەتەوە، کە سەرچاوەی سەرەکی شەریعەت و یاسایە، ناکرێت لێی بێنیاز بن.

عومەری کوڕی خەتتاب هاوەڵە زاناکانی دەنارد بۆ ناوچە و وڵات و هەرێمەکان، بۆ ئەوەی خەڵکی فێری قورئان و سوننەت بکەن، دادوەریشیان لەنێواندا بکەن[2]، هەروەك گەورە هاوەڵە زاناکان لای ئەو مانەوە، بۆ ئەوەی ڕاوێژیان پێبکات، ئەوانیش ئەنجومەنی ڕاوێژ بوون[3]، کاتێك دادوەرێك داوەرییەکی دەکرد، یاخود فەتوایەکی لە وڵاتێك دەدا، پاشان کە دەهاتەوە مەدینە لەبارەی سوننەتەوە پرسیاری لە ئەنجومەنی شورا دەکرد، ئەگەر ئەنجومەن پێچەوانەی ئەو بوونایە، ئەوا لە بۆچوونی خۆی پاشگەزدەبووەوە، هەروەك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ئەم کارەی کرد، ئەو کاتەی عومەر بۆ عێراقی نارد[4]. لەبەر ئەوە زۆرێك لە بنەماکانی ئیسلام و یاسا فیقهییەکان لە سەردەمی عومەر جێگیربوون[5]. زانایان و دادوەرانی مەدینە پاش سەردەمی هاوەڵان کاریان بە سوننەت و دادوەری عومەری کوڕی خەتتاب دەکرد، چونکە دادوەرییەکەی ئەو ڕاوێژ بوو[6]، هەروەك لەبەر ئەم هۆکارە زۆربەی زانایانی وڵات

١- القضاء في عهد عمر (١٦٨/١)، بابەتی چاودێریکردنی دادوەران، هەروەها: إعلام الموقعين (٨٤/١).

٢- مجموع فتاوى ابن تيمية (٣١١/٢٠).

٣- مجموع فتاوى ابن تيمية ٣١٣/٢٠).

٤- مجموع فتاوى ابن تيمية (٢١٣/٢٠).

٥- مجموع فتاوى ابن تيمية (٣١٥/٢٠).

٦- مجموع فتاوى ابن تيمية (٣١٣/٢٠).

و هەرێمـەكان شـوێنی خـەڵكی مەدینـە دەكـەوتن[1]. لەبەرئـەوە عـامری كـوڕی شـەعبی فەقیـهـ و دادوەری عێـراق دەڵێـت: "بڕواننـە ئـەوەی عومـەر دادوەری پێكردووە، چونكە ئەو ڕاوێژی دەكرد"[2]، جێنشینی چوارەم، عەلی كـوڕی ئـەبو تاڵیب ویستی لە پرسێكدا ڕێچكەكەی عومەر نەگرێتە بەر لە حوكمداندا، ئەوەبوو عوبەیدەی سەلمانی –كە یەكێك بوو لە دادوەران لە سەردەمی عەلی كوڕی ئـەبو تاڵیب– ڕەخنەی گرت پێی وت: (بۆچوونەكەت لەگەڵ عومەردا بۆ كۆمەڵ چاكترە بۆ ئێمە، لە بۆچوونی خۆت بە تەنیا و جیا لە كۆمەڵ)[3].

لەبەرئەوە عەلی كـوڕی ئـەبو تاڵیـب جێنشـینی چـوارەم (٤٠ك) بـۆ دادوەران دەڵێت: (دادوەری بكەن هەروەك پێشتر دەتان كرد و ناكۆكیم پێ باش نییە)[4].

خەلیفەی پێنجەم معاویەی كوڕی ئەبو سوفیان لە چـینی دووەمـی هـاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لێبێـت) بـوو، یـەكێك بـوو لـە نووسـەرانی قورئـان لەسەردەمی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لـێبێ)، بـرای دایكـی بـاوەڕداران حەبیبەی كچی ئەبو سوفیان، خێزانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خـودای لـێبێ) بوو، دەسەڵات و حوكمی بیست سـاڵ درێـژەی كێشـا، لـە سـاڵی (٤٠ كۆچـی تـا سـاڵی ٦٠ كۆچـی)[5]، پاشـان عەبـدوڵڵای كـوڕی زوبـەیر، جێنشـینی شەشـەم دەسەڵاتی گرتەدەست، لە ساڵی ٦٤ كۆچی تا ساڵی ٧٣ كۆچی، كە یـەكێك بـوو لە هاوەڵە بچووكەكان، یەكەم لەدایكبوو بوو لە مەدینە پـاش كۆچـكردن، كـوڕی

---

١– مجموع فتاوى ابن تيمية (٢١٤/٢٠).

٢– مجموع فتاوى ابن تيمية (٢١٣/٢٠)

٣– مجموع فتاوى ابن تيمية (٣١٥/٢٠).

٤– صحيح البخاري: حديث رقم (٣٧٠٧)، فتح الباري (٧١/٧).

٥– تـأريخ بغـداد (٣٠٧/١)، وسـير الأعـلام (١١٩/٣، ١٣٣، ١٦٢)، والإصـابة (٤٣٣/٣)، والتهـذيب (٢٧٠/١٠).

هاوەڵی گەورە زوبەیری کوڕی عەوامی کوڕە پـووری پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خودای لێبێ) بوو، هەروەك نەوەی ئەبوبـەکری سـدیق بـوو، زانسـتی لـە گـەورە هـاوەڵان وەرگرتبـوو، هـەروەها لـە پـووری (دایکـی بـاوەڕداران) وەرگرتبـوو، شەرعناس و زانا و پابەند و کارپێکەری سوننەت بوو[1].

بەمشـێوەیە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) کاروبـاری دەوڵەتی ئیسـلامیان بـەگوێرەی یاسـاکانی شـەریعەت بـەڕێوەدەبرد، تـا مـاوەی شەست ساڵ پاش پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، لەو ماوەیـەدا هـیچ گۆڕانکارییەکی گەورە لە کاروباری یاساکان و دادوەری ڕووینەدا، کە لەسـەر دوو سەرچاوەی سەرەکی دامەزراون: (قورئان) و (سوننەت)، ئەم ماوەیەش بەسە بۆ جێگیربوونی سیستەمی یاسایی و تەشریعی و دادوەری دەوڵەت.

هــەتاکو حــوکم و بــەڕێوەبردنی کاروبــاری دەوڵــەت گواســترایەوە بــۆ شوێنکەوتووانی هاوەڵان –کە نەوەی دووەم بوون– واتە: لە ساڵی (٧٣– ١٠٠ك) لەو ماوەیەدا هاوەڵانی تر بەیعەتیان بە جێنشینەکان دەدا، بە مەرجیان دەگـرت کـە دەبێـت پابەنـدی قورئـان و سـوننەت بـن[2]، کـە بەڵگەیـە لەسـەرئەوەی کـە فەرموودە بۆ هەمووان شتێکی زانراو بووە، هاوەڵانیش کاتێك شتێکی پێچەوانەی سـوننەتیان بینیبـا، ئـەوا ڕاسـتەخۆ ڕەتیـان دەکـردەوە، بـە ئاشـکرا نکۆڵیـان لێدەکرد، خەڵکیشیان لێ ئاگاداردەکردەوە[3].

---

١– سير الأعلام (٣/٣٦٤،٣٦٣، ٣٧٩)، والتهذيب (٥/٢١٥)، فتح الباري: شـرح حـديث رقـم (٧٢٠٣) في حكم ابن زبير.

٢– صحيح البخاري: رقم (٧٢٠٣)، و (٧٢٠٥)، وسير الأعلام (٣/٢٣١)، باسی بەیعەتدانی ئـیبن عومـەر بە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان.

٣– سير الأعلام (٣/٢٣٠)، باسی ڕەتدانـەوەی حـەججاجی کـوڕی یوسـف لەلایـەن ئـیبن عومـەرەوە، وصحيح مسلم حديث: رقم (٧٨/ ٤٩)، باسی ناڕەزایی ئەبو سـەعیدی خـودری لەسـەر عەبدولمـەلیکی کوڕی مەروان.

لەبەرئەوە پەرتووکەکانی مێژوو باسی هیچ گۆڕانکارییەك و وەرچەخانێکیان نەکردووە لە سیستەمی دادوەری و یاسادانان، لەکاتێکدا دەبینین باسی هەموو وردەکارییەکانی گۆڕانی سیاسی و ململانێی سیاسی کراوە لەسەر دەسەلأت، هیچ خەلیفەیەك بوێری ئەوەی نەبووە دەستوەربداتە سیستەمی دادوەری، یاخود دادوەرێك پابەندی شتێك بکات کە پێچەوانەی سوننەت بێت، کە بەلگەیە لەسەر جێگیری سیستەمی دادوەری، کە زانا کۆششکارەکان لە فیقە سەرپەرشتییان دەکرد و بەڕێوەیان دەبرد.

١٩. هاوەڵە زاناکان موسوڵمانانیان فێری و قورئان، فەرموودە، فیقە، ڕاڤە دەکرد و قورئانیشیان پێ لەبەردەکردن، هەموو ئەمانەش لە مزگەوت بوو، یەکەم سەنتەری زانستی لە دەوڵەتی ئیسلامی، ئەمەش بە فەرمانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ، فێرکردنیش گشتی بوو لە شوێنی گشتی بوو، هەمووان سەردانیان دەکرد، زۆرێك لە هاوەڵان ئامادە دەبوون[1]، ئەگەر یەکێك لەو وانەبێژ و زانایانە هەڵەیەکی بکردایە، ئەوا هاوەڵان ئاگاداریان دەکردەوە و ڕاستییەکەیان بۆ ڕووندەکردەوە، ئەبو هورەیرە لە مزگەوتی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ)، لە تەنیشت خانووی عائیشە(ڕەزای خودای لەسەر بێت)، کە بە خۆی گوێبیستی دەبوو، قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، کاتێك کۆتایی بە قسەکانی دەهێنا بە عائیشەی دەوت کە لە کۆڕی دادەنیشت: (ئەی خاوەن خانووەکە، ئایا نکۆڵی لە هیچ شتێك دەکەیت لەوەی وتم؟).

ئەویش پێی دەوت: (نەخێر، تەنها ئەوە نەبێت کە پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) وەك ئێوە هەموو فەرموودەکانی خێرا و بەدوای یەکدا

---

١- دراسات في الحديث النبوي (٥٤/٤٨/١).

نەدەوت)[1]. واتە: پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لە کۆڕەکاندا زۆر قسەی نەدەکرد، بەڵکو زۆر کەم دەدووا. قسەکانیشی سێ جار دووبارە دەکردەوە، تاوەکو هاوەڵان فەرموودەکەیان لەبەردەکرد.

لەبەرئەوە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) بزوتنەوەی ڕەخنەیی و بزوتنەوەی فێرکاری لە یەك کاتدا وابەستەی یەك بوون[2].

٢٠. عومەری کوڕی خەتتاب خەلیفەی دووەم، ئەنجومەنی ڕاوێژی هەبوو[3]، قورئانخوێنان تێیدا ئامادە دەبوون کە زانابوون، لە هەموو کاروبارێکی ئوممەت، یاخود دەوڵەت ڕاوێژی لەگەڵ دەکردن، لە دادوەری، یاسادانان، یاخود سیاسی، ئابووری، کە بووە هۆی یەکێتی تێڕوانینی فیقهی و جێگیربوونی لە زۆرێك لە بابەتەکان[4]، لەبەر ئەوەی هەموو زانایەك لە زاناکان بچووك بووایە، یاخود گەورە ئاماژەی بە بۆچوونی خۆی دەدا، لە قورئان و سوننەت بەڵگەی خۆی دەخستەڕوو لەو کۆڕەدا، یاخود لە مزگەوتدا زۆر بە ئازادی، کە لەلایەك بووە هۆی دەوڵەمەندی دەرکەوتنی هەڵێنجانی فیقهی، لەلایەکی تریش بووە هۆی زۆری ئەو بەڵگانەی کە زانایان لە گفتوگۆکانیان لەو کۆڕە زانستییانە بە بەڵگە دەیانهێناوە.

---

١- البخاري (٤٢٢/٦)، وصحيح مسلم: حديث رقم ٢٤٩٣)، وسير الأعلام (٦٠٧/٢).

٢- المسند (٤١٣/٢)، وسيرالأعلام (٦٠٣/٢)، باسی چیرۆکی ئەبو هورەیرە لەگەڵ سەعد، الإحكام (١٢٧/٢)، وإعلام الموقعين (١٩/١).

٣- البخاري رقم (٧٢٨٦)، وفتاوى ابن تيمية (٣١٢/٢٠)، وإعلام الموقعين (٨٤/١).

٤- الإحكام (١٤٢/٤)، و (١٧٤/٤ - ١٥٠)، وفتاوى ابن تيمية (٣١٥/٢٠).

٢١. ئـەم سـەروەتە فیقهـی و یاسـایی و دادوەرییـە، کـە لەسـەر بنـەمای تێگەیشـتن و هـەڵێنجان لـە بەڵگـەکانی قورئـان و سـوننەت دروسـتبووە، کـە بەرهەمی کۆششی هاوەڵە زاناکانە لە ماوەی حـەفتا سـاڵ، ئەمـەش ئـەو مـاددە سەرەکییەیە کە شەرعناسەکان لە ڕۆڵەی هاوەڵان پشـتیان پێدەبەسـت، ئـەوەی هاوەڵان پاش پێغەمبەر لەسەری کۆدەنگ بوون، ئەوا شەرعناسان لە دوای ئەوان کۆدەنگ بوون، لەبەرئـەوەی کـۆدەنگی هـاوەڵان بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی پشـت ئەستوورە بە بەڵگەیەکی بڕاوە، کە ناکرێـت ڕاجیـایی لەسـەر هـەبێت[1]، ئـەوەی هاوەڵان و زانایان لەسـەری ڕاجیـان، لـە دوو ڕاوبۆچـووندا، ئـەوا بـۆ دوای ئـەوان کارکردن بە هەر بۆچوونێك لەو دوو بۆچـوونە دروسـتە[2]، لەبەرئـەوەی ڕاجیـایی هاوەڵان ئاماژەیە لەسەر ئـەوەی ئـەو بەڵگەیـەی کـە لـە ڕادۆزیەکەیانـدا پشـتیان پێبەستووە بریتییە لە بەڵگەی گوماندار لە ئاماژەکەیدا، کە زیاتر لـە بۆچـوونێك هەڵـدەگرێت، تـەواو وەك ئـەوەی پیـاوانی یاسـا کاتێـك لـە دەقێکـی یاسـایی تێدەگەن، لەبەر هەڵگرتنی دەقی یاسایی زیاتر لە مانایەك.

ئەگەر گریمان فەرموودە هەر نەنووسرابێتەوە، ئەوا ئەو سەروەتە فیقهی و پێشینە دادوەرییەکان کە دەرکەوتوو ناسران لە دادوەری و فەتوا لە سەردەمی هاوەڵان –ئەو سەردەمەی کە سەدەی یەکەمی کۆچی دەگرێتـەوە–[3] ئـەوا ئـەم بەڵگەیە بەسە لەسەر دروستی زۆرێك لە فەرموودەکان کە نووسرایەوە.

ئەگـەر نـا چـۆن هـاوەڵان لـە هەرێمـە جیـاوازە ئیسـلامییەکان بـە حـوکمی هاوشێوە دادوەرییان دەکرد لە بابەتە هاوشێوەکان، بەبێ ئەوەی دەق و بەڵگەی

---

١– الفصول في الأصول للجصاص (٣/٢٥٧)، وإحكـام الأحكـام (٤/١٤٧)، وإعـلام المـوقعين (١/٨٣)، هەروەها بڕوانە: فتاوى ابن تيمية (١٩/ ١٩٥– ٢٠٢)، و (٢٠/١٠).

٢– الفصول في الأصول (٣/٣٢٩).

٣– إحكام الأحكام (٤/١٥٢).

یاسـایی و دادوەری ڕوون و ئاشـکرا لـە ئاماژەکـان لایـان هـەبێت؟! ئایـا چـۆن فەتوای هاوەڵێك لـە عێـراق لەگـەڵ فـەتوای هـاوەڵێکی تـر لـە مەدینـە و لەگـەڵ یەکێکی تر لە یەمەن بەبێ ئەوەی هەموو ئەمانە بەڵگەیەکیان لابێت کە هاوشێوە بێت لە ئاماژەدان؟!.

ئەمە ئەو هۆکـارە بـوو کـە وای لـە پێشـەوا شـافیعی کـرد کـە بـۆ وەرگرتنـی فەرموودەی (مورسەل)، مـەرجی ئـەوەی دانـا کـە لـە ئاماژەکـەی هاوشـێوەبێت لەگـەڵ وتـە و بۆچـوونی هاوەڵەکـە، لەبەرئـەوەی ئەمـە جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتەوە کە ئەم فەرموودە مورسەلە لای ئەم هاوەڵە ناسراو بووە، ئـەو هاوەڵـە لە هەڵێنجانی ڕای فیقهی پشتیبەستووە بەم فەرموودەیە[1].

٢٢. زانایـانی فـەرموودە ئەوانـەی هەڵسـان بـە کۆکردنـەوەی فـەرموودە و نووسـینەوەی ئامانجیـان دانپێـدانانی فـەرموودە و سـەلماندنیان نـەبوو، بـەڵکو ئامانجیان کۆکردنەوە و پاراستنیان بوو لە لەناوچوون، سوننەت ئەو کات شتێکی زانـراو بـوو، زانایـان و شەرعناسـان و دادوەرانـی هـاوەڵان لەبـەریانکردبوو، لـە مزگەوتـەکانیان قسـەیان لەسـەر دەکـرد، لـە دادگاکـانی خۆشـیان حوکمیـان پێدەکرد، فێری قوتابیەکانیان دەکرد، هیچ کەسێك نەیدەتوانی بگـات بـە پلـەی دادوەر، یاخود موفتی و وانەوتنەوە و فێرکردن، تەنها مەگـەر زانـا و شـێخەکانی پێشووتر گەواهییان بۆ دابا، کە ئەمە کەسێکی شیاوە[2].

هەروەك سەدان کەس لە ڕۆڵەکانی هاوەڵان قورئانیان بـە زارەکـی لەبـەرکرد، بـەبێ ئـەوەی زۆربـەیان خـاوەنی قورئـان بـن (وەك پـەرتووك لایـان بێـت)،

---

١- البحر المحيط للزركشي (٤١٨/٤).

٢- حلية الأولياء (٣١٧/٦)، وسير الأعلام (٦٢/٨)، لە باسی مالیك لەگەڵ مامۆستاكانی.

بەمشێوەیەش زۆرێك لە فەرموودەكانی پێغەمبەریان لەبەركرد[1]، فێری ڕاڤەی قورئان و تێگەیشتنی فەرموودەیان دەكرد، لە زانایانی هاوەڵان، ئەوانەی كە لە مزگەوتەكان وانەیان پێدەوتن و ئامادەیان دەكردن بۆ ئەوەی ببنە شەرعناس، دادوەر، فەرموودەناس، بەڕاستی ئەوان بوونە دادوەر و زانا لە سەردەمی هاوەڵان، ئەویش بەبوونی مامۆستاكانیان لە هاوەڵە زاناكان[2]، ئیبن عەبباس عەكریمەی قوتابی و خزمەتكاری فێری قورئان و فەرموودە كرد، دواتر كاتێك بووە زانا ڕێگەی پێدا فەتوا بدات، ئەویش لەلای مامۆستاكەی و لەژێر چاودێری ئیبن عەبباسدا فەتوای دەدا[3].

هەروەك زاناكان لە شوێنكەوتووان، تەنها بەوە وازیان نەدەهێنا كە گوێبیستی فەرموودەیەك بن لە هاوەڵێك، بەڵكو كاتێك گوێبیستی فەرموودەیەك دەبوون لە ئەبو هورەیرە –وەك نموونە– ئەوا لەبارەی ئەم فەرموودەیە لە هاوەڵانی تریان دەپرسی، بۆ نموونە عائیشەی دایكی باوەڕداران[4]، عەبدوڵڵای كوڕی عومەر و جابیری كوڕی عەبدوڵڵا، جیا لەمانەش لەو هاوەڵانەی كە هەموویان لە مزگەوتی پێغەمبەر (درورد و سڵاوی خودای لێبێ) نوێژیان دەكرد، هەروەها خەڵكیان تێیدا فێردەكرد.

هەروەك ئەوان گێڕانەوەی كۆنی هاوەڵەكە لەگەڵ گێڕانەوەی دواتری وەردەگرت، هەندێك لە زانایانی شوێنكەوتوان ماوەیەكی درێژ لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵان بوون، ئەگەر هاوەڵێك فەرموودەیەكی گێڕابایەوە پاشان دوای چەند ساڵێك هەروەك پێشووتر گێڕابایەوە، وەك جاری یەكەم دووبارەی بكردبایەوە،

---

١– الأنوار الكاشفة للمعلمي (٤٥)، و (٨٠).

٢– إحكام الأحكام (١٥٤/٤).

٣– سير الأعلام (١٤/٦).

٤– أحمد (٢٤٦/٦)، لە باسی چیرۆكی عائیشە لەگەڵ ئەبو هورەیرە، وفتاوى ابن تيمية (٣٦/١٨).

ئەوا ئەو كات دەیانزانی كە ئەم هاوەڵە ئەم فەرموودەیـەی لەبـەركردووە، ئەگـەر گێڕانەوەكەش جیاوازبووایە، ئەوا دەیانزانی كە بە دروستی لەبەری نەكردووە[1].

بەمشێوەیەش قوتابیانی شوێنكەوتووان لەگەڵ شوێنكەوتووان ئـەم كارەیـان دەكرد[2]، بەراوردیان لەنێوان گێڕانەوەكانی قوتابیـانی هاوەڵێـك دەكـرد، ئەگـەر وەكیەك بووایە –بە نموونە– قوتابیانی عەبـدوڵڵای كـوڕی عومـەر، وەك نـافیع و عەمری كوڕی دینار لەگەڵ ڕیوایەتی كوڕەكەی، سالیمی كوڕی عەبدوڵڵای كـوڕی عومەر، لەسەر یەك فەرموودە، ئـەو كـات دەیـانزانی كـە لەبـەریانكردووە، بـەڵام ئەگەر بینیبایانە كە جیاوازن، ئەوا ئەو گێڕانەوەیان لاسەنگ دەكرد كـە زۆرتـرین قوتابیانی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر لەسەری یەكدەنگبوون. بـەم ڕێگەیـە زانایـانی فەرموودەناس ئەو هەڵانەیان دەدۆزییەوە كـە زۆرجـار لـە گێڕانـەوەكان دروسـت دەبوون[3].

ئەوەی یارمەتی ئەمانەشی داوە ئەوەیە كە زۆربـەی فـەرموودە سـەحیحەكان كۆمەڵێك لە هاوەڵان –دوو یان زیاتر–[4] گێڕاویانەتەوە، هـەموو ئـەو هاوەڵانـەی كە لەبەركەری فـەرموودە بـوون، زۆرێـك لـە شـوێنكەوتەی هـەبوون، هەنـدێكیان فـەرموودەكانیان دەنووسـییەوە، هەنـدێكی تـریش تـەنها لـە مێشـكی خۆیـان لەبەریان دەكرد، هەموو یەكێك لە هاوەڵانیش كۆمەڵێك قوتابی زۆری هەبوو.

---

١– منهج النقد عند المحدثين (ص: ٦٧ –٧٩).

٢– سير الأعـلام (١٩/٦)، بابـەتی پرسـیاركردنی قوتابیـانی عیكریمـە لـە قوتابیـان و هـاوەڵانی ئـیبن عەبباس دەربارەی ڕاستێتی ئەوەی كە عیكریمە لە ئیبن عەبباسی مامۆستایانەوە دەیڵێت.

٣– فتاوى ابن تيمية (١٩/١٨).

٤– فتاوى ابن تيمية (٢٢/١٨)، العواصم من القواصـم لابـن الـوزير (١٦٣/٣– ٢٠٧)، والأنـوار الكاشـفة (٨٠)، و (٨٢).

نافیعی خزمەتکاری ئیبن عومەر -بە نموونە- دەیان قوتابی هەبوو، هەموویان لە زانا گەورەکان بوون، وەك؛ مالیکی کوڕی ئەنەس، ئیبن جورەیج، عوبەیدوڵای کوڕی عومەر، لەیسی کوڕی سەعد، یەحیای کوڕی سەعد، ئیبن عەون... تاد[1]، هەموو ئەمانە فەرموودەکانیان لە نافیعەوە لەبەردەکرد و دەیاننوسییەوە، بە بەراوردکردنی گێڕانەوەکانیان لە نافیعەوە، ئەوا دەردەکەوت ئاخۆ لە گێڕانەوەی هیچ یەکێکیان هەڵە هەیە یاخو نا[2].

٢٣. بۆچوونێکی هەڵەیە کە بڵێن فەرموودەیەك تەنها لە ڕێگەی یەك هاوەڵەوە بیستراوە -بە نموونە- واتە هیچ کەسێك گوێبیست نەبووە لە پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) تەنها ئەم هاوەڵە نەبێت، لەبەر ئەوەی نەگێڕانەوەی ئەوانی تر مانای ئەوە نییە کە ئەوانی تر نەیانزانیوە، بەڵکو لەوانەیە ئەم فەرموودەیە لای زۆرێك لە هاوەڵان زانراو بووبێت[3]، مەرجیش نەبووە هەموو یەکێك لەوان ئەمە بگێڕێتەوە، بەڵکو ئەوەندە بەسە یەکێکیان بگێڕێتەوە و ئەوانی تریش دانبنێن بەم گێڕانەوانە[4]، لەوانەیە چەندین هاوەڵی تر هەبووبن بۆ خەڵکیان گێڕابێتەوە، بەڵام پێویست نەبووە هەموو گێڕانەوەکان بگەن بە ئێمە، لەبەر ئەوەی هەموو ئەو هاوەڵانەی گوێبیستی فەرموودەی پێغەمبەر بوون نەیانگەیاندووە بە خەڵکانی تر، لەبەر چەند هۆکارێك یان چەند شتێکی تر، وەك ئەوەی خۆی تەرخان کردووە بۆ پەرستش و خوداپەرستی ئەوەی گوێبیستی

---

١- بابەتی ئاستەکان و قوتابیەکانی نافیع لە: سیر الأعلام (٥/٩٦).

٢- بۆ زیاتر ئاشنابوون بڕوانە: التميز للمسلم (١٧٢)، و (١٧٦)، و (١٨٤)، و (٢١١)، ومنهج النقد عند المحدثين، د. الأعظمي (٦٠ - ٧٩)، والأنوار الكاشفة (٨١).

٣- باسی ئەبو موسای ئەشعەری و عومەر لە مۆڵەت وەرگرتن لە: البخاري: حديث رقم (٦٢٤٥).

٤- فتاوى ابن تيمية (١٨/ ٢٢): چیرۆکی ئەبو هورەیرە لەگەڵ ئەبو سەعیدی خودری.

بووبوو نەیدەگێڕایەوە، یاخود خەریك دەبوو بە كاروباری ژیانی تایبەتی، یاخود دەمرد پێش ئەوەی بگاتە ئەو تەمەنەی كە بشێت بۆ ئەوەی ببێتە مامۆستا بۆ ئەوانی تر، یاخود ئەو فەرموودانەی لەبیردەچووەوە كە لە هاوەڵانی تر گوێبیستی دەبوو . . تاد[1].

٢٤. هیچ پەیوەندییەك لەنێوان زانست و گێڕانەوەدا نییە، لەوانەیە مرۆڤێك زانا بێت لە زانستێك لە زانستەكان، بەڵام هەڵناستێت بە فێركردنی كەسێك، ئەویش لەبەر هۆكارێك كە هەیەتی، بۆ نموونە ئەمڕۆ هەزاران موسوڵمانان هەر لە منداڵییەوە قورئانی پیرۆز لەبەر دەكەن، بەڵام ئەمانە هەموویان نەبوونە مامۆستا بۆ ئەوەی خەڵكانی تر فێر بكەن، بەڵكو ژمارەیەكی كەم لەمانە كاری فێركار و مامۆستا دەكەن.

دۆخی هاوەڵانیش بەمشێوەیە بوو، زانایانی هاوەڵان و فەرموودە لەبەركاران ژمارەیان زۆر بوو، بەڵام هەموویان كاری وانەوتنەوە و فێركارییان نەدەكرد، لەبەرئەوەی هەریەكێكیان بارودۆخی تایبەتی خۆی هەبوو، چوار جێنشینەكە خەریكی خەلافەت و دەوڵەتداری بوون، لەبەرئەوە گێڕانەوە لەوانەوە زۆر كەمن، لەگەڵ ئەوەی ئەوان زاناترینی هاوەڵان بوون، زۆرترین كاتیش لەگەڵ پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) بوون، بە بەراورد لەگەڵ هاوەڵانی تر، لەكاتێكدا عەبدوڵڵای كوڕی عومەر، ئەبو هورەیرە، جابیری كوڕی عەبدوڵڵا، ئەنەس، عائیشە، جیا لەمانەش گێڕانەوەیان زۆرن، لەبەرئەوەی ئەمانە كاری وانەوتنەوە و فێركردنیان گرتەئەستۆ، هەروەها ماوەیەكی زۆر ژیان پاش مردنی زۆری هاوەڵان[2].

---

١- بڕوانە: الأنوار الكاشفة (ص: ٦٢-٦٣).

٢- بڕوانە: الأنوار الكاشفة (ص: ٦٢ - ٦٣).

لەبەرئەوە کاتێك هاوەڵان گوێبیستی وتەیەکی نامۆ بووبان نکۆڵییان لێدەکرد و گفتوگۆیان لەگەڵ ئەو هاوەڵە دەکرد، کە لە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) دەیگێڕایەوە[1].

ئەمەش جەختدەکاتەوە لەسەر ئەوەی نەکردنی کاری فێرکاری، مانای نەزانین و بێئاگابوون نییە لە فەرموودە، بێدەنگی و نکۆڵی نەکردن لە گێڕانەوەی ئەم کەسە، یاخود یەکێکی تر بەڵگەیە لەسەر داننانی ئەوان بە دروستیی ئەوەی دەیگێڕێتەوە و دانەپاڵ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، گەر وا نەبووایە هەر زوو نکۆڵییان لێدەکرد.

٢٥. هەروەك زانراوە نووسینەوەی هەر زانستێك لە زانستەکان پاش هاتنە بوونی ئەو زانستە دێت، نووسینەوەی زانستەکان قۆناغی دواترە، پاش دروستبوونی زانستەکەیە، بۆ نموونە: عەرەب ڕێساکانی زمانی خۆیان بە باشی دەزانی و بەکاریان دەهێنا پێش نووسینەوەی پەرتووکی (النحو)[2]، شاعیران دەیانزانی چۆن شیعرەکانیان بهۆننەوە پێش نووسینەوەی پەرتووکەکانی (العروض)[3]، هەروەها بنەماکانی دەستووری بەریتانی لەلای پیاوانی دادوەری بەریتانی و پیاوانی یاسا و سیاسەت شتێکی زانراو بوو، ئەگەر دەستوورەکەش نەنوسرابێتەوە.

---

١- بڕوانە: أحمد (٢٨٧/٢): چیرۆکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لەگەڵ ئەبو هورەیرە و عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێت)، و (١/١٤-١٥): چیرۆکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لەگەڵ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێیان ڕازی بێت)، هەروەها بڕوانە: فتاوى ابن تيمية (٢٢/١٨).

٢- بڕوانە: تأريخ ابن خلدون (١/ ٥٤٦- ٥٤٧) لە بابەتی زانستی نەحو.

٣- بڕوانە: تأريخ ابن خلدون.

زانایانی فەرموودەش بەمشێوەیە بوون، ئەوانەی دەستیان بە نووسینەوەی کرد ئامانجیان سەلماندنی بەڵگەی تەشریعی نەبوو، بەڵکو ئامانجیان پاراستن و کۆکردنەوەی بەڵگەکان بوو کە مەترسی لەناوچوونیان هەبوو، هەروەك هاوەڵان ئەمەیان کرد، کاتێك هەستان بە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز لە دووتوێی پەرتووکێکدا.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە ڕاشکاوی ئەم کارەی کرد، کاتێك فەرمانی کرد بە کۆکردنەوەی فەرموودەکان لە ساڵی (١٠٠ك)، کە یەکەم فەرمانی فەرمی بوو بۆ کۆکردنەوەی فەرموودە، عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش ئەم کارەی لەبەر مەترسی لەناوچوونی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لێبێ) کرد[١]، لەبەرئەوە نەبوو کە شارەزای فەرموودە نەبوو و نەیدەزانی و ویستویەتی فێربێت، بەڵکو ئەو یەکێك بوو لە زانا گەورەکان، هەروەها هەموو ئەو دادوەرانەی لە هەموو هەرێمە ئیسلامییەکان دادوەریان لەنێوان خەڵکی دەکرد، بەگوێرەی حوکمی قورئان و سوننەت کاریان دەکرد، پێش ئەوەی فەرمانی کۆکردنەوەی فەرموودە دەربکات، هەروەك عوسمانی کوڕی عەفان هیچ شتێکی نوێی لەو مەصحەفانە زیاد نەکرد کاتێك بۆ هەرێمەکانی نارد، لەبەرئەوەی موسوڵمانان پێش ئەو مەسحەفانە قورئانیان لەبەرکردبوو، بەمشێوەیەش عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هیچ شتێکی نوێی بۆ فەرموودە زیادنەکرد[٢].

٢٦. ئێمە ئێستا لە سەدەی پانزەی کۆچیداین، دەبینین هەزاران موسوڵمان قورئانی پیرۆز لەبەر دەکەن، هەروەها هەزاران زانا هەموو پەرتووکەکانی

---

١- تقييد العلم للخطيب البغدادي (ص: ١٠٥).

٢- الأنوار الكاشفة (ص:٤٥).

فەرموودە، فیقھ، بنەماکانی فیقھ، نەحو، ئەدەب، شیعر لەبەردەکەن، ھەروەك ئەمە ڕێگەیەکی نەریتی کۆنە بۆ لەبەرکردنی زانستەکان، ھەندێکیان ھەر شەش پەرتووکەکانی فەرموودە لەبەردەکەن (بوخاری و موسلیم و ئەبو داود و تورموزی و ئیبن ماجە و نەسائی) بە سەنەدەکانیشەوە کە ناوی ھەزاران گێڕەرەوە لەخۆدەگرێت، وێڕای مەتنەکانی کە ھەزارەھا دەق لەخۆدەگرێت، کە زۆربەیان دووبارەن، کەواتە لەسەر زانایانی ھاوەڵان شتێکی سەخت نەبوو کە ٥٪ لەو چەندێتییە لەبەربکەن، چونکە لە سەردەمی ئەوان سەنەد بوونی نەبوو ئەمەش بەھۆی ئەوەی ئەوان ڕاستەخۆ لە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لێبێ) گوێبیست دەبوون و دەیانبینی، پێویست بەوە نەبوو کە ناوی ھەزاران گێڕەرەوە لەبەربکەن، ھەروەك پێویست نەبوو فەرموودەکانی ھەموو ھاوەڵانی تر لەبەربکەن، چونکە ئەمە لە پەرتووکەکانی فەرموودەدا فەرموودەی دووبارەن، فەرموودەناسان بۆ ھەر فەرموودەیەك ھەڵدەستان بە کۆکردنەوەی ھەموو گێڕانەوەکان، ھەر گێڕانەوەیەکیش بە فەرموودەیەکی سەربەخۆ ھەژماردەکرد، با ئەگەر مەتن(دەق) و وێژەکەش وەك یەك بوونایە، ئەمەش بووە ھۆی چەندانەی ژمارەی تەنھا یەك فەرموودە، بەگوێرەی ژمارەی ئەو ھاوەڵانەی کە لە پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خودای لێبێ) دەیانگێڕایەوە، بۆ نموونە: فەرموودەی مەسحکردنی خوفف، حەفتا کەس لە ھاوەڵان لە پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خودای لێبێ) گێڕاویانەتەوە[1]، وێڕای ئەوەی ھەموویان یەك فەرموودەن و دەربارەی یەك بابەتن، ئەگەر زانا فەرموودەناسانی پاشین حەفتا ڕێگە و گێڕانەوە بە سەند و وێژەکانەوە دەربارەی یەك فەرموودە لەبەرکردبێت، ئەوا زانایانی ھاوەڵان و فەرموودەناسان لەم حەفتا ڕێگەیە پێوستیان بەو کەسە

---

١- الأوسط في السنن لابن المنذر (٤٢٦/١-٤٣٣).

بووە کە لە پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) گێڕاویەتییەوە، یاخود ڕاستەوخۆ گوێبیست بووە لە پێغەمبەرەوە، یاخود زانیویانە کە لە ژیانی پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) شتێکی زانراو بووە.

لەبەرئەوە شەرعناسان باسی ئەوەیان کردووە کە فەقیهی ڕادۆز (موجتەهید) لەگەڵ قورئانی پیرۆز تەنها پێویستی بە (٥٠٠) فەرموودەیە بەبێ دووبارەبوونەوە، ئەمانەش بریتین لە فەرموودەکانی بنەما کە فیقه و یاسادانان و دادوەری ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت[1]، ئەو فەرموودانەن کە زانا فەرموودەناسەکان لە پەرتووکی تایبەت دا نووسیویانە بەناوی (أحاديث الأحكام).

وا دەردەکەوێت کە دادوەر عامری شەعبی (٣٠– ١٣٠ك) کە یەکێك بوو لە قوتابیانی هاوەڵان، گرنگی بە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی حوکمەکان دەدا لە یەك پەرتووکدا، ئەمەش لەم وتەیەی قوتابییەکەی عاسم دیارە کاتێك دەڵێت: "فەرموودەکانی فیقهمان نیشانی شەعبی دا و ئەویش ڕێگەی پێدا"[2]، ئەمەش دەقێکی ڕاشکاوە لەسەر ئەوەی کە قوتابیەکانی شەعبی پەرتووکێکی تایبەتیان لە فەرموودەکانی فیقه بۆ خوێندۆتەوە، ئەویش پاش ئەمە ڕێگەی پێداون کە لە ئەوەوە ئەم فەرموودانە بگێڕنەوە.

بێگومان ئەمە مانای ئەوە نییە کە زاناکانی تر ئەم فەرموودانەیان نەزانیوە، چونکە ناکرێت و نابێت کەسێك بووبێتە فەقیه، یاخود دادوەر، ئەگەر زانا نەبێت بە فەرموودەکانی بنچینەی حوکمەکان[3]. شافعی (٢٠٥ك) دەڵێت: "فەرموودەکانی بنچینەی حوکمەکان پێنج سەد و شتێك فەرموودەن هەموویان

---

١– بڕوانە: سير الأعلام (٨/ ٤٥٧ – ٤٥٩)، وإعلام الموقعين (٣٤٢/٢)، والأنوار الكاشفة (ص: ٥٤).

٢– المعرفة والتأريخ (٨٢٦/٢).

٣– البحر المحيط للزركشي (٦/ ٢٠٠)، والفصول في الأصول للجصاص (٤/ ٣٧٣).

لای مالیکن تەنها سی فەرموودە نەبێت، هەروەها هەموویان لای ئیبن عویەینـەن تەنها شەش فەرموودە نەبێت".[1]

بێگومـان پـەرتووکی (موطـأ)ی مالیـك بریتییـە لـە شـەرحی ئـەم فـەرموودە فیقهییانـە، ئەمـە پـەرتووکێکی گشـتگیرە، پێکهـاتووە لـە فـەرموودە و فیقـه، نزیکەی پێنج سەد فەرموودەی فیقهی لەخۆدەگرێت[2]، هـەروەك ئـەو فـەرموودە فیقهییانەی کە لای سوفیانی کوڕی عویەینە بوون، نزیکبوون لـەم ژمارەیـە، کـە بریتییە لە موسنەدی (الحمیدی) کە لەڕاستیدا پەرتووکی سوفیان بوو کـە درایـە پـاڵ قوتابییەکـەی (حومەیـدی)[3]، هـەروەك ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل فـەرموودەکانی مامۆسـتاکەی سـوفیانی کـوڕی عویەینـەی نووسـییەوە لـە موسنەدەکەی خۆی گێڕاویەتییەوە، پێشـەوا شـافیعیش هـەمان شـتی کـرد، کـە گەورەترین قوتابی مالیك و سوفیانی کوڕی عویەینە بوو، هـەروەها توێژینـەوەی لەسـەر کـردووە، پەرتووکـەکانی لەبـەرکردن، ئـەو کاتـەی لـە حیجـاز بـوو پەرتووکـەکانی بـۆ خوێندنـەوە[4]، لەبەرئـەوە پسـپۆڕ و زانـا بـوو بـە ژمـارەی فەرموودەکانی فیقه لای هەریەك لەم دوو مامۆستایە، هەروەها ئەم فەرموودانەی لـە پـەرتووکی (الأم) گێڕاوەتـەوە[5]، لەگـەڵ هـەموو ئەمانـەش نـە مالیـك و نـە سـوفیان و نـە شـافیعی لـە پـەرتووکێك بـەناوی فـەرموودەکانی ئـەحکام

١- سیر الأعلام (٨/٤٥٧-٤٥٩)، مانای (أحادیث الأحکام): واتـە ئـەو فـەرموودە بنچینەییانە کـە فیقهی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت، ئەمەش ڕێگر نییە لـە بـوونی فـەرموودەی لاوەکـی کـە دەربـڕی ڕوونکردنەوەی زیـاد و وردەکارییـە، یـاخود دووبارەکردنـەوەی ئـەو فەرموودانـەی کـە بنچینەییە کـە شافیعی ناوی دەنێت: (أصول الأحکام).

٢- بڕوانە: فضل الموطأ: محمد بن علوي بن عباس (ص:٣٥)، ط١ - ١٩٧٨م، السعادة – مصر.

٣- بڕوانە: مسند الحمیدي – تحقیق: عبد الرحمن الأعظمي.

٤- بڕوانە: السیر للذهبي (٨/٤٥٧-٤٥٩).

٥- بڕوانە: الأم للشافعي.

کۆیاننەکردۆتەوە و نەیاننووسیوەتەوە. لەوانەشە هۆکاری ئەمە بگەڕێتەوە بۆ پێویست نەبوونیان بەم جۆرە پەرتووکانە لەم بابەتانە، لەبەرئەوەی پەرتووکەکانیان گشتگیربوون لەگەڵ بوونی فەرموودەکانی ئەحکام، فەرموودەی تریش بوونی هەبوو لە ئاداب، یاخود ژیاننامە یاخود ڕاڤە یاخود بیروباوەڕ، هەروەك شەرحی مانای ئەم فەرموودانەی تێدابوو، وایلێکرد لەناو بازنەی پەرتووکەکانی فیقهـ بێت، نەوەك بازنەی پەرتووکەکانی فەرموودە.

ئەگەر توێژەر ڕەچاوی هەموو ئەم دۆخانەی کرد کە دەوری بابەتی نووسینەوەی فەرموودەی پێغەمبەریان دابوو، کە بریتین لە:

١. بارودۆخی تایبەت بە هەموو عەرەب، وەك نەخوێندەوارییان، لێهاتووییان بە زانستی زمانەوانی، توانادارییان لەسەر ڕەوانبێژی[1]، کارامەییان لە لەبەرکردنی ڕێك و دروست[2]، خۆشەویستییان بۆ وشەی ڕەوانبێژی و بە گەورە سەیرکردنی ڕەوشتی بەرز، لەوانەش ڕاستگۆیی لە وتندا.

٢. یاخود بارودۆخی تایبەت بە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، وەك زمانپاراوی، لێهاتوویی لەسەر ڕەوانکاری بە کورتترین دەربڕین، دووبارەکردنەوە وشەیەك سێ جار، کەسایەتییە سەرنجڕاکێشە کاریگەرەکەی، لەخۆیدا کەسایەتییەکی گشتی ناودارە، تاکو دوای جێگیربوونی دەوڵەتی خۆی کۆچی دوایی نەکرد، سوننەت و یاساکانی بڵاوبوونەوە.

٣. یاخود بارودۆخی تایبەت بە هاوەڵان، وەك زۆری ژمارەیان، خۆشەویستی لە ڕادەبەدەریان و سەرسامییان بە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی

---

١- فتح الباري (١/١٩٧).

٢- بڕوانە: الأنوار الكاشفة (ص:٨٠).

خــوداى لــێبىٚ) ، شــوێنپىٚ هــەڵگرتنى، پارێزگــاريكردنى دەوڵــەت و ياســاكانى، هەروەها كۆششكردن لە جێبەجىٚ كردنى.

ئەگەر توێژەر ڕەچاوى هەموو ئەمانەى كرد، ئەوا بە سانايى لە ڕەهەندەكانى ئەم بابەتە دەگات، تێگەيشتنێكى دروست، دوور لـە بيركردنـەوەى وەلانـان، كـە هـــەموو ئـــەم بارودۆخانـــەى دەورى بابـــەتى قورئـــان و فـــەرموودەيان داوە ڕەتدەكاتەوە، ئەمـەش ئـەو بارودۆخانـەن كـە گـەورەترين كاريگـەرى هـەبوو لـە پارێزگــاريكردنى فــەرموودە، تــاكو بــە تــەواوى لــە ســەدەى دووەمــى كۆچــى نووسرانەوە.

# قۆناغەکانی نووسینەوەی فەرموودە

دەتوانین لەم چوار قۆناغەدا کورتی بکەینەوە:

## قۆناغی یەکەم: قۆناغی نووسین:

قۆناغی نووسین لە ساڵی (١)ی کۆچی بۆ(٧٣)ی کۆچی تاکو مردنی کۆتا خەلیفە لە هاوەڵان، ئەویش(ئیبن زوبەیر) بوو، لەم قۆناغەدا هاوەڵان زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەریان نووسییەوە لەو کاتەی کە لە ژیاندا مابوو و لەو کاتەشی کە کۆچی دوایی کرد، ئەم قۆناغەش بەمشێوەیە دابەشدەکرێت بۆ:

**ماوەی یەکەم:** هەر لە ژیانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ئەم کارە کرا، هەر لەو کاتەی کۆچی کرد بۆ مەدینە ساڵی (١ك)، تاکو وەفاتی کرد ساڵی (١١ك)، لەم ماوەیەدا زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لە سوحوف و پێست نووسران، ئەم بەشەشی کە نووسرا بۆ دوو بەش دابەشدەکرێت:

١. ئەوەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) فەرمانی بە نووسینەوە کرد لە پەیماننامەکان، بەڵگەنامەکان، پەیامەکان، وەك؛ نووسینی ئەو بەڵگەنامەیەی کە لە کاتی چوونی بۆ ناو شاری مەدینە نووسی، تێیدا لەلایەك پەیوەندی نێوان موسوڵمانە کۆچکردووەکان و خەڵکی مەدینەی ڕێکخست، لەلایەکی ترەوە نێوان موسوڵمان و ناموسوڵمان و جولەکەکانی ڕێکخست، ئەمەش بەڵگەنامەیەکی دەستووری بوو کە پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی ڕێکخست لەسەر بناغەی لێبوردەیی ئایینیی و هاوکاری کۆمەڵایەتی، هەروەك چەندین یاسای سیاسی، ئابووری، دادوەری تێدابوو، کە بە

پێشـکەوتووترین بەڵگەنامـەی دەسـتووری هـەژمار دەکرێـت، ئـەبو عەبیـد لـە پەرتووکی (الأموال) لە سێ پەڕاو باسی کردووە[1].

هەروەها ئەو بەڵگەنامەیەی کە تێیدا پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) پەیماننامەی لەگەڵ پشتیوانانی نەجراندا گرێدا، هـەر لـەو بەڵگەنامەیـەدا مـاف و ئەرکـەکانی ڕوونکردۆتـەوە[2]، جیـا لەمـە لـە پەیماننامـەی ئاشـتەوایی لـەنێوان پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لـێبێ) و تـیرە و شـارە عەرەبنشـینەکان، کـە چەندین سوننەت و یاسا لەخۆدەگرێت[3].

ئەمە بەشێکە لە فەرموودە کە بە فەرمانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسرا، زانا و مێژوونووسە پێشینەکان ئـەم بەڵگەنامـە و پەیماننامانـەیان بینیوە لە پەرتووکەکانی خۆیان هێناویانە.

هەروەها چەندین پەیام و نووسین هەیە کە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) بەخۆی فەرمانی کردووە کە بنووسرێن، وردەکاری زۆری تێدایە دەربـارەی یاسا ئابووری و دادوەریەکان، وەك:

---

١– بڕوانە: السيرة النبوية– ابـن هشـام (١/٥٠١– ٥٠٤)، والأمـوال– لأبـي عبـد الله القاسـم بـن سـلام، (ص:٢١٥) رقم (٥١٨)، وسنن البيهقـي (٨/١٠٦)، وعيـون الأثـر لليعمـري (١/٣١٨)، ط١، ١٩٩٢م، دار تراث المدينة، والبداية والنهاية– ابن كثير (٣ / ٢٢٣)، السنة قبل التدوين (ص:٢٩٨)، مجموعة الوثـائق السياسية للعهد النبوي: محمد حميد الله (ص: ٥٧) ط٦، ١٩٨٧م، النفائس– بيروت.

٢– بڕوانە: الخراج لأبي يوسف القاضي (ص: ٧٢)، والأموال لأبي عبيد (ص:٢٠١)، رقم (٥٠٣)، وفتوح البلدان للبلاذري (ص: ٥٨).

٣– ئیبن سەعد زۆربەی ئەم پەیماننامانەی باسکردووە لـە: الطبقـات (١/١٩٨–٢٢١)، و ئـەبو عوبەیـد لـە: الأمـوال (ص: ٢٠١–٢١٩)، و ئـیبن حیببـان لـە: صـحيح ابـن حبـان (١٤/ ٤٩١–٥١٠)، و کتـێبی مامۆستا محمد حميـد الله (مجموعـة الوثـائق السياسـية) لێـرەدا هـەموو بەڵگەنامـە و پەیماننامـەکانی سەردەمی پێغەمبەری تێدا کۆکردوونەتەوە.

أ. نووسراوی (الصدقات) کە تێیدا پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ، بە وردی ئەندازەی زەکاتی واجبی دیاریکردووە لە سەروەت و ماڵ، هەروەها چۆنیەتی وەرگرتن و کۆکردنەوەی لە خاوەنەکانی، نوسراوێکی گەورەیە کە پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) پێش وەفاتکردنی نووسی، لە لای ئەبوبەکری سدیق جێنشینی یەکەم بوو[1]، چەند دانەیەکی لەبەرگرتەوە بۆ جابیەکان، ئەوانەی کە زەکات وەردەگرن و کۆدەکەنەوە، مۆری پێغەمبەری (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) لەسەر بوو، لەدوای ئەویش لای جێنشینی دووەم عومەری کوڕی خەتتاب بوو،[2] خانەوادەکەی ئەم پەرتووکەیان پاراست، تاکو شیهابی کوڕی زوهری دانەیەکی لەبەرگرتەوە، پاش ئەوەی سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب پیشانی دا[3].

هەروەك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای خاڵیی وەرگرت و لەبەریگرتەوە، کاتێك کە ئەمیری مەدینە بوو، پاشان خەلیفەی ئەمەوی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك فەرمانی کرد کە دانەی زۆری لەبەربگرنەوە، دواتر بۆ فەرمانڕەواکانی هەرێمەکانی نارد بۆ ئەوەی پێوەی پابەند بن[4].

بەمشێوەیەش دانەیەك لەم پەرتووکە لای ئەنەسی کوڕی مالیکی خزمەتکاری پێغەمەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) مایەوە کە ئەبوبەکری سدیق دانەیەکی لەبەرگرت و بۆی نووسییەوە، کاتێك بۆ کۆکردنەوەی زەکات بۆ خەڵکی بەحرەینی نارد، ئەم دانەیە لای خانەوادەی ئەنەس مایەوە، تاکو لای نەوەکەی قازی سەمامەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەنەس کە لەساڵی (١١٥ك) لە بەسرە

---

١- بڕوانە: صحيح البخاري: حديث رقم (١٤٥٤)، و (١٤٥٥)، و (١٤٥٣)، وفتح الباري (٣١٨/٣).

٢- بڕوانە: سنن أبي داود: حديث رقم (١٥٦٨)، والترمذي (٦٢١).

٣- سنن أبي داود: حديث رقم (١٥٧٠).

٤- بڕوانە: مستدرك الحاكم (٣٩٢/١/ ٣٩٥).

مردووه، دواتر حەممادی کوڕی سەلەمە (١٦٧ك کۆچی دوایی کردووە) دانەیەکی لێوەرگرتووە[1].

هەموو شەرعناسان کاریان بەم پەرتووکە کردووە، کە لە پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خودای لێبێ) هاتووە[2].

ب. هەروەها سەحیفەی عەمری کوڕی حەزم کاتێك پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لێبێ) بۆ ناو خەڵکی یەمەن ناردی و پەیامێکی بۆ نووسی، کە زۆرێك لە یاسای ئابووری و دادوەری و جیا لەمانەش لە جۆرەکانی تری یاسای تێدابوو، ئەم پەیامەش درێژ بوو نزیکەی سێ پەڕاو بوو -پەڕاوی ئەوکات، نەوەك ئێستا- کە وردەکای زۆری تێدابوو دەربارەی سزادان و خوێنباییەکان[3].

خەلیفەی کوڕی خەیات دەربارەی ناردنی عەمری کوڕی حەزم بۆ ناو خەڵکی یەمەن لە ساڵی (١٠ك)، دەڵێت: "پێغەمبەری خودا (درود و سڵاوی خودای لێبێ) عەمری کوڕی حەزمی نارد بۆ ناو خەڵکی یەمەن، بۆ ئەوەی ئایینی خودا و سوننەتی پێغەمبەریان پیشان بدات و فێریان بکات، پاشان سەدەقە و بەخشینەکانیان لێوەربگرێت"[4].

ئەم پەیامەش لای خانەوادەی عەمری کوڕی حەزم مایەوە، تاکو چووە لای نەوەکەی ئەبوبەکری کوڕی موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمی والی مەدینە

---

١- سنن أبي داود: حديث رقم (١٥٦٧)، والنسائي: رقم (٢٤٤٧)، وابن ماجة (١٨٠٠)، ومسند أحمد (١١/١)، ومسند الموصلي (١١٥/١): رقم (١٢٦)، وصحيح ابن خزيمة (١٤/٤)، ومستدرك الحاكم (٢٩٠،٢٩٢/١).

٢- الترمذي: حديث رقم (٦٢١).

٣- ئەم سەحیفەیە بە تەواوی هاتووە لای هەریەك لە: ابن حبان في صحيحه برقم (٦٥٥٩)، والحاكم في المستدرك (٣٩٥/١- ٣٩٧)، والبيهقي في السنن الكبرى (٨٩/٤-٩٠)، و عبد الرزاق لە موسەنەفەکەیدا زۆری گێڕاوەتەوە (٤/٤)، مالیکیش لە (الموطأ)دا کورتی کردۆتەوە (٨٤٩/٢)، وابن خزيمة (٢/ ٨٤٩).

٤- تأريخ خليفة بن خياط (ص:٩٤).

و دادوەرەکەی، لـە خەلافـەتی عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز، هـەر ئـەویش بـوو عومەر داوای کۆکردنەوەی فەرموودەکانی لێکرد[1].

پێشەوا ئـیبن شـیهابی زوهـریش چـاوی بـەم پـەرتووکـە کـەوتووە، کـە لـەلای ئەبوبەکری کوڕی حەزم بووە و لەسەر پارچە پێستەیەك نووسرابوو[2].

هەموو ئەوەی لەم سەحیفەیەدا هاتووە ئەو کات هـەمووی زانـراو بـووە، هـەر لەسەردەمی هاوەڵانەوە، هەر چوار خەلیفەکە کاریان پێکردووە، دادوەرەکـانیش کاریان بەو یاسایانە کردووە، کە لەو پەیامەدا هاتووە، هەتاکو ئەوەی کەس نەما نـەیبینێت، چـونکە ئـەوەی تێیـدا بـوو هاوشـێوە بـوو لەگـەڵ ئـەوەی کـە لـە پێغەمبـەرەوە چەسـپاوە، هـەروەها هاوشـێوە بـوو لەگـەڵ ئـەوەی کـە چـوار خەلیفەکـە کاریـان پێـدەکرد، ئەوەشـی کـە ناسـراوە لـەنێو شـەرعناس و دادوەرەکان.

ج. هەروەها عەلی کوڕی ئەبوتالِب – کوڕە مامی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خودای لێبێ) و خەلیفەی چوارەم – سـەحیفەیەکی لا بـووە[3]، کـە بـە فـەرمانی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) نووسـییەوە، زۆرێـك لـە یاسـا و ئەندازەگیری زەکات و سزادان، جیا لەم یاسایانەش، لە هەندێ حوکم و سوننەتی تری تێدابوو، تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی سەحیفەی عەمری کوڕی حەزم بوو لە سزادان و خوێنباییەکان، هەروەها سەحیفەی ئەبوبەکر و عومەر لە زەکاتدا.

---

١- بڕوانە: تهذيب الكمال (١٤٠/٣٣).

٢- النسائي (٥٨/٨-٦٠).

٣- بوخاری لە صەحیحەکەیدا باسیکردووە: ژمـارە (١١١)، موسـلیمیش لـە صـەحیحەکەیدا: ژمـارە (١٩٧٨)، عبد الرزاق بەدرێژی لە موسەنەفدا گێڕاویەتەوە (٤/ ٥-٧)، بگەڕێوە بۆ: شرح ابـن حجـر في فتح الباري لحديث رقم (١١).

د. هەروەها پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) فەرمانی بە پیاوێك كـرد كە خەڵكی یەمەن بوو ناوی (ئەبو شاه) بوو بـۆ نووسـینەوەی وتارەكـەی كاتێـك مەككە ڕزگار كرا[1].

هەریەكە لە سەحیفەی ئەبوبەكری سدیق، سـەحیفەی عـەمری كـوڕی حـەزم، سـەحیفەی عـەلی كـوڕی ئـەبی تالـیب، هـەموویان نزیـك سـاڵی دەیـەمی كۆچـی نووسران، ئەو كاتەی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) تێیدا حەجی كرد، هــەروەك پێكهــاتبوو لــە یاســاگەلێك لــەبارەی زەكــات و ســزادان و خوێنبــایی، ئەمانــەش بابــەتی گــرنگ و پێویســتن، هــەروەها پەیوەســتن بــە ژیـانی ڕۆژانــەی خەڵكی، تـا ئـەو ڕادەیـەی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) سـووربوو لەسەر نووسینەوە و پاراستنی، ئەمەش بە پێچەوانەی فەرزەكانی تر وەك؛ نوێـژ و ڕۆژوو و حەج، لەبەر ئەوەی هـاوەڵان هـەموو كـات لەگـەڵ پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) بـوون، هاوشـێوەی پێغەمبـەر پەرسـتش و فـەرزەكانیان بەجێدەگەیاند، ئەمەش پێویستی بە نووسینەوە نەبوو بە پێچـەوانەی یاسـاكانی تـر، پاشـان زەكـات و سـزادان، كـە پەیوەسـتە بـە مافـەكانی تـاك، لەبەرئـەوە پێویست بوو بنووسرێنەوە، تاكو نـاكۆكی و ململانێـی گـەورەی لەسـەر دروسـت نەبێت.

ئەم پەیام و پەیمان و بەڵگەنامە و سەحیفانە، كە زۆرێـك لـە یاسـا سیاسـی و ئـابووری و تاوانكارییـەكان لـەخۆدەگرێت، كـە بەشـێكە لـە قۆنـاغی یەكـەمی نووسینەوەی فەرموودە، ئەمەش لـە ژیـانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لێبێ) كرا، هەروەها فەرمانی پێكرا، دواتر هەر چوار خەلیفەكە كاریان پێكرد.

---

١- بڕوانە: صحيح البخاري برقم (١١٢)، وتأريخ التراث العربي (١/١٤٥).

ئیبن قەییم دەڵێت: "پێغەمبەری خودا (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) پەیامی بۆ پادشاکان دەنارد، ئەمەشیان لەسەر دەکردە بەڵگە، هەروەها پەیامی بۆ بەرپرسەکانی دەنارد لە وڵاتانی ئیسلامی، ئەوانیش کاریان پێدەکرد، ئەبوبەکری سدیق پەیامی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) لەبارەی زەکاتەوە بە ئەنەسی کوڕی مالیك دا، ئەویش هەڵیگرت و ئوممەت کاری پێکرد، بەم شێوەیەش سەحیفەی عەمری کوڕی حەزم لە سەدەقەکان"[1].

هەروەها دەڵێت: "پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) پەیامێکی گەورەی بۆ عەمری کوڕی حەزم نووسی، کە یاساکانی خوێنبایی و زەکات و جیا لەمانەشی تێدابوو، هەروەها لە سەدەقاتیش پەیامی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب و یەکێکیشی بۆ ئەبوبەکری سدیق نووسی، کە بە ئەنەسی کوڕی مالیکی دا"[2].

پەیامەکانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ناسراو و بەناوبانگ بوون لە سەدەی یەکەمی کۆچی، لەبەرئەوە محەمەدی کوڕی سیرین (١١٠ك کۆچی دوایی کردووە) دەڵێت: "ئەگەر پەیامێکم لەلای خۆم هەڵبگرتایە، ئەوا پەیامەکانی پێغەمبەرم (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) هەڵدەگرت"[3].

ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە بوونی هەبووە، واتە موحەمەدی کوڕی سیرین دەیتوانی دانەیەکی وەربگرێت، ئەگەر بیویستایە.

سەبارەت بەوەی ئایا بۆ پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) فەرمانی بە هاوەڵانی نەکردووە هەموو فەرموودەکان بنووسنەوە، هەروەك فەرمانی بە نووسینەوەی قورئانی پیرۆز دا:

---

١- زاد المعاد (٥/٢٤٢)، هەروەها بڕوانە: الأحكام (٢/١٤٨)

٢- تهذيب السنن -ابن القيم - بحاشية مختصر المنذري لسنن أبي داود (٥/٢٤٥).

٣- طبقات ابن سعد (٧/١٤٥)، هەروەها بڕوانە: نصب الراية للزيلعي (٤/٤٢٠) کە تیایدا هاتووە کە نامەکانی پێغەمبەر لای ئیبن عەبباس بووە، وإعلام السائلين عن كتب سيد المرسلين (٤٨/٥٢).

أ/ قورئـان بناغـەی یاسـاکانە، فـەرموودەش ڕوونکـرەوەی ئـەم بناغەیەیـە، لەبەرئەوە گومانی تێدا نییە کە پاراستنی ئەم بناغەیە لە پێشتر و چاکترە.

ب/ ڕوونکردنەوەی ئـەم بناغەیـە پێویسـتی بـە ماوەیـەکی درێـژ هەیـە، تـاکو پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) بتوانێت ماناکـانی قورئـان بـۆ هـاوەڵان ڕوونکاتـەوە، پـاش دابـەزینی هـەموو حوکمـە شـەرعییەکان، زۆرجـار ئـەم ڕوونکردنەوەیـە لـە ڕێـی کـردار و پیادەکـانی بـوو، هەنـدێ جـاریش بـە وتـە و دانپێدانانـەکانی بـوو، هـەموو ئەمانـەش پێویسـتی بـە کـات و مـاوە بـوو، بـە پێچەوانەی قورئانی پیرۆز کە لە کاتێکی دابەزینی کاتێکی کـەمی دەخایـانـد هـەر دوای ئەمەش ڕاستەوخۆ دەنووسرایەوە.

ج/ قورئان سنورداره بە چەندین سوورەت و ئایەتی زانراو، بەڵام فەرموودەی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) ناتوانرێـت سـنووردار بکرێـت، لەبەرئـەوەی هـەموو ئـەوەی لـە پێغەمبـەرەوە (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) سەرچاوە دەگرێت لە وتە و کردار و دانپێدانانەکان لـەخۆدەگرێت، گومـانی تێـدا نییە نووسینەوەی هەموو ئەمە زۆر سەختە و پێویستی بـە ئەندازەیـەکی زۆر لـە ئامرازەکانی نووسینەوە دەبێت کە فەراهەم نەبوو، لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) بـەو ئەندازەیـە وازیهێنـا کـە فـەرموودە پێویسـتەکان بنووسـرێنەوە، لـەوەی تـریش لـە فـەرموودە و یاسـاکانی پشـتی بەسـت بـە لەبەرکردنی هاوەڵان، کە ماوەی بیست و سێ ساڵ لێیەوە فێربوون[1].

بەتایبەت زۆربەی سوننەت جێبەجێکردنی کردرای بوو، کە لە قورئـانی پـیرۆز هـاتووە، هـەروەها ڕوونکەرەوەیـەتی، هـاوەڵان تـەنها پێویسـتیان بـە زانینـی چۆنیەتی جێبەجێکردنی کرداری بوو.

---

١- الأنوار الكاشفة (ص:٣٢-٣٣)، و (ص: ٤٥).

٢. سەبارەت بە بەشی دووەم ئەوەبوو کە هاوەڵان بە مۆڵەت پێدانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسییانەوە لە ژیانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، لەم کارەدا هەندێك لە هاوەڵان داوای مۆڵەتیان لێکرد، ئەویش مۆڵەتی پێدان: لەوانە:

أ/ عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس (٦٣ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێك بوو لەو هاوەڵانەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) کە هەموو کات لەگەڵی بوو، هەروەها نووسەری سروشی قورئان بوو، داوای لە پێغەمبەر کرد کە فەرموودەکانی بنووسێتەوە و ئەویش ڕێگەی پێدا، هەموو ئەوەی لە پێغەمبەرەوە گوێبیستی دەبوو ڕاستەوخۆ دەینووسییەوە[1].

لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: "هەر شتێکم لە پێغەمبەرەوە دەبیست دەمنووسییەوە و دەمویست لەبەریبکەم، قورەیشییەکانیش لەسەر ئەمە قسەیان پێدەوتم، وتیان: تۆ هەموو شتێك دەنووسیت کە لە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) گوێبیستی دەبیت، پێغەمبەریش (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) مرۆڤە لە کاتی تووڕەیی و لە کاتی ئاسایی قسە دەکات، وازبێنە لە نووسینەوەی".

ئەمەی بۆ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (بینووسە، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، هیچ شتێك لە منەوە ناوترێت تەنها ڕاستی نەبێت)[2]. واتە هیچ نافەرموێت تەنها حەق نەبێت.

---

١- سەبارەت بەو دەنگۆیەی کە پێغەمبەر (درووودی خوای لێبێت) ڕێگری کردووە لە نووسینەوەی فەرموودە، لای زۆربەی زانایانی کۆن سەلمێنراو نییە، ئەوەشی کە سەلماندوویەتی دانیناوە بەوەی کە ڕێگریکردنەکە لە سەرەتای ئیسلام بوو، دواتر نەسخ کرایەوە، پێغەمبەر (درووودی خوای لێبێت) ڕێگەی بە هەر کەسێك داوە کە ویستبێتی فەرموودە بنووسێتەوە.

٢- بڕوانە هەواڵەکانی لە: الإصابة (٢/٣٥١)، والإستيعاب بحاشية الإصابة (٢/٣٤٧).

ئەبو هورەیرە دانیناوە بەوەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر فەرموودەی لەو زیاترە، لەبەرئەوەی ئەو دەینووسییەوە، دەڵێت: "هیچ یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لێبێ) لە من زیاتر فەرموودەی لانەبوو، تەنها ئەوەی لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس، چونکە ئەو دەینووسی و منیش نەمدەنووسی"[1]. هەروەك ئەبو هورەیرە دانیناوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر: (داوای لە پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لێبێ) کرد کە ڕێگەی پێبدات فەرموودەکانی بنووسێتەوە، ئەویش ڕێگەی پێدا)[2].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەری (درود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسییەوە. مێژوونووس زەهەبی دەڵێت: "زانستێکی زۆری لە پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسییەوە، ئەبو هورەیرەش دانیناوە بەمەدا"[3].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر پەرتووکەکەی ناو نا: (الصادقة)[4].

لەبارەی فەرموودەکانەوە قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، ژمارەی ئەو قوتابی و هاوەڵانەی گوێیان بۆ دەگرت زیاتر لە سەد زانا و شێخ دەبوو[5]. سەحیفەکەی (الصادقة) لای خانەوادەکەی مایەوە، تاکو لای نەوەکەی عەمری کوڕی شەعبی کوڕی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (١١٦ك کۆچی دوایی کردوە) کە

---

١- رواه أبو داود: حديث رقم (٣٦٤٦)، وابن أبي شيبة في المصنف (٥/٣١٣)، وأحمد (٢/١٦٢، ١٩٢، ٢٠٧، ٢١٥)، والدارمي: حديث رقم (٤٩٠)، وصححه ابن خزيمة برقم (٢٢٨٠).

٢- رواه البخاري في صحيحه: حديث رقم (١١٣)، والترمذي برقم (٢٦٦٨)، وأحمد (٢/٢٤٨).

٣- رواه أحمد في المسند (٢/٤٠٢).

٤- تذكرة الحفاظ (١/٤٢)، سير أعلام النبلاء (٣/٨٠).

٥- السير (٣/٨١)، وتهذيب الكمال (١٥/٣٥٩).

لەم سەحیفەیەدا فەرموودەی بۆ خەڵك دەگێڕایەوە[1]. عەبدوڵلاّی کوڕی عەمر ئەم سەحیفەیەی لەناو سندوقێکدا پاراستبوو، ئەگەر ویستبای فەرموودە بۆ خەڵکی باس بکات، ئەوا داوای دەکرد کە سندوقەکەی بۆ بێنن و سەحیفەکەی دەردەهێنا و بۆ خەڵکەکەی دەخوێندەوە[2] .ئیبن ئەسیر باس دەکات کە ئەم سەحیفەیە نزیکەی هەزار فەرموودەی لەخۆگرتبوو[3]. دواتر چووە لای نەوەکەی، عەمری کوڕی شوعەیب. ئیبن تەیمییە دەڵێت: "خانەوادەی عەبدوڵلاّی کوڕی عەمری کوڕی عاس سەحیفەیەکیان هەبوو، ئەگەر ئەمە لەسەردەمی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) دا نووسرابێتەوە، ئەمە زیاتر تەئکیدی دەکردەوە و بەڵگەش بوو لەسەر ڕاستێتی، بۆیە ئەو دانەیەی لای عەمری کوڕی شوعەیب بوو ئەندازەیەکی زۆر لە فەرموودەی تێدابوو، کە بەشی هەموو شەرعناسان دەکات"[4].

ئەنەسی کوڕی مالیکی ئەنساری –خزمەتکاری پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) – کۆتا هاوەڵ بوو کە لە بەسرە ساڵی (٩٣ك) کۆچی دوایی کرد، نزیکەی دە ساڵ لە مەدینە خزمەتی پێغەمبەری کرد، ژمارەی ئەو قوتابی و هاوەلأنەی کە فەرموودەیان لێوەرگرتووە، دەگەیشتە (٢٠٠) زانا و شێخ لە هەموو شوێن و ناوچە ئیسلامییەکان[5]. ئەنەس سەحیفەیەکی هەبوو فەرموودەکانی پێغەمبەری تێدا نووسیبوونەوە، لەوەوە فەرموودەی بۆ خەڵکی

---

١– بڕوانە: تحقیق أحمد شاکر بحاشیة سنن الترمذي (٢/١٤١–١٤٤)، مەبەستیش لە سەحیفە: ئەو نوسراوەیە کە عەبدوڵڵا نووسیبویەوە لەوەی کە لە پێغەمبەری (درووودی خوای لێبێت) بیستبوو، هەروەها بڕوانە: لسان العرب مادة (الصحف).

٢– مسند أحمد (٢/١٧٦)، والدارمي في السنن برقم (٤٩٢)، ومستدرك الحاكم (٣/ ٤٣٣)، و (٤/٥٠٨)، وتقیید العلم للبغدادی (ص: ٨٤–٨٥).

٣– أسد الغابة (٣/ ٢٣٣)، طبعة ١٢٨٦هـ– القاهرة.

٤– فتاوى ابن تیمیة (١٨/ ٨–٩)، تأریخ التراث العربي (١/١٥٣).

٥– بڕوانە هەواڵەکانی لە: الإصابة (١/٧١)، وسیر أعلام النبلاء (٣/٣٩٥).

دەگێڕایــەوە[1]، هــانی ڕۆڵــە و نەوەکانیشــی دەدا کــە زانســت و فــەرموودە بنووسـنەوە[2]. بـەڵکو بـەردەوامبوو لـە نووسـینەوەی فـەرموودە، هـەتاکو دوای کۆچی دوایی پێغەمبەریش (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، گوێی لـە هەنـدێك لـە هاوەڵان دەبوو کە فەرموودەکانی پێغەمبەریان دەگێڕایەوە، ئەویش بە کوڕەکەی خۆی دەوت کە ئەو فەرموودەیەی بۆ بنووسـێتەوە، دەیـوت: (ئـەم فەرموودەیـە سەرسامی کردم، بە کوڕەکەم دەوت بینووسەوە، ئەویش دەینووسییەوە)[3].

نووسینەکانی لای نەوەکەی، قازی سەمامە، مانەوە، دواتر کەوتە لای ئەیوبی سەختیانی و لێی سوودمەندبوو[4].

ج. سەعدی کوڕی عوبادەی ئەنساری کە ساڵی (١٥ك) لە شـام کۆچـی دوایـی کرد، یەکێك بوو لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لـێبێ)[5]، سەحیفەیەکی لابوو هەندێك فەرموودەی تێدا نووسیبوونەوە، لەدوای مردنـی لای خانەوادە و نەوەکانی وەك میرات مایـەوە، بـۆ خـەڵکیان دەوتـەوە[6]. سـەعد لـە پێش ئیسلامدا شارەزای نووسین بوو[7].

د. سەمرەی کوڕی جوندوب کە ساڵی (٥٨ك) کۆچی دوایـی کـردووە، یـەکێك بـوو لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ)[8]، وەسـیەتی بـۆ

١- بڕوانە هەواڵی ئەم سەحیفەیە لە: تقييد العلم (ص: ٩٤).

٢- رواه الدارمي برقم (٤٩٧)، وابن سعد في الطبقات (١٦/٧).

٣- رواه مسلم في صحيحه: حديث رقم (٣٣)، والخطيب البغدادي في تقييد العلم (ص: ٩٤).

٤- بڕوانە: علل الدارقطني (٢٣٠/١).

٥- الإصابة (٣٠/٢)، وتهذيب الكمال (١٠/ ٢٧٧)، وسير الأعلام (٢٧٠/١).

٦- سـنن الترمـذي: حـديث رقـم (١٣٤٣)، ومسـند أحمـد (٢٨٥/٢)، والـدارقطني في السـنن (٢١٤/٤)، ومعجم الطبراني (١٧/٦).

٧- ابن سعد في الطبقات (٢٧٣/٧)، وتهذيب التهذيب (٤٥٧/٣).

٨- ابن سعد في الطبقات (٣٥/٧)، وسير الأعلام (١٨٣/٣).

منداڵەکانی نووسی، تێیدا زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری گێڕابووەوە، ئەم سەحیفەیەش لە بەسرە بەناوبانگ بوو، حەسەنی بەسری (١١٠ك کۆچی دوایی کردووە) لەم سەحیفەیەوە فەرموودەی بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە[١]. محەمەدی کوڕی سیرین (١١٠ك کۆچی دوایی کردووە)، لەبارەی ئەم سەحیفەیە دەڵێت: "زانستێکی زۆر هەبوو لەو پەیامەی کە سەمرە بۆ منداڵەکانی نووسیبوو"[٢].

ئەم سەحیفەیە لای نەوەکانی مایەوە، بۆ خەڵکیان دەگێڕایەوە، تاکو کەوتە لای مەڕوانی کوڕی جەعفەری کوڕی سەعدی کوڕی سەمرە .ئیبن سەعد دەڵێت: "وەسیەتەکەی سەمرە کە بۆ منداڵەکانی نووسیبووی لای ئەو بووە"[٣]، بوخاریش باسی سەرەتای ئەم سەحیفەیەی کردووە[٤].

بەمجۆرە سەلمێنرا کە هەندێك لە هاوەڵان لە سەردەمی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) بەشێکی گەورە لە فەرموودە و سوننەتی پێغەمبەریان (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسییەوە، ئەویش دوایی ئەوەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) مۆڵەتی پێدان کە بینووسنەوە، ئەم فەرموودانە –لەگەڵ ئەوەی کە لە دڵ و مێشکی ئەوان پارێزراوبوون– لە سەحیفەیەك، یاخود پێست نووسرابوونەوە، هەروەك دۆخی ئەو پەیامانەی کە پێغەمبەر فەرمانی کرد بنووسرێنەوە، ئەم فەرموودانە لەم قۆناغەدا لە پەرتووکێکدا نەنووسرابوونەوە و ڕیزبەند نەکرابوون. بەڵکو دۆخەکەی لەم قۆناغەدا وەك قورئانی پیرۆز بوو لە سەردەمی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) کە لە پەرتووکێکدا

---

١– ابن سعد في الطبقات (١١٥/٧)، وغريب الحديث، ابن سلام (٦١/١)، والمعرفة والتأريخ (٤٥/٢)، وسنن البيهقي (٩/ ٣٥٦ و ٣٥٧)، وتهذيب التهذيب (٢٣٦/٢).

٢– تهذيب التهذيب (٢٣٦/٤).

٣– الطبقات (٣٧٨/٦).

٤– التأريخ الكبير (٢٦/١)، تأريخ التراث العربي (٥٤/١٢).

نەنوسرابووەوە، هەروەها لە شوێنێکیشدا کۆنەکرابووەوە، بەڵکو لەسەر چەند پارچە پێستێکی جودا نوسرابوون، چونکە ڕاستەخۆ پشتدەبەسترا بە لەبەرکردن لە زاری پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، کە خۆی قورئانی پێ لەبەردەکردن[1]، هەروەك هەموو ڕۆژێك سێ نوێژی بۆ دەکردن، کە تێیدا قورئانی بەدەنگ بۆ دەخوێندن، ئەوانیش لەبەر زۆر دووبارەکردنەوەی لەبەریاندەکرد، بەشێوەیەك پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لە هەر مانگێکدا (٩٠) نەوەد جار قورئانی بە دەنگ دەخوێند، هەروەها (١٠٠٠) هەزار جاریش لە ساڵێکدا، ئەمە وای کرد کە هاوەڵان زۆر بە ئاسانی قورئانی پیرۆز لەبەر بکەن.

فەرموودەش لەم قۆناغەدا بەمشێوەیە بوو، ڕاستەوخۆ پشتدەبەسترا بە لەبەرکردنی لە هەر وتەیەك کە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) دەیفەرموو، یاخود یاسایەك کە دەری دەکرد، یاخود دادوەرییەك کە لەنێوان خەڵکی دەیکرد، ئەمەش مانای وانییە کە هاوەڵان هیچیان نەنووسیبێتەوە، بەڵکو ئەو بەڵگە مێژووییانەی کە بە ڕێژنەیی (تواتر) هاتوون، جەخت لەسەر نووسینەوەی فەرموودە دەکەنەوە[2].

---

١- الأنوار الكاشفة (٧٦/٧٧).

٢- السنة قبل التدوين للخطيب (٣٠٩). ودراسات في الحديث النبوي، د. محمد مصطفي الأعظمي (٩٢/١ -١٤٢). تێیدا باسی پەنجا هاوەڵی کردووە کە فەرموودەیان نووسیوەتەوە. لەگەڵ ئەوەی زانراوە کە ئەمانە فەرموودەیان نووسیوەتەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەوانی تر نەیان نووسیبێتەوە، بەڵکو ئەمە لە بازنەی ئەگەرەوە دەمێنێتەوە، نەزانینی ئێمە بەڵگە نییە لەسەر نەبوونی.

**ماوەی دووەم: بریتییە لەو ماوەیەی کە دوای وەفاتی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) دەستی پێکرد:**

هەندێك لە هاوەڵان هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەریان نووسییەوە، ئەویش ئەو فەرموودانەی کە لەبەریانکردبوو، یاخود لە هاوەڵێکی تر گوێبیستی بووبوون، وەك نامەکانی چوار خەلیفەکە بۆ والی و دادوەرەکان، بۆ نموونە:

أ/ نامەی ئەبوبەکری سدیق لەبارەی فەرزی زەکات، چۆنیەتی وەرگرتن و دابەشکردن و ئەندازەکەی، ئەمەش ئەو پەیامە بوو کە بۆ ئەنەسی کوڕی مالیکی نووسی، کاتێك بۆ بەحرەینی نارد بۆ کۆکردنەوە زەکات. ئەبوبەکر دانەیەکی لەو سەحیفەیە لەبەرگرتبووەوە کە لای بوو لە پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسیبوویەوە[1].

ب/ نامەی عومەری کوڕی خەتتاب کە بۆ عوتبەی کوڕی فەرقەدی نارد، کە ئەمیری سوپا بوو لە ئازەربایجان، هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەری لەخۆگرتبوو[2]. هەروەها پەیامی پێشەوا عومەر بۆ ئەمیری شام، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، کە تێیدا چەندین فەرموودەی پێغەمبەر باسکرابوو[3]. پەیامەکانی بۆ دادوەرەکەی لە عێراق ئەبو موسای ئەشعەری، کە دواتر لای نەوەکەی ئەبو موسای ئەشعەری مایەوە[4].

---

١- بڕوانە لاپەڕە (٤٩-٥٠)ی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

٢- رواه البخاري: ح رقم (٥٨٢٨)، فتح الباري (٢٤٨/١٠ -٢٨٦)، ومسلم (١٦٤٢/٣) ح (٢٠٦٩)، وأحمد (٣٦/١).

٣- أحمد (٢٨/١ و ٤٦)، وابن ماجة: حديث (٢٨٣٨).

٤- بڕوانە: إعلام الموقعين (٨٥/١-٨٦).

ج/ نامەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بۆ عوسمانی کوڕی عەفان، کە تێیدا لەبارەی ئەندازەی زەکات سوننەتی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسیبوو[1].

د/ نامەی عائیشە بۆ خەلیفە معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، کە چەندین فەرموودەی پێغەمبەری (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) تێدابوو[2].

ھ/ نامەی خەلیفە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بۆ دادوەرەکەی، عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعود[3]. ئەمە جگە لەو نامە و نووسینانەی کە لەنێوان هاوەڵان ئاڵوگۆڕ دەکرا[4] یاخود لەنێوان هاوەڵان و قوتابییەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکرا[5]. هەروەها ئەو فەرموودانەی کە هەندێك لە هاوەڵان لە هەندێکی تر گوێبیستی دەبوون، دەیانووسیەوە بۆ ئەوەی لەبەری بکەن، هەروەك ئەنەسی کوڕی مالیك ئەم کارەی کرد[6].

دیسانەوە هەروەك عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، کوڕەمامی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، کە ساڵی (٦٨ك) کۆچی دوایی کرد، ئەم کارەی کرد، یەکێك بوو لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لە تەفسیر و فیقھ و فەرموودە، لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی

---

١- أحمد (١٤١/١).

٢- مسند الحميدي (١٢٩/١).

٣- أحمد (٤/٤).

٤- بڕوانە: الإحكام (١٤٨/٢).

٥- البخاري مع الفتح (٣٣/٦) ح: رقم (٢٨١٨)، ومسلم (١٣٦٢/٢) ح: رقم (١٧٤٢) لە بارەی نووسینەوەی هەندێك فەرموودە لەلایەن عەبدوڵڵای کوڕی ئەوفاوە بۆ عومەری کوڕی عوبەیدوڵڵا. ومسلم (١٣/١) ح (٧): لە بارەی داواکەی ئیبن ئەبی مەلیکە لە ئیبن عەبباسی مامۆستای کە کتێبێکی بۆ بنووسێت فەرموودەی تێدا بێت.

٦- صحيح مسلم: حديث رقم (٣٣) كتاب الإيمان.

خودای لێبێ) دەستی کرد بە نووسینەوەی فـەرمووده، دەچـووە لای هـاوەڵان و پرسیاری لێـدەکردن، ئـەو فەرموودانـەی کـە لـە پێغەمبـەرەوە (دروود و سـڵاوی خودای لێبێ) گوێبیستی دەبوو، لە هاوەڵانەوە دەینووسینەوە[1].

ناوبراو بەوەندە وازینەدەهێنا کە لە بابەتێك گوێبیسـتی گێڕانەوەیـەك بووبـا، بەڵکو هەندێك جار پرسیاری لە سی هاوەڵ دەكرد لە یەك بابەت بۆ ئـەوەی لێـی دڵنیابێتەوە[2]. دوای ئـەوەی کـە بـووە مامۆسـتا وانـەی دەوتـەوە، فـەرمانی بـە قوتابیەکانی دەکرد ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) کە ئەو دەیڵێتەوە بینووسنەوە. سەبارەت بەوەی کە نووسـینەوەی زانسـتی پـێ باش نەبووە، ئەوا مەبەستی ئـەو بۆچـوون و کۆششـە فیقهییـەکانێتی، هـەروەك زۆرێـك لـە زانایـانی کـۆن ئـەوەیان پـێ بـاش نـەبووە کـە یـەکێك لـە بۆچـوونە کۆششکارییەکانی بنووسرێتەوە. هەروەها عەمری کوڕی دیناریش، قوتابی ئـیبن عەبباس بووە، ئەوەی پێ باش نەبووە، دەیوت: (پرسیاری بۆچوونی خۆمانمـان لێدەکەن ئێمەش پێمان دەوتن و دواتر ئەوان دەیاننووسییەوە، هەروەك نەخشی سەر بەرد، چونکە لەوانەیە بەیانی لێی پاشگەزببینەوە!)[3].

هیچ ناکۆکییەکیش نییە لەنێوان پێ باش نـەبوونی نووسـینەوەی زانسـت لـە ئیبن عەبباسەوە و هاندانی قوتابیەکانی لەسەر نووسینەوەی فـەرمووده لێـوەی، پێی باش نەبووە بۆچـوونەکانی بنووسـرێتەوە، هاندانەکەشـی تایبـەت بـووە بـە

---

١- رواه الحاكم (٣/ ٥٣٨) وصححه، وتقييد العلم للخطيب البغدادى (٩٢)، وسير الأعلام (٣/٣٤٣).

٢- سير الأعلام (٣/٣٤٤)، وإعلام الموقعين (١/١٩).

٣- طبقات ابن سعد (٦/٢٩)، و إعلام المـوقعين (١/٢٨): دەربـارەی ئـەوەی کـە ئەحمـەد پێـی بـاش نەبووە قسەكانی بنووسرێتەوە.

گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، پێویست بە تەئویل ناکات و ناکۆکی نییە لەنێوان ئەم دوو قسەیەدا[1].

ئیبن عەبباس وانەکانی خۆی لە مزگەوتی حەڕام لە مەککە پێشکەش دەکرد، بۆ هەموو زانستێکیش لە زانستەکان کاتێکی دیاریکراوی تەرخانکردبوو، وەك تەفسیر و فەرموودە و فیقه و ژیاننامەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و جەنگەکانی، ئادابەکانی عەرەب و نەریتیان لە سەردەمی نەفامی[2].

زانایانی شوێنکەوتووان و قوتابیانی هاوەڵانی تر دەچوون بۆ مەککە، لەپێناو گوێگرتن و نووسینەوەی فەرموودە لەلای، تاکو ژمارەی قوتابیانی گەیشتە دوو سەد کەس[3]، پاش ئەمە بوونە زانای گەورە لە تەفسیر و فەرموودە و فیقه، وەك عیکریمە، سەعیدی کوڕی جوبەیر، قەتادە، تاوس، موجاهید، کورەیب و عەمری کوڕی دینار... تاد، ئەوانەی کە بە هەموو وڵاتانی ئیسلامی بڵاوبوونەوە، لەسەر دەستی ئەوانەش زۆرێك لە شوێنکەوتووانیان فێری زانست بوون. ئیبن عەبباس دوایی مردنی پەرتووکێکی زۆری دوای خۆی بەجێهێشت[4].

لە یەکەم قۆناغ لە قۆناغەکانی نووسینەوەی فەرموودە دەستپێك و بنچینەی پەرتووکی فیقهی لە چەندین بەشی بچووك دەرکەوتن، وەك پەرتووکی عەلی کوڕی ئەبو تالیب لە (دادوەری)دا[5]، زەیدی کوڕی سابت لە (میرات)دا[1]، هەروەها پەرتووکی جابیری کوڕی عەبدوڵڵای لە (واجبەکانی حەج)[2].

---

١- بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (١/١١٧): دکتۆر موحەمەد ئەعزەمی پێی وابووە کە تێکگیران لەنێوان ئەم دوو وتەیە هەیە.

٢- الحلية (١/٣٢٤)، وإعلام الموقعين (١/١٩)، وتذكرة الحفاظ (١/٣٧)، وسير الأعلام (٣/٣٣١)، والإصابة (٢/٣٣٠).

٣- سير الأعلام (٣/٣٣٣)، وتهذيب التهذيب (٥/٢٧٦).

٤- سير الأعلام (١/٤٨٠).

٥- صحيح مسلم (١/١٣-١٤) ح (٧).

هەروەك یەكەم پەرتووك لەبارەی تەفسیری قورئانەوە دەركەوت كە تەفسیری ئیبن عەبباس بوو، كە بە قوتابیەكانی دەنووسییەوە[3]. هەروەها هەندێك لە هاوەڵان وەسیەتیان كردووە، هەندێك دادوەریی كە دادوەرییان پێكردووە و ئەمانەش نووسییانەوە و پاراستیان و دواتر چەند دانەیەكیان لەبەرگرتووە، وەك وەسیەتی كردووە و پارێزراو بوون، تا ئەو كاتەی زانایان لەسەریان نووسییەوە، وەك وەسیەتی عومەری كوڕی خەتتاب، وەسیەتی عەلی كوڕی ئەبو تالیب، وەسیەتی عەمری كوڕی عاس و دادوەریی مەعازی كوڕی جەبەل[4].

## قۆناغی دووەم: كۆكردنەوە و نووسینەوەی:

ئەم قۆناغە ساڵی (٧٠ك بۆ ١٢٠ك) دەستی پێكرد، ئەمەش قۆناغی كۆكردنەوەی سوننەت و فەرموودە پەرت وبڵاوبووەكان كە لەسەر سوحوف و پێست بوو، بەهەمان شێوەش لە دڵ و مێشكی زانایان پارێزراو بوو، پاشان نووسینەوەیان لە پەرتووك.

سەرەتای ئەم قۆناغە تا ڕادەیەكی زۆر بە قۆناغی كۆكردنەوەی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی خەلیفەی یەكەم ئەبوبەكری سدیق دەچوو، بەڵام ئەم قۆناغە سەبارەت بە فەرموودەكانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) كەمێك درەنگتر بوو. یەكەم كەس كە بیری لە كۆكردنەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) كردەوە خەلیفەی دووەم، عومەری كوڕی خەتتاب بوو، (ویستی فەرموودەكانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)

---

١- سنن البيهقي (٦/٢٤٧)، وسير الأعلام (٢/٤٣٦).

٢- تذكرة الحفاظ (١/٤٣).

٣- طبقات ابن سعد (٧/٣١٨).

٤- بڕوانە: مصنف عبد الرزاق (١١/٣٧٣ -٧٧).

بنووسێتەوە، ئەوکات ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد لەم بارەوە، ئەوانیش پێیان باش بوو کە بینووسێتەوە...)[1]، بەڵام ئەم کارەی نەکرد لە ترسی ئەوەی خەڵکی زۆر پێیەوە خەریك بن و قورئان پشتگوێ بخەن و فەرامۆشی بکەن.

ئەم قۆناغە لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵان (٧٠ك) دەستی پێکرد، زانایانی شوێنکەوتووان لە ڕۆڵەی هاوەڵان، جیا لەوانیش، هەڵسان بە کۆکردنەوەی فەرموودەکان و نووسینەوەی لە پەرتووکدا، ئەم بزووتنەوە زانستییە هەموو ئەو هەرێمە ئیسلامییانەی گرتەوە کە هاوەڵانی پێغەمبەری لێبوو، هەروەها لە کۆتایی ئەم قۆناغەدا لە ساڵی (١٠٠ك) زانایان دەستیان کرد بە نووسینەوە و دروستکردنی پەرتووك، زەهەبی باسی ئەم چینەی کردووە کە مەکحول (١١٣ك کۆچی دوایی کردووە) و زوهری (١٢٤ك کۆچی دوایی کردووە) دەستی پێکرد، بە ڕەبیعەی کوڕی عەبدولڕەحمان(١٣٦ك کۆچی دوایی کردووە) کۆتایی هات، ئەمانە قوتابی هاوەڵان بوون، لەبارەیانەوە دەڵێت: "گەورە زانایان دەستیان کرد بە نووسینەوەی فەرموودە و لقەکانی و نووسینەوەی زمانی عەرەبی"[2]، نووسینەوە لە کۆتایی سەدەی یەکەم دەستی پێکرد[3]، نەوەك لە سەدەی دووەم، لەبەرئەوەی زانایانی ئەم قۆناغە لە سەدەی یەکەم، ئەگەر درەنگیش کەوتبێت سەرەتای سەدەی دووەم بوو.

---

١- مصنف عبد الرزاق (٢٥٩/١١).

٢- تذكرة الحفاظ، الذهبي (١٦٠/١).

٣- بڕوانە: السنة قبل التدوين (٣٣٧)، هەروەها (٣٢٦)، وتأريخ التراث العربي (١/ ١١٧-١٢٠).

**ئەو لایەنانەی هەڵسان بە نووسینەوەی فەرموودە و کۆکردنەوەی لەم قۆناغەدا:**

أ/ لایەنی زانستیی: خۆی دەبینییەوە لە زانایانی هەموو ناوچەکانی موسوڵمانان، کە هاوەڵانی تێدابوون، سەدان زانا لە قوتابیانی شوێنکەوتووانی هاوەڵان، هەڵسان بە پاراستن و نووسینەوەی فەرموودەکان، کە زانایانی هاوەڵان پاراستنیان و نووسییانەوە و پاراستنی بۆچوونە فیقهییەکانی هاوەڵانیان بە هەمان شێوە[1].

ب/ لایەنی فەرمیی: ئەمەش خۆی دەبینێتەوە لەو فەرمانانەی کە خەلیفە و کاربەدەستەکان بۆ هەندێ زانایان دەریان کرد، بۆ کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) . زیاتر ئەو بۆچوونە بلأوە کە خەلیفەی ئەمەوی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (١٠١ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکەم کەس بوو کە فەرمانی بە کۆکردنەوەی فەرموودە کرد، وەك فەرمانێکی فەرمیی[2]، بەڵام بەڵگەی مێژوویی هەن کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە باوکی عەبدولعەزیزی کوڕی مەڕوان (٨٥ك کۆچی دوایی کرد)[3]، هەروەها باپیری خەلیفەی شەرعناس مەڕوانی کوڕی حەکەم(٦٥ك کۆچی دوایی کردووە)[4] ئەوان زووتر بەم کارە هەڵساون. عەبدولعەزیزی کوڕی مەڕوان کە ئەمیر بوو لە میسڕ نامەیەکی نارد بۆ کوسەیری کوڕی مورەی حەزرەمی (٨٠ك کۆچی دوایی

---

١- الإحكام (١٢٧/٢-١٢٨)، وإعلام الموقعين (٢٢/١-٢٨)، والسنة قبل التدوين (٣٢٦).

٢- بڕوانە ژیاننامەکەی لە: سير الأعلام (١١٤/٥)، بڕوانە: فتح الباري (٢٠٨/١)، هەروەها لەم بابەتەدا بڕوانە: د.محمد عجاج الخطيب، السنة قبل التدوين (٣٢٦-٣٢٨).

٣- بڕوانە ژیاننامەکەی لە: تهذيب التهذيب (٣٥٦/٦)

٤- بڕوانە ژیاننامەکەی لە: سير الأعلام (٤٧٦/٣)، هەروەها لە بابەتی دەستگرتنی بە قەزاوەتی عومەری کوڕی خەتابەوە بڕوانە: (٤٧٧/٢).

کـردووه)[1] و یـەکێك بـوو لـە گـەورە شـوێنکەوتووانی هـاوەڵان، تێیـدا دەڵێـت: "ئەوەی لە هاوەڵانی پێغەمبـەرەوە (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) گوێبیسـتی بوویـت لـە فـەرموودەکانی پێغەمبـەرەوە بـۆمی بنووسـەوە، تـەنها ئەوانـەی لای ئەبوو هورەیرە نەبێت چونکە لامانە"[2]. پێدەچێت عەبدولعەزیز نامەی تـری بـۆ ئەوانی تریش ناردووە کە دەربـارەی فـەرموودە و سـوننەتی پێغەمبـەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) پرسیاریان لێبکات، ئەوەتا هاوەڵی بەڕێز عەبدوڵڵای کـوڕی عومەری کوڕی خەتتاب – کە مامی خێزانەکەیەتی – هەندێك لە فـەرموودەکانی بۆ نووسینەوە[3].

وتەی ئەمیر عەبدولعەزیز لە نامەکەی بۆ کوسەیری کوڕی مورڕە: (تـەنها ئـەو فەرموودانـە نـەبێت کـە لای ئـەبو هـورەیرەن، چـونکە ئەوانـە لای ئێمـە هـەن) ئەوانـەی کـە سەرچـاوە مێـژوویی و فەرموودەییـەکان باسـیان کـردووە، جـەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە باوکی خەلیفە مەڕوانی کوڕی حەکـەم فـەرموودەکانی ئـــەبو هـــورەیرە لـــە پێغەمبـــەرەوەی نووســـیوەتەوە، پاشـــان پـــاش ســـاڵێك لەبەرکردنەکـەی ئـەبو هـورەیرەی تـاقیکردەوە، بـینی گێڕانـەوەکانی ڕاسـت و هاوشێوەن[4]. ئەو کات عەبدولعەزیز لە ئەبو هورەیرەی بیستبوو.

بەمشێوەیە سەلمێنرا کە فەرموودەکانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لێبێ) کە لای ئەبوهورەیرە بوون هەموویان لە گەنجینەی مەڕوانی کوڕی حەکەم نووسرابوونەوە. هەروەك دووبارە لەلایـەن ئـەبو هـورەیرەوە پێداچـوونەوەی بـۆ کرا، بۆ دڵنیابوون لە دروستیی، یاخود ڕوودانی هەڵە تێیدا، ئـەم فەرموودانـە لـە

---

١– بڕوانە ژیاننامەکەی لە: تهذيب التهذيب (٨/٤٢٩).

٢– طبقات ابن سعد (٧/٣١١)، وتهذيب التهذيب (٦/٣٥٦).

٣– أحمد (٢/١٥٢).

٤– المستدرك (٣/٥٠٩ و ٥١٠)، وصححه الحاكم، وسير الأعلام (٢/٥٨٩).

دیوانی (گەنجینـەی دەوڵـەت) هـەر مانـەوە، لەبـەر ئەمـە عەبدولعـەزیز داوای لـە کوسەیری کوڕی موررە نـەکرد کـە ئـەو فەرموودانـەی لای ئـەبو هـورەیرە هـەن بینووسـێتەوە، چـونکە لای ئـەو هـەبوون – لـە گەنجینـەی دەوڵـەت بـوون لـە دیمەشق – هەروەك مەڕوانی کوڕی حەکەم ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لای ئەبو هورەیرە بوون نووسییەوە، هەروەها هەندێك لـەو فەرموودانەشی نووسییەوە کە لای زەیدی کوڕی سابیت بـوون و لەگـەڵ هەنـدێك بۆچوونی فیقهیشی[1].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر چاودێریکردن و گرنگیدان بە نووسینەوەی فـەرموودە و کۆکردنەوەی. کوڕەکەی ئەمیر عەبدولعەزیز، پاشان نەوەکەی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز زۆر پێی کاریگەر بوون، کە هەر لـەو کاتـەی ئـەمیری مەدینـە بوو ساڵی (٨٦ – ٩٣ك) گرنگیی بە کۆکردنەوەی فەرموودە دەدا[2] لە سەردەمی کوڕی مامی خەلیفە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك (٩٣ك کۆچـی دوایـی کـردووە)، هـەروەك هیشـامی کـوڕی عەبدولمـەلیك گرنگـی بـە نووسـینەوە و کۆکردنـەوەی فەرموودە دەدا[3].

ئـەم خەلیفـە و ئەمیرانـە ئـەم فەرموودانـەیان لـە گەنجینـەکانی دەوڵـەت کـۆدەکردەوە[4] بـۆ پارێزگـاریلێکردن و گەڕانـەوە بۆیـان لـەکاتی پێویسـتیدا. هەروەك ئەوان چەندین پەرتووکی تریان کۆکردەوە[5].

---

١– دراسات في الحديث النبوي (٧٨/١).

٢– علل أحمد (١٥٠/١)، وسير الأعلام (١١٧/٥).

٣– المعرفة والتأريخ (٦٤٠/١)، وتهذيب التهذيب (٤٤٩/٩) دەربارەی چیرۆکەکەی لەگەڵ زوهریدا.

٤– بۆ بابەتی ئەم خەزێنانە بڕوانـە: طبقـات ابـن سـعد (٣٥٣/٥)، وتـأريخ الإسـلام للـذهبي (وفيـات: ١٢١–١٤٠) (ص:٢٣٥)

٥– تهذيب التهذيب (١٩٨/٧).

زانایان و دادوەران پێویستی زۆریان بە کۆکردنەوە نەبوو لەو گەنجینانە، لەبەرئەوەی ئەم زانایانە خۆیان هاوڕێ و هەموو کات لەگەڵ هاوەڵان بوون، ڕاستەوخۆ لەوانەوە فەرموودەکانیان دەنووسییەوە، بەبێ پێویستیان بەوەی خەلیفەکان لە گەنجینەکانی دەوڵەت کۆیانکردبووەوە و نووسیبوویانەوە، بەلاّم ئەوەندە هەیە کە هەندێك زانایان سوودیان لەم گەنجینەیە وەرگرتووە، هەروەك وەلیدی کوڕی موحەمەدی موقری (١٨٢ك کۆچی دوایی کردووە) ئەم کارەی کرد کە خەڵکی شام بوو[1]، لەبەرئەوەی خزمەتکاری خەلیفە یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك بوو (١٠٥ك کۆچی دوایی کردووە)[2]، توانی پەرتووکەکانی زوهری لەبەربگرێتەوە، ئەوانەی لە گەنجینەی یەزید بوون.

هەموو ئەوەی پێشووتر باسکرا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز یەکەم کەس نەبوو بەفەرمیی داوای کۆکردنەوە و نووسینەوەی فەرموودەکانی کردبێت، هەروەك ئەم بۆچوونە بەربلاّوە، بەڵکو پێش ئەو باپیری و باوکی بەم ئەرکە هەڵساون، تەنها ئەوە نەبێت دەتوانرێت بوترێت کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز یەکەم کەس بوو کە فەرمانی کرد بە نووسینەوەی فەرموودە، واتە نووسینەوەی لە پەڕاوێك، زوهری دەڵێت: "عومەری کوڕی عەبدولعەزیز فەرمانی پێکردین فەرموودەکان کۆبکەینەوە، ئێمەش پەڕاو پەڕاو نووسیمانەوە، دواتر ئەم پەڕاوەی بۆ هەموو شوێنێك نارد کە دەسەلاّتی تێدا هەبێت"[3]، واتە: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بە هەمان ئەو کارە هەڵسا کە خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان (٣٥ك کۆچی دوایی کرد) ئەم کارەی کرد سەبارەت بە قورئان، کاتێك لە یەك پەرتووکدا کۆیکردەوە. عومەری

---

١- الجرح والتعديل (١٥/٨).

٢- سير الأعلام (١٢٥/٥).

٣- جامع بيان العلم وفضله (ص: ١٢٧).

کـوڕی عەبدولعـەزیز فـەرمانی کـرد فـەرموودەکان لـە پـەڕاوەکان و دووتـوێی پەرتووکێکدا بنووسرێنەوە[1]، ئەمـەش دوای ئـەوەی لـە پـەڕاو و پارچـە پێسـتی جیاواز نووسرابوون.

هەروەك موسوڵمانان پێویستیان بەو قورئانە نەبوو کە لە کۆمەڵە سـوحوف و پێسـتێك لـەلای خەلیفـەی یەکـەم ئەبوبـەکری سـدیق نووسـرابوونەوە، لـەلای خەلیفەی دووەمیش عومەری کوڕی خـەتتاب بـە هـەمان شـێوە بـوو، بەدرێـژایی هەردووك حوکمڕانییەکان، هـەتاکو خەلیفـەی سـێیەم عوسمـانی کـوڕی عـەفان، فەرمانی کرد بە نووسینەوەی لە پـەرتووکێك و لەبەرکردنـەوەی چـەند دانەیـەك، دواتر بۆ هەرێمەکانی نارد، لەبەرئەوەی زانایان و ئەوانەی قورئانیان لەبەربوو بـە زارەکـی بـە قوتابیـەکانیان دەوتـەوە، هـەروەك بەمشـێوەیە ئـەوانیش لـە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) بە زارەکـی لەبـەریان کردبـوو بـەبێ پێویستبوون بەشێوەی پەرتووك کە عوسمان نووسییەوە – لەپێناو ڕێگریکـردن لە ناکۆکی و جیاوازی لەنێوان قورئانخوێنان، نەوەك لەپێناو گەیاندنی قورئان بە خەڵکی – بەڵکو زانایان و ئەوانەی قورئانیـان لەبـەربوو بـەردەوام خوێندنـەوە و مەصحەفەکانی خۆیان ڕاستدەکردەوە، لەگەڵ ئەو زانا گەورانـەی کـە قورئانیـان لەبەربوو، هەروەك ئەم کارەیان لەگەڵ ئەعمـەش[2] و سـولەیمانی کـوڕی میهـران (١٤٨ك کۆچی دوایی کردووە) دەکرد، ئەم شێوازەش تا ئـەم ڕۆژگـارەی ئێمـەی تێدا دەژین هەر بەردەوامە.

هەروەك دۆخـی فـەرموودەش بەمشـێوەیە بـوو، چـەند کۆمەڵەیـەك بـوون لـە گەنجینەی زانایان پـێش عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز، بەدرێـژایی ئـەم ماوەیـە موسوڵمانان پێویستیان پێی نـەبوو، هـەروەك پێویسـتیان بـە قورئـانی نووسـراو

---

١– مقدمة الجرح والتعديل (٢١/١)، والسنة قبل التدوين (ص: ٣٢٨)، وتأريخ التراث العربي (١٢٧/١).

٢– طبقات ابن سعد (٣٣١/٦)، بەم لەفزە هاتووە: (وكانوا يصححون المصاحف على الأعمش).

نەبوو بەدرێژایی هەردوو سەردەمی ئەبوبەکر و عومەر[1]، ئەو کاتەش عومەری کوڕی عەبدولعەزیز فەرمانی کرد کە بنووسرێتەوە نەوەك تەنها لەبەر گەیاندنی بە زانایان، بەڵکو لەپێناو پاراستنی، هەروەها پابەندبوونی خەڵکی بە کارکردن بە سوننەتەوە، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەم ئەرکە زانستییەی بە دوو زانای گەورە سپارد:

**ئەو زانایانەی بەشدار بوون لەم قۆناغەدا:**

**أ- ئەبوبەکری کوڕی موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم:** ئەمیر و دادوەری مەدینە (١٢٠ك کۆچی دوایی کردووە)، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز داوای لێکرد کە ئەو سوننەت و فەرموودانەی کە لای خەڵکی مەدینەن کۆیانبکاتەوە و بیاننووسێتەوە[2].

ئیمام مالیك لەبارەیەوە دەڵێت: "لە خەڵکی مەدینە هیچ کەس ئەوەندەی ئەبوبەکر زانستی دادوەری لانەبوو"[3].

ئەبوبەکری کوڕی موحەمەد ئەوەی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز داوای لێکرد نووسی، بەڵام ئەوەی کە نووسیبوویەوە پاش مردنی ونبوو[4].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتەکان زانراوبوون، پێویستیان بە هیچ نەبوو تەنها کۆکردنەوە نەبێت، هەروەك قورئان کۆکرایەوە.

---

١- بڕوانە: الأنوار الكاشفة (ص: ٤٤-٤٥).

٢- موطأ مالك - رواية محمد بن حسن الشيباني (ص:٣٣٠) - تحقيق: عبد الوهاب عبد اللطيف، ط١، المكتبة العلمية- القاهرة، والدارمي: حديث رقم (٤٩٣)، و (٤٩٤)، ومقدمة الجرح والتعديل (٢١/١)، والمعرفة والتأريخ (٦٤٥/١)، وتقييد العلم (١٠٥)، و (١٠٦).

٣- المعرفة والتأريخ (٦٤٣/١).

٤- الجرح والتعديل (٣٣٧/٩)، وتهذيب الكمال (١٤٠/٣٣).

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پێش ئەوەی ببێتە خەلیفە، کاتێك ئەمیری مەدینە بوو[1] ساڵی (٨٦ – ٩٣ك) داوای لە ناوبراو کرد کە بەم کارە هەڵسێت، پاشان جارێکی تر فەرمانی کرد پاش ئەوەی بووە خەلیفە.

**ب– موحەمەدی کوڕی شیهابی زوهری قوڕەیشی مەدەنی:** (٥٠– ١٢٣ك) زاناترین کەسی مەدینە بە سوننەتی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و زۆرترین فەرموودەشی کۆکردبووەوە.

ساڵحی کوڕی کیسانی هاوڕێی دەڵێت: "من و زوهری کۆبوینەوە و داوای زانستمان دەکرد و وتمان: فەرمووده دەنووسینەوە، ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) هاتووە نووسیمانەوە، دواتر دەڵێت: ئەوەی لە هاوەڵانەوە هاتووە نووسیمانەوە، چونکە ئەمەش فەرموودەیە، منیش وتم: ئەمە سوننەت نییە لەبەرئەوە نانووسم، ئەویش نووسییەوە، بەڵام من نەمنووسییەوە، ئەو پاراستنی و منیش زایەم کردن)[2].

زوهری تەنها بە کۆکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و نووسینەوەی نەوەستاوە، بەڵکو بۆچوون و تێڕوانینە فیقهییەکانی هاوەڵانیشی نووسینەوە.

سەرەتا بۆ دەستکەوتنی زانست لەلای شێخەکان دەگەڕا، ئەوەی لەوانەوە گوێبیستی دەبوو لە تابلۆ و سوحوف دەینووسییەوە[3].

ئەبو زیناد (١٣٠ك کۆچی دوایی کردووە) دەڵێت: "من و ئیبن شیهاب دەچووینە لای زانا و شێخەکان، ئیبن شیهاب تابلۆ و سوحوفەکانی پێبوو"[1].

---

١– علل أحمد (١/١٥٠).

٢– عبد الرزاق في المصنف (١١/٢٥٨)، وابن سعد في الطبقات (٥/٣٥٢)، والمعرفة والتأريخ (١/٦٣٧)، وتقييد العلم (١٠٦)، وجامع بيان العلم (١٣٧).

٣– ابن سعد في الطبقات (٥/٣٥٢)، والمعرفة التأريخ (١/٦٩٣).

کاتێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بووە خەلیفە داوای لێکرد کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) بۆ بنووسێتەوە، ئیبن حەجەر دەڵێت: "یەکەم کەس کە فەرموودەکانی نووسییەوە ئیبن شیهابی زوهری بوو لە ساڵی (١٠٠ك)، بە فەرمانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، دواتر نووسینەوە و لە دوای ئەویش بەش بەشکردن لە پەرتووکێك زۆربوو"[٢]. مەبەستی ئیبن حەجەر ئەوەیە کە زوهری یەکەم کەس بوو لە دیوان و پەڕاو نووسییەوە، نەوەك یەکەم کەس بێت فەرموودەکانی لە سوحوفێکدا نووسیبێتەوە، لەبەرئەوەی نووسین کۆنتر بوو لە نووسین لە پەڕاو و خستنە ناو پەرتووکێك.

موعەمەری کوڕی ) ڕاشید دەڵێت: "پێمان وا بوو کە زۆرمان لە زوهریەوە گێڕاوەتەوە، تا ئەو کاتەی کە وەلیدی کوڕی یەزید – خەلیفەی ئەمەوی – کوژرا، بینیمان ئەو پەڕاوانەی کە لە گەنجینەکەیدا بوون خرانە سەر پشتی بارهەڵگرەکان: واتە: لە زانستی زوهری"[٣].

زەهەبی دەڵێت: "واتە ئەو پەرتووکانەی کە لەوەوە بۆ خانەوادەی مەڕوان نووسرابوونەوە"[٤]، ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە زوهری پاش ئەوەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە ساڵی (٩٩– ١٠١ك) فەرمانی پێکرد لە پەرتووکدا نووسییەوە.

---

١– علل أحمد (١٧١/١).

٢– فتح الباري (٢٠٨/١): حديث رقم ١١٣).

٣– طبقات ابن سعد (٣٥٣/٥).

٤– تهذيب الكمال (٤٣١/٣٦).

ئەو فەرموودانەی کە زوهری کۆیکردبوونەوە دەگەیشتە (٢٠٠٠) فـەرموودە[١]، لە کۆتایی سەردەمی هـاوەڵان دەسـتی بـە نووسـینەوە و کۆکردنـەوە کـرد، کـە بیسـت سـاڵان بـوو، واتـە سـاڵی (٧٠ك). ژمـارەی مامۆسـتاکانی لـە هـاوەڵان و نەوەکانیان زیاتر بوو لە سەد و پەنجا پیاو، هەروەك ژمارەی ئەو قوتابیانەی کـە فەرموودەیان لەو دەگێڕایەوە دەگەیشتە نزیکەی دووسەد پیاو[٢].

زوهری پەرتووکـەکانی بـە قوتابیـەکانی دەدا، بـۆ ئـەوەی لەبـەری بگرنـەوە، پاشان لەسەری بخوێننەوە، یاخود ڕاستەخۆ لەوەوە بیگێڕنەوە[٣].

خەلیفە هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك داوای لێکرد کە فەرموودە بە منداڵەکانی بڵێتەوە، ئەویش (٤٠٠) فەرموودەی پێ وتن و لە پەرتووکێك بۆیانی نووسییەوە، پاشان هیشام ویستی لەبەرکردنی زوهری تاقیبکاتەوە، پێی وت ئەو پەرتووکـەی کە بە منداڵەکانی وتوەتەوە ونبـووە، زوهـریش هـەموو فـەرموودەکانی بـۆ وت و دواتر نووسییەوە، خەلیفەش لەگەڵ پەرتووکی یەکەم بەراوردی کـرد بینـی پیـت بە پیت وەك یەکە[٤].

یەحیای کـوڕی سـەعیدی ئەنسـاری، دادوەری مەدینـە (١٤٤ك کۆچـی دوایـی کردووە)، داوای لـە مـالیکی کـوڕی ئەنـەس کـرد کـە ئـەو فەرموودانـەی کـە لای زوهرین لەبارەی دادوەری بۆی بنوسێتەوە، ئەویش لە سەحیفەیەکی زەردا بـۆی

---

١- تأريخ الإسلام (٢٢٧)، والوافي بالوفيات (٢٥/٥)، لەبەر ئەمە نووسەر ئـەم مێـژووەی هەڵبـژارد بـە سەرەتای قۆناغی دووەم، کە زوهری و ئەبو زیناد و ئیبن کەیسان و جیا لەمانـەش دەسـتیان کـرد بـە کۆکردنەوەی فەرموودە، بڕوانە: تأريخ التراث العربي (١١٩/١).

٢- تهذيب الكمال (٤١٩/٢٦).

٣- طبقات ابن سعد (٣٥٢/٥)، والعلل لأحمد (٢٣٨/٣)، والمعرفة والتأريخ (٨٢٣/٢)، وتأريخ الـتراث العربي (١٣١/١).

٤- المعرفة والتأريخ (٦٤٠/١)، وتهذيب التهذيب (٤٤٩/٩).

نووسییەوە[١]، کە سەد فەمووده دەبوو[٢]. یونسی کوڕی یەزیدیش(١٥٩ك کۆچی دوایی کردووه) هەموو فەرموودەکانی زوهری نووسیوەتەوە[٣].

ژمارەی ئەو قوتابیانەی کە فەرموودەکانی زوهریان دەنووسییەوە و پەرتووکەکانی ئەویان لەبەردەگرتەوە زیاتر لە پەنجا زانا بوون[٤]، دیارترینیان مالیکی کوڕی ئەنەسە، کە فەرموودەکانی زوهری لە پەرتووکەکەی خۆی (الموطأ)دا بە بەڵگە هێناوەتەوە، موعەممەری کوڕی ڕاشید کە (الجامع)ی نووسیوەتەوە، فەرموودەکانی زوهریشی تێدا نووسیوەتەوە، هەروەها ئیبن جورەیج، موحەمەدی کوڕی ئەبی زیئب، لەیسی کوڕی سەعد، سوفیانی سەوری و ئەوزاعی و هەموو ئەو زانا گەورانەی کە لە قۆناغی سێیەمدا لە پەرتووکدا فەرموودەیان نووسییەوە.

ئەم زانایانە پەرتووکەکانی زوهری مامۆستایان بووە بەشێك لە پەرتووکەکانیان، کە بەناوبانگترین پەرتووك بوون لە سەردەمی خۆیاندا، کە فەرموودەکانی زوهری و فەرموودەکانی تری مامۆستاکانی تریانی تێدا کۆکرابوونەوە. هەروەها چەند قوتابییەکی زوهری بەردەوام بوون لە گێڕانەوەی فەرموودەکان لە پەرتووکەکانی زوهری کە لەبەریانگرتبوو و لەسەریان دەخوێند، وەك عوبەیدوڵای کوڕی ئەبی زیاد[٥]، کە یەکێك بوو لە زانایانی شام (١٥٨ك کۆچی دوایی کردووه) و هەشتا و شتێك ساڵ بوو، بەڵکو پەرتووکەکانی زوهری لەبەردەگیرانەوە و لە بازاڕ دەفرۆشران، معاویەی کوڕی یەحیای سەدەفی

١- المعرفة والتأريخ (٨٢٣/٢).

٢- المعرفة والتأريخ (٨٢٤/٢)، وفتح الباري (١٥٤/١).

٣- علل أحمد (١٧٢/١)

٤- ئەعزەمی لە: دراسات في الحديث النبوي (٢٠٤/١-٢١٠) باسیکردوون.

٥- طبقات ابن سعد (٣٢٣/٧)، (٧/ ٣٢٩) لە ژیاننامەی: محمد بن وليد الزبيدي.

پەرتووكێكی زوهری لە بازاڕ كڕیبووە، لە زوهریەوە فەرموودەی دەگێڕاوەتـەوە، لەگەڵ ئەوەی قوتابی زوهریش نەبووە، ئـەویش مۆڵـەتی پێنـەدابوو كـە لـەوەوە بگێڕێتەوە[1].

قوتابیـەكانی وانـەیان لای زوهـری دەخوێنـد لـە پەرتووكەكانیانـدا[2]، لەوانـە پـەرتووكی (المغـازی)ی كـە موحەمـەدی كـوڕی ئیسـحاق (١٥١ك كۆچـی دوایـی كردووە) لەبەریكردبوو، ئیبن ئیسحاق یەكێك بوو لە گەورە قوتابیانی زوهری بوو لـە لەبەركردنـدا، بەتایبـەتی لـە ژیاننامـە و مەغەزیەكانـدا، زوهـری مامۆستاشـی گەواهی بۆ داوە[3].

بەمشـێوەیە پەرتووكـەكانی زوهـری لـە فـەرموودە و ژیاننامـە لـە سەرچـاوە سـەرەكییەكان بـوون، كـە زانایـان هـەر لـە سـەرەتای سـەدەی دووەمـی كۆچـی گرنگییان پێداوە.

عومەری كوڕی عەبدولعەزیز هـەر تـەنها بـەم دوو زانایـە وازی نـەهێنا، بـەڵكو داوای لە خاڵی خۆی شەرعناس (سالیمی كـوڕی عەبـدوڵلای كـوڕی عومـەر) كـرد فەرموودەكانی باپیری بۆ بنووسێتەوە، دەربارەی چۆنیەتی كۆكردنەوەی زەكات و دابەشكردنی و ئەندازەكەی، ئەمەش لەبەر هەبوونی نووسینی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) دەربارەی زەكات لای ئەوان، سالیمیش بۆ عومەری كوڕی عەبدولعەزیزی نووسی، دواتر بۆی نارد[4]، لەگەڵ دانەیەك لە نووسینی پێغەمبـەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) كە لای خانەوادەی خەتتاب بوو.

---

١- تهذيب الكمال (٢٢١/٢٨)، وتهذيب التهذيب (٢٢٠/١٠).

٢- المعرفة والتأريخ (٨٢٧/٢).

٣- تأريخ بغداد (٢١٩/١)، وتهذيب الكمال (٤١٣/٢٤).

٤- سير الأعلام (١٣٧/٥).

ئەمانە ئـەو هـەوڵ و کۆششـە فەرمییانـە بـوون کـە خەلیفـە و ئـەمیرەکان لـە نیوەی دووەمی سەدەی یەکەم پێـی هەڵسـان، جیـا لەمـەش کۆششـی زانسـتیی نافەرمی قوتابیانی هاوەڵان و ئەوانـەی دوای ئـەوانیش گـەورەترین کاریگـەرییان هـەبوو لەسـەر پاراسـتن، نووسـین، گـەڕان بـەدوای گێڕەرەوەکـان و پیـاوانی سەنەدەکانی فەرموودە. زۆرێك لە زانایانی سەدەی یەکەم لە قوتابیانی هـاوەڵان بەم ئەرکە زانستییە هەڵسان، لەو زانایانە:

١. **سولەیمانی کوڕی قەیسی یەشکری:** کە پێش (٨٠ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێك بوو لە زانـا باوەڕپێکراوەکـانی بەسـڕە[١]، هـەروەها یـەکێك بـوو لەوانـەی هەموو کات لەگەڵ هاوەڵی بەڕێز جابیری کـوڕی عەبـدوڵڵای ئەنسـاری بـوو (٧٠ك کۆچی دوایی کرد)، ئەو فەرموودانەی جابیری نووسینەوە کە لە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) گوێبیستی بووبوو، ئەم پەرتووکەش لە بەسـڕە بـە نـاوی (سەحیفەی جابیر) ناسراو بوو.

ئەبو حاتەمی ڕازی لـە بـارەی سـولەیمانەوە دەڵێـت: "سـولەیمانی یەشـکری لـەلای جـابیر دادەنیشـت و گـوێی لـیَ ڕادەگـرت، دواتـر لـەوەوە سـەحیفەی دەنووسـییەوە"[٢]، هەنـدێك لـە زانایـانی شـوێنکەوتووان فـەرموودەیان لـەم سەحیفەیەوە دەگێڕایەوە[٣]. ئەبو سوفیان تەلحەی کوڕی نافیعی هاوڕێی، کاتێك پرسیاریان لێکرد: بۆچی فەرموودە ناگێڕییەوە لە جابیرەوە، هەروەك سولەیمانی یەشـکری وا دەکـات؟ وتـی: (سـولەیمان دەینووسـییەوە، بـەڵام مـن وام نـە دەکرد)[٤].

---

١- بڕوانە ژیاننامەکەی لە: تهذیب التهذیب (٢١٥/٤).

٢- الجرح والتعديل (١٣٦/٤)، وتهذيب التهذيب (٢١٥/٤).

٣- الجرح والتعديل (١٣٦/٤)، وتهذيب التهذيب (٢١٥/٤).

٤- العلل، أحمد بن حنبل (٢٤٨/٢)

ئەوانەی لەم سەحیفەیەوە فەرموودەیان دەگێڕایەوە:

أ/ پێشەوای شوێنکەوتووان، **حەسەنی بەسری:** (١١٠ك کۆچی دوایی کردووە). سولەیمانی تەیمی دەڵێت: (سەحیفەی جابیری کوڕی عەبدوڵلاّیان هێنا بۆ حەسەنی بەسری، ئەویش وەریگرت و ڕیوایەتی لێوە دەکرد، دواتر بۆ قەتادەیان برد ئەویش ڕیوایەتی لێوە دەکرد، دوایی بۆ منیان هێنا، من ڕیوایەتم لێوە نەکرد)[1].

ب/ **قەتادەی کوڕی دەعامەی بەسڕی:** نزیکی (١١٧ك کۆچی دوایی کردووە). ئەم سەحیفەیەی وەرگرت، فەرموودەی لەم سەحیفەیە دەگێڕایەوە[2]، هەروەك حەسەنی بەسری ئەم کارەی دەکرد. چۆن سووڕەتی بەقەڕەی لەبەردەکرد، ئاوهاش ئەم سەحیفەیەی لەبەردەکرد[3]، بوخاری دەڵێت: "قەتادە لە سەحیفەی سولەیمان یەشکری دەیگێڕایەوە. پەرتووکێکی لابوو کە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاّ گێڕدرابووەوە"[4].

ج/ **موجاهیدی کوڕی جەبری مەککی:** (١٠٣ك کۆچی دوایی کردووە)، تەمەنی (٨٣) ساڵ بوو، یەکێك بوو زانایانی تەفسیر، سی جار قورئانی پیرۆزی بۆ عەبدوڵلاّی کوڕی عەبباس خوێندۆتەوە، هەروەها فەرموودەی لە سەحیفەی ناسراوەکەی جابیری کوڕی عەبدوڵلاّوە دەگێڕایەوە لەو سەردەمەدا[5].

---

١- سنن الترمذي (٣/٦٠٤): حديث رقم (١٣١٢).

٢- التأريخ الكبير (٤/١٨٢).

٣- سنن الترمذي (٣/٦٠٤): حديث رقم (١٣١٢)

٤- طبقات ابن سعد (٦/٢٠).

٥- علل أحمد - رواية أبي داود - (٢٨٨).

د/ **ئەبو زوبەیر، موحەمەدی کوڕی موسلیم:** یەکێك بوو لە گەورە قوتابیانی جابیر، فەرموودەی لەم سەحیفەیەوە دەگێڕایەوە[1].

ه/ **ئەبو سوفیان، تەلحەی کوڕی نافیعی واسیتی:** یەکێك بووە لە قوتابیانی جابیر، لەو سەحیفەیە فەرموودەی گێڕاوەتەوە[2].

و/ **عامیری شەعبی:** کە پاش (١٠٣ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێك بوو لە زانایانی شوێنکەوتووان و دادوەرەکانیان، لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە فەرموودەی دەگێڕایەوە، هەندێك فەرموودەی کە لە جابیرەوە دەیگێڕانەوە لەم سەحیفەیەی وەرگرتبوو[3].

ی/ **موعەممەری کوڕی ڕاشیدی سەنعانی:** (١٥٤ك کۆچی دوایی کردووە)، لە پەرتووکەکەی (الجامع)دا چەندین فەرموودەی لەم سەحیفەیەوە هێناوەتەوە[4]، دەڵێت: "لە سەحیفەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە... تاد)، ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەم سەحیفەیە تا سەدەی دووەم مابۆوە.

هەروەها زانا و پێشەوای تر لەم ماوەیەدا لەم سەحیفەیە گێڕاویانەتەوە[5]، ئەم سەحیفەیە لەلای ئەم گەورە زانایانە لە سەدەی یەکەم ناسراو بوو، ئەمەش سەحیفەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنساری بوو (٧٨ك کۆچی دوایی کردووە) – یەکێك بوو لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و ئەوانەی فەرموودەیان لەبەربوو – لە ژیانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسییەوە، پاشان قوتابییەکەی، سولەیمانی کوڕی قەیسی یەشکری

---

١- علل أحمد (٢/٥٩٢)، والجرح والتعديل (٤/٤٧٥)، وتهذيب التهذيب (٥/٢٧).

٢- سنن الترمذي (٣/٦٠٤): حديث رقم(١٣١٢).

٣- الجرح والتعديل (٤/١٣٦): حديث رقم (١٣١٢).

٤- (الجامع) لە کۆتایی (مصنف عبالرزاق)دا چاپکراوە، ئەم فەرموودەیەش لە: (١١/١٨٢).

٥- بڕوانە کتێبی: معرفة النسخ الحديثية (١٥٦-١٥٨).

لەبەریگرتەوە، یاخود سەحیفەی سولەیمان کە نووسییەوە، دوای لەبەرکردنی بە چاودێری ئەو کە بە ناوی (سەحیفەی جابیر) ناسراو بوو، چونکە فەرموودەکان بووە کە لە پێغەمبەرەوە گێڕاویەتەوە، ئەوەی پاڵپشتی ڕای یەکەمیان دەکات ئەوەیە کە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا پەرتووکێکی بچووکی هەبوو بە ناوی (منسك)[1]، کە فەرموودەکانی پێغەمبەری (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) تێدا بوو دەربارەی حەج، ئەمانەش فەرموودەی درێژن کە زانایان لە پەرتووکەکانی فەرموودە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە گێڕاویانەتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا هەندێك فەرموودەی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسیوەتەوە. بە هەر شێوەیەك بێت زانایان هیچ ناکۆکییان لە بوونی سەحیفەی جابیر نییە، ئەو سەردەم لەنێو خەڵکی دەستاودەستی پێدەکرا، دانەی لەبەرگیراوەی هەبوو، لەبەرئەوە خەڵکی بەسرە و خەڵکی مەککە و خەڵکی یەمەن لەم سەحیفەیە فەرموودەیان دەگێڕایەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ناسراویی ئەم سەحیفەیە.

لەگەڵ ئەوەی هاوەڵانی جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، ئەوانەی فەرموودەکانیان بە زارەکی لەبەر دەکرد زیاتر لە سەد زانا و شێخ بوون[2]، کۆڕی زانستیی هەبوو لە مزگەوتی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ)[3]، هەر لەم سەحیفەیە فەرموودەی پێغەمبەریان (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) دەگێڕایەوە، قوتابیەکانیشی ڕاستەخۆ لەوەوە فەرموودەکانیان لەبەردەکرد، هەروەك ئەمە لەو سەردەمەدا ڕێگەیەکی نەریتی بوو. ئەو فەرموودانەی کە لەو سەحیفەیە بوون

---

١- تذكرة الحفاظ (١/٤٣).

٢- تهذيب الكمال (٤/٤٤٤-٤٤٨)، وسير الأعلام (٣/١٨٩- ١٩٤)، وتهذيب التهذيب (٣/٤٢).

٣- الإصابة (١/٢١٣).

له دڵ و مێشکی قوتابیان لەبەرکراو بوون، هەروەك لەگەڵ قورئانیش ئەم شێوازە بوو کە بە زارەکی لەبەریان دەکرد.

دیسانەوە ئەو زانایانەی لەم قۆناغەدا پشکداربوون لە کۆکردنەوەی فەرموودە و نووسینەوەی:

٢. **عوروەی کوڕی زوبەیر:** (٢٣– ٩٣ك)، کوڕی هاوەڵی بەڕێز زوبەیری کوڕی عەووام – کوڕەپوری پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) – دایکیشی ئەسمای کچی ئەبوبەکری سدیق بوو، کچی خەلیفەی یەکەمی ئیسلام. لە پاش هاوەڵان یەکێك بوو لە شەرعناسانی مەدینە[١].

لە زۆرێك لە هاوەڵان گوێبیستی فەرموودەی پێغەمبەر بووبوو، بە تایبەت پووری، عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ، هەموو کات لەگەڵی بوو، تاکو هەموو ئەو فەرموودانەی لای بوون لەبەریکردن[٢].

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، خەلیفەی ئەمەوی دەڵێت: "کەسێکم لە عوروەی کوڕی زوبەیر زاناتر نەبینیوە"[٣].

فەرموودە و زانستی دەنووسییەوە، ساڵی (٦٠ك) پەرتووکەکانی خۆی سووتاندن، دواتر لەم کارەی پەشیمان بووەوە[٤]. یەکەم کەسیش بوو پەرتووکی دەربارەی غەزاکانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) نووسی[٥].

---

١– طبقات ابن سعد (١٣٦/٥)، وسير الأعلام (٤٢١/٤).

٢– سير الأعلام (٤٢٤/٤).

٣– سير الأعلام (٤٢٥/٤).

٤– طبقات ابن سعد (١٣٧/٥)، وسير الأعلام (٤٢٦/٤ و ٤٣٦).

٥– الوافي الوفيات، صلاح الدين الصفدي (٧/١)، طبعة سنة ١٩٦٢م، نشر: هلموت ريتر، فيسبادن. والإعلان بالتوبيخ لمن ذم أهل التأريخ ، محمد بن عبد الرحمن السخاوي، (ص: ١٤٧)، ط١، ١٩٨٦م، تحقيق: فرانز لوزنثال، ترجمة: د. صالح أحمد االعلي، الرسالة– بيروت.

باوەڕپێکراو و حافز بوو، ئیبن شیهابی زوهری لەبارەیەوە دەڵێت: "کاتێك عوروە فەرموودەی بۆ دەگێڕامەوە، دواتر عومرە بۆی دەگێڕامەوە، ئەوا فەرموودەی عومرە فەرموودەی عوروەی پشتڕاستدەکردەوە"[1] واتە: ئەوەی عوروە لە پووری، خێزانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ، دەگێڕایەوە هاوشێوەی ئەوە بوو کە عومرەی قوتابی عائیشە دەیگێڕایەوە.

عومرە کچی عەبدولڕەحمانی ئەنسارییە (٩٨ك کۆچی دوایی کردووە)، قوتابی عائیشە بوو، عائیشە پەروەردەی کرد و فێری کرد، تاکو بووە یەکێك لە زانایانی مەدینە، پووری دادوەر ئەبوبەکری کوڕی حەزم بوو، کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز داوای لێکرد کە فەرموودەکانی بۆ کۆبکاتەوە و بۆی بنێرێت[2] .

عوروەی کوڕی زوبەیر هیشامی کوڕیی (٦١- ١٤٦ك) هاندەدا، بۆ نووسینەوەی فەرموودە، پاشان چاوپێخشاندن و بەراوردکردن بەو سەرچاوانەی کە لەبەری گیرابوونەوە و لێیەوە گواسترابوونەوە. جارێکیان پێی وت: (نووسیتەوە؟ وتی: بەڵێ. وتی: بەراوردت کرد؟ وتی نەخێر. وتی: کەواتە نەتنووسیوە)[3] . عەببادی کوڕی حەمزەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر داوای لە هیشام کرد کە فەرموودەکانی عوروەی کوڕی زوبەیری پێبدات، عەبباد وتی: (هیشام پەڕاوێکی بۆ دەرهێنام و وتی: ئەمە فەرموودەکانی باوکمی تێدان، ئەوەی ڕاست و سەحیحن دایناون، دەزانم کە چی تیایە، فەرموو لێمی وەرگرە...)[4] .

---

١- طبقات ابن سعد (١٣٨/٥)، وسير الأعلام (٤٣٦/٤).

٢- سير الأعلام (٥٠٧/٢ -٥٠٨).

٣- علل أحمد (٤٥٣/٢)، وجامع بيان العلم (ص: ١٣٨).

٤- المعرفة والتأريخ (٨٢٣/٢)، تأريخ التراث العربي (١٦٢/١).

ئـیبن جـورەیج (١٥٠ك كۆچـی دوایـی كـردووە) بـە سـەحیفەیەك چـووە لای هیشامی كوڕی عوروە، فەرموودەكانی هیشامی تێدابوو، داوای مۆڵەتی لێكرد كە لێوە ڕیوایەتیان بكات و ئەویش ڕێگەی پێدا[١].

هەروەها هیشام فەرموودەكانی بۆ لەیسی كوڕی سەعد نووسی كـە لـە میسـڕ بوو، ڕێگەی پێدا كە فەرموودەكان لەوەوە بگێڕێتەوە[٢].

زیاتر لە سێ سەد كەس لە خەڵكی حیجاز و عێـراق و یەمـەن و میسـڕ و شـام فەرموودەیان لە هیشامەوە گێڕاوەتەوە[٣].

٣. **موحەمەدی كوڕی حەنەفییە،** كە كوڕی عەلی كـوڕی ئـەبی تاڵیبـە (٨٠ك كۆچی دوایی كردووە).

٤. **عەبدوڵڵای كوڕی موحەمەدی كوڕی عەقیلی كوڕی ئەبی تاڵیب.**

٥. **موحەمەدی كوڕی عەلی كوڕی حوسەینی كوڕی عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب** (٥٦-١١٤ك).

هەموویان داوای زانستیان دەكرد، دەربارەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) پرسـیاریان لـە هـاوەڵان دەكـرد، دواتـر لـە پـەڕاوێك دەیاننووسییەوە[٤]، فەرموودەكانی موحەمەدی كوڕی عەلی لە باوكیـەوە، عـەلی كـوڕی ئـەبی تاڵیـب، لـە پـەرتووكێك بـوون لای عەبدولئـەعلای كـوڕی عـامری سەعالیبی قوتابی ([٥] بوو، بۆ خەڵكی دەگێڕایەوە.

---

١- المعرفة والتأريخ (٢/٨٢٤).

٢- المعرفة والتأريخ (٦/٣٦ - ٤٤).

٣- بڕوانە: سير الأعلام (٦/٣٦-٤٤).

٤- شرح معاني الآثار (٤/٣١٩)، وتقييد العلم (١٠٤)

٥- طبقات ابن سعد (٦/٣٣٦)، الجرح والتعديل (١/٧١)، و (٦/٢٦)، المعرفة والتأريخ (٢/٨١٨)، تهذيب التهذيب (٦/٢٦) تأريخ التراث العربي (١/١٢٧).

٦. **سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر:** (٩٥ك کۆچـی دوایـی کـردووە)، شـەرعزان و فەرموودەناس بوو، یەکێك بوو لە هاوەڵ و قوتابی عەبدوڵڵای کـوڕی عـەبباس – کوڕە مامی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) – سەعید زانست و تەفسیر و فەرموودەی لە ئیبن عەبباسـەوە وەرگـرت، هـەموو ئـەوەی گوێبیسـتی دەبـوو دەینووسییەوە، دەیوت: "کاتێك لای ئیبن عەبباس دەبووم ئەوەندەم دەنووسی تاکو سەحیفەکەم پڕدەبوو"[١].

هەروەها ئەوەی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتابەوە گوێی لێدەبوو لـە سـەحیفەیەکدا لای خـۆی دەینووسـییەوە هـەتاوەکو بۆچـوونە فیقهییـەکانی عەبدوڵڵاشی دەنووسییەوە[٢].

کاتێك لە هاتوچۆدا دەبوو لەنێوان عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوێی لە فەرموودەیەك دەبوو لە یـەکێکیان لەسـەر پارچـەدارێکی سـەر کورتـانی ئێسـترەکەی، کـە لەسـەری دادەنیشـت، دەینووسـییەوە، کاتێـك لـە ئێسترەکەی دەهاتە خودارەوە یەکسەر لە سەحیفەیەکدا دەینووسییەوە[٣].

٧. **سالیمی کوڕی ئەبی جەعد:** (٩٧ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێك بوو لـە زانایانی کوفە، ئـیبن سـەعد لـە بارەیـەوە دەڵێـت: "کەسـێکی بـاوەڕپێکراو بـوو فـــەرموودەی زۆری دەگێڕایـــەوە"[٤]، لـــە زۆرێـــك لـــە هـــاوەڵان فـــەرموودەی گێڕاوەتەوە، فەرموودەکانی دەنووسییەوە. پرسـیاریان لـە ئیبراهیمـی نەخـەعی کرد: (سالیمی کـوڕی ئـەبی جەعـد کێیـە کـە فـەرموودەکانی لـە هـی تـۆ ڕێـك و

---

١- الطبقات (٦/٢٦٧)، والدارمي برقم (٥٠٥)، و (٥٠٦)، و (٥٠٦)، وعلل أحمد (١/٢٣١)، و (٢/٣٨٧).

٢- الطبقات (٦/٢٩٦)، ومصنف ابن أبي شيبة (٥/٣١٥).

٣- الدارمي (١/١٣٥)، وتقييد العلم (١٠٣).

٤- الطبقات (٦/٢٩٦).

باشترن؟ وتی: لەبەرئەوەی ئەو فەرموودەکانی دەنووسییەوە)[(١)]، هەروەها دەڵێت: "سالیم فەرموودەکان دەنووسێتەوە، بەڵام من ناینووسمەوە"[(٢)].

٨. **کورەیبی خزمەتکاری ئیبن عەبباس:** (٩٨ك کۆچی دوایی کردووە)[(٣)]، خزمەتکار و قوتابی ئیبن عەبباس بوو، یەکێك بوو لە زانایانی فەرموودە، پەرتووکەکانی گەورە و مامۆستای خۆی لەبەرگرتنەوە ئەم پەرتووکانەی لای مێژوونووسی گەورە، موسای کوڕی عوقبە (٦٠-١٤١ك) دانا، موسا دەڵێت: "کوڕەیب باری ئێسترێك لە پەرتووکەکانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی لای ئێمە دانا، ئەگەر عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس پەرتووکێکی بویستایە نامەیەکی دەنووسی: ئەو سەحیفەیەم بۆ بنێرن، ئەوانیش بۆیان لەبەردەگرتەوە، دواتر بۆیان دەنارد"[(٤)].

موسای کوڕی عوقبە یەکێك بوو لە گەورە مێژوونووسە باوەڕپێکراوەکان (١٤١ك کۆچی دوایی کردووە)، نووسەری پەرتووکی (المغازی)یە[(٥)]، لە ژیاننامەی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) و غەزاکانی، ئەم پەرتووکە یەکێکە لە ڕاست و دروستترین پەرتووکەکانی ژیاننامە.

٩. **خەلاسی کوڕی عەمری هیجری:** پێش (١٠٠ك کۆچی دوایی کردووە)، کوفەییەکی باوەڕپێکراو بوو، یەکێك بوو لە هاوەڵانی خەلیفەی چوارەم عەلی

---

١- الطبقات (٢٩٦/٦)، والدارمي: حديث رقم (٤٨١)، والترمذي في (العلل الصغير) آخر السنن (٧٠٢/٥)، وتهذيب الكمال (١٣٢/١٠).

٢- تقييد العلم (ص: ١٠٨).

٣- سير الأعلام (٤٨٠/٤)، وتهذيب التهذيب (٤٣٣/٨).

٤- سير الأعلام (٤٨٠/٤).

٥- تذكرة الحفاظ (١٤٨/١)، وتهذيب التهذيب (٣٦١/١٠ - ٣٦٢)، والإعلان بالتوبيخ لمن ذم أهل التأريخ (ص: ١٤٦).

کوڕی ئەبو تاڵیب، فەرموودەی دەنووسییەوە، سەحیفەیەکی لابوو فـەرموودەی لێیەوە دەگێڕایەوە[1].

١٠. **عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی جەرمی**: ئەبو قەلابەی بەصـڕی (١٠٤ك کۆچـی دوایی کردووە)، یـەکێك بـوو لـە زانـا گـەورەکانی شـوێنکەوتووان، لـە زۆرێـك لـە هاوەڵان گوێبیستی فەرموودە بووە، زۆرێك لە زانایـان فـەرموودەیان لـەم زانایـە گێڕاوەتەوە، لە کاتی سەرەمەرگ وەسیەتی بۆ ئەیوبی سەختیانی قوتـابی کـرد، کە پەرتووکەکانی لای ئەو بن، ئەوکات لـە شـامەوە گواسـتراوە بـۆ بەسـڕە، کـە باری یەك حوشتر بوو[2].

زۆر مکـوڕ و خــەمخۆر بـوو لەســەر کۆکردنــەوەی فــەرموودەکان، جارێکیــان بیستی کە کەسێك لە مەدینە هەیە فەرموودەی پێغەمبەری لایە، ڕاستەوخۆ چوو بۆ ئەوێ، سێ ڕۆژ مایەوە تەنها لەپێناو بیستنی ئەو فەرموودەیە[3].

فەرموودەی زۆری لابوو، بەڵام کەمی دەگێڕایەوە، لە سێ فـەرموودە زیـاتری بۆ هاوەڵ و قوتابیەکانی نەدەگێڕایەوە[4]، بۆ ئەوەی بە باشی لەبەریبکەن. پاش مردنــی پەرتووکــەکانی لای ئــەیوبی ســەختیانی قوتــابی (١٢ك کۆچــی دوایــی کردووە) بوون، فەرموودەی لێیەوە دەگێڕایەوە[5].

١١. **عـامیری شـەعبی کـوفی** (٣٠- ١٣٠ك): یـەکێك بـوو لـە زانـا گـەورەکانی شوێنکەوتووان، دادوەرێکـی ناسـراوبوو، زانسـت و پەرتووکـەکانی لـە زۆرێـك لـە هـاوەڵان وەردەگـرت، هـانی قوتابیــەکانی دەدا هــەموو ئــەوەی لێـی دەبیســتن

---

١- طبقات ابن سعد (١٠٩/٧)، وتهذيب الكمال (٣٦٦/٨).

٢- طبقات ابن سعد (١٣٨/٧)، وعلل أحمد (٣٨٦/٢)، وتذكرة الحفاظ (٩٤/١).

٣- طبقات ابن سعد (١٣٧/١).

٤- طبقات ابن سعد (٧/ ١٣٧).

٥- بڕوانە: علل الدرقطني (٢٢٨/١)، وتأريخ التراث العربي (١٣٤/١).

بینووسـنەوە[1]، پـەرتووکێکی لـەبارەی مـیرات (الفـرائض) نووسـی – سـزادان واتە(الجنایات)[2]. عاسم ئەلئەحوەلی قوتابی دەڵێـت: "فـەرموودەکانی فیقهمـان بـۆ شـەعبی دەخوێنـدەوە و ئـەویش مۆڵـەتی دایـنێ بیگێڕینـەوە)[3]. (العـرض) زاراوەیەکە لای فەرموودەناسان، مەبەستیان لەم زاراوەیە ئەوەیە کە قوتابی لای مامۆستاکەی فـەرموودە دەخوێنێتـەوە و ئـەویش گـوێی لـێ ڕادەگرێـت، ئەگـەر هەڵەیەکی هەبوو بۆی ڕاست دەکاتەوە. هەندێك زانایان پێیان وایـە ئـەم ڕێگەیـە باشترە لە خوێندنەوەی مامۆستاکە بۆ قوتابیەکانی و ئەوانیش گوێی بـۆ بگـرن، لەبەرئەوەی بە ڕێگەی یەکەم دڵنیادەبێتەوە کە باشیان لەبـەرکردووە، هـەروەها خوێندنەوەشـیان زۆر ڕێکـە، بەپێچـەوانەی ڕێگـەی دووەم، ئـەویش وتنەوەیـە (التحدیث) ئەگەر زاناکە بۆ قوتابیەکانی خوێندەوە، ئـەوا قوتابیـەکان ڕاسـتەخۆ دەینووسـنەوە، یـاخود لەبـەری دەکـەن، ئـەو کاتـە نازانێـت کـە ئایـا باشـی لەبەرکردووە و نووسیویەتییەوە یاخود نا[4].

١٢. **موحەمەدی کوڕی سیرین (١١٠ك کۆچی دوایی کردووە):** یەکێك بوو لە زانا گەورەکانی بەسرە، قوتابی هـاوەڵانی بـەڕێز: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك و ئـەبو هورەیرە بوو، پێی وابوو کە ڕیوایەت بە واتا نەگێڕدرێتەوە، بەڵکو پیت بـە پیـت دەیگێڕایەوە[5]. فەرموودەکانی ئەبو هورەیرەی لە پەرتووکێکدا نووسیبوونەوە و بۆئەوەی لەبەریان بکات، دواتر پەرتووکەکەی لای یەحیای کـوڕی سـیرینی بـرای

---

١- طبقات ابن سعد (٦/٢٦٢)، وعلل أحمد (١/٢١٦)، وتقييد العلم (١٠٠)، وتأريخ بغداد (١٢/٢٣٢).

٢- تأريخ بغداد (١٢/٣٢٣)..

٣- المعرفة والتأريخ (٢/٨٢٦).

٤- بڕوانە: فتاوى ابن تيميـة (١٨/٢٨-٣١)، وفـتح البـاري (١/١٤٨)، هـەروەها: الفصـول في الأصـول للجصاص (٣/١٩١)، ط٢، ١٩٩٤م، وزارة الأوقاف- الكويت.

٥- طبقات ابن سعد (٧/١٤٤).

دانا، لەبەرئەوەی پێی خۆش نەبوو جگە لە قورئان هیچ پەرتووکێکی تر لە ماڵەکەیدا هەبێت، لە کۆتاییدا ئەم پەرتووکە کەوتە لای یەکێك لە نەوەکانی موحەممەدی کوڕی سیرین، پێشەوا عەلی کوڕی مەدینی (١٦١- ٢٣٤ك) بینیویەتی و لەبارەیەوە دەڵێت: "پەرتووکێك بوو لە پێستێکی کۆندا نووسرابووەوە"، لەنێوان هەر دوو فەرموودەدا بازنەیەك هەبوو لێکیانی جیادەکردەوە[١].

موحەممەدی کوڕی سیرین پۆزش بۆ ئەم هەڵوێستەی لە دەرخستنی ئەم پەرتووکە دێنێتەوە، پاش لەبەرکردنی و دەڵێتن: "ئەگەر پەرتووکێکم هەڵبگرتایە، ئەوا نامەکانی پێغەمبەرم (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) هەڵدەگرت"[٢].

ئەمە بۆچوونی بەشێك لە زانایانی کۆن بوو، پێیان وابووە نووسینەوە دروستە لەپێناو لەبەرکردنی ئەوەی دەیاننووسییەوە، بەڵام کاتێك پەرتووکەکانیان لەبەردەکرد لە ماڵەکەی خۆیان دەریان دەهێنا، یاخود دەیانسووتاند، یاخود دەیان شاردەوە لەبەر گەورەیی قورئان[٣].

١٣. **حەسەنی کوڕی ئەبو حەسەنی بەسری (١٥-١١٠ك)**: زانایەکی خەڵکی بەسرە بوو، پێشەوا و ڕابەریان بوو لە فیقه و فەرموودە و خوداپەرستی، زانستی لە زۆرێك لە هاوەڵان وەرگرتووە، سەلمێنراوە کە سەحیفەیەکی پێچراوەی لابووە تیرەکەی سێ پەنجە بووە، فەرموودەکانی تێدا نووسیوەتەوە.

---

١- المعرفة والتأريخ (٢/٥٤)، سير الأعلام (١١/٥٠): لەبارەی سوودوەرگرتنی عەلی کوڕی مەدینی لە کتێبی مامۆستاکانی.

٢- طبقات ابن سعد (٧/١٤٥).

٣- بڕوانە: تهذيب التهذيب (٧/١٨٣)، والأنوار الكاشفة (ص: ٣٨)..

حەمید ئەلتەویلی قوتابی دەڵێت: "زانستی حەسەن لەناو سەحیفەیەکدا بوو"[1]، دانەیەکی هەبوو لە سەحیفەی سەمرەی کوڕی جەندەبی گرتبۆوە[2]، دانەیەکیش لە سەحیفەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵا[3].

حەمید ئەلتەویلْ (١٤٢ك کۆچی دوایی کردووە) پەرتووکەکانی حەسەنی بەسری مامۆستای وەرگرت و لەبەریگرتنەوە و دواتر بۆی گەڕاندەوە[4].

١٤. **معاویەی کوڕی قەرڕە (١١٣ك کۆچی دوایی کردووە)**[5]: لەبارەی نووسینەوە زۆر توندگیر بوو، پێیوابوو کە نووسینەوە زۆر پێویستە، دەڵێت: "ئەوەی زانستەکەی نەنووسێتەوە، بە زانست هەژماری ناکەین"[6].

١٥. **عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباح** (١١٤ك کۆچی دوایی کردووە): شەرعناس و موفتی خەڵکی مەککە بوو، زانستی لە هاوەڵان وەردەگرت، یەکێك بوو لە گەورە قوتابیەکانی ئیبن عەبباس و جابیر، سەحیفەیەکی لابوو فەرموودەکانی تێدا نوسرابوون[7]. هەروەك سەحیفەیەکی لابوو تەفسیری ئیبن عەبباسی تێدا نووسرابووەوە، لە بەناوبانگترین قوتابیەکانی عەبدولمەلیکی کوڕی جورەیج بوو (١٥٠ك کۆچی دوایی کردووە)، فەرموودەکانی بۆ عەتای مامۆستای خوێندبووەوە[8].

---

١- طبقات ابن سعد (١١٦/٧).

٢- علل ابن المديني (ص: ٥٣)، وتهذيب التهذيب (٢٦٩/٢).

٣- بڕوانە: لاپەڕە (٨٠) .

٤- طبقات ابن سعد (١٢٨/٧)، و (١٨٧/٧)، والعلل لأحمد (٣٩/١) هەڵەیەکی چاپیشی تیایە. وتهذيب التهذيب (٣٩/٣)، وتأريخ التراث العربي (١٦٣/١).

٥- بڕوانە: سير الأعلام (١٥٣/٥)، وتهذيب التهذيب (٢١٦/١٠).

٦- الدارمي: حديث رقم (٤٩٦)، وتقييد العلم (ص: ١٠٩).

٧- مقدمة الجرح والتعديل (ص: ٣٩)، وتهذيب التهذيب (٣٢٩/٣)، وتأريخ التراث العربي (١٢٩/١).

٨- علل الترمذي: آخر السنن (٧٠٥/٥).

١٦. **سولەیمانی کوڕی موسای ئەسەدی** (١١٥ك کۆچی دوایی کردووە): شەرعناس و موفتی خەڵکی شام بوو. سەحیفەیەکی لابوو کە فەرموودەکانی تێدا نووسرابوونەوە و بۆ خەڵکی ڕیوایەت دەکردن، هەمووی لەبەربوو[1].

١٧. **بەشیری کوڕی نەهیکی بەسڕی**: یەکێك بوو لە قوتابییەکانی هاوەڵی گەورە و بەڕێز ئەبو هورەیرە، هەر فەرموودەیەکی لەو ببیستایە ڕاستەخۆ دەینووسییەوە، دواتر پاش تەواوبوونی نووسینەوەی فەرموودەکانی بۆ دەخوێندنەوە.

لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: "بە پەرتووکەکەمەوە چوومە لای ئەبو هورەیرەوە و بۆم خوێندەوە، وتم: ئەمە ئەو فەرموودانەیە کە لە تۆوە گوێبیست بووم؟ وتی: بەڵێ"[2].

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: "بەشیری کوڕی نەهیك فەرموودەکانی لە ئەبو هورەیرەوە نووسییەوە، داوای لێکرد کە لەوەوە فەرموودەکان بگێڕێتەوە، ئەویش ڕێگەی پێدا"[3].

١٨. **مەکحولی شامی (١١٦ك کۆچی دوایی کردووە):** یەکێك بوو لە گەورە زانایانی شوێنکەوتووان لە شام، قوتابی هاوەڵان بوو[4]، یەکێك بوو لەو زانایانەی کە هەڵسا بە نووسینی پەرتووك لە سەدەی یەکەمی کۆچی، پەرتووکێکی لەبارەی فەرموودەکانی فیقه نووسی، پەرتووکێکیش لەبارەی بابەتەکانی فیقه.

---

١- الميزان، للذهبي (٢/٢٢٥).

٢- طبقات ابن سعد (٧/١٦٦)، ومصنف ابن أبي شيبة (٥/٣١٤)، المعرفة والتأريخ (٢/٨٢٦)، وتقييد العلم (١٠١)، وسير الأعلام (٤/٤٨٠)، وتهذيب التهذيب (١/٤٧٠).

٣- العلل لأحمد (١/٢١٥)، وعلل الترمذي: آخر السنن (٥/٧٠٦).

٤- تهذيب التهذيب (١٢٠/٢٩١).

ئیبن نەدیم لە(الفهرست)دا بە ناونیشانی (السـنن في الفقـه) و (المسـائل في الفقـه) باسی کردوون[1]. پەرتووکێکیشی هەیە لەبارەی (الحج)[2].

عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبو سائیب – کە یەکێکە لـە قوتابیـەکانی مـەکحول – فەرموودەکانی بۆ دەخوێنەوە و ئـەوەی هەڵـە بووایـە بـۆی ڕاسـتدەکردەوە، بـۆ ئەوەی دواتر ڕێگەی پێبدات فەرموودەکان لەوەوە بگێڕێتەوە[3].

١٩. **قەتادەی کوڕی دەعامەی بەسری (١١٧ك کۆچی دوایی کردووە):** یەکێك بوو لە زانا گەورەکانی فەرموودە و تەفسیر و قوتـابی هـاوەڵی بـەڕێز عەبـدوڵڵای کوڕی عەبباس بـوو – کوڕەمـامی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) – تەفسیریشی هەر لەوەوە وەرگرتووە، هـەروەها قوتـابی هـاوەڵی بـەڕێز ئەنەسـی کوڕی مالیـك بـوو – خزمـەتکاری پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) – قوتـابی هـاوەڵی بـەڕێزیش جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵای ئەنسـاری بـوو، لـەبارەی خۆیەوە دەڵێت: "سەحیفەی جابیری کوڕی عەبدوڵڵام لە سورەتی (البقرة) باشتر لەبەر بوو"[4]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سـەحیفەی جـابیر فـەرموودەی زۆری لـەخۆگرتووە، ئەگـەر نـا زانایـەکی گـەورەی بـەناوبانگی وەك قـەتادە بـە شـانازییەوە بانگەشـەی ئـەوە ناکـات کـە باشـی لەبـەر کـردووە، لەبـەر ئـەوە لەبـەرکردنی سـەحیفەکەی بـە لەبـەرکردنی سـورەتی (البقـرة) دەچـوێنێت، کـە درێژترین سورەتی قورئانی پیرۆزە، دووەم سورەتە لە قورئان و(٢٨٦) ئایەتە.

---

١- الفهرست (ص: ٢٢٧) تحقيق: LEIPZG DR: Johannes Roediger VERLG VON F.C.W. VOC EL 1871

٢- المعرفة والتأريخ (٨٢٩/٢).

٣- طبقات ابن سعد (١٧١/٧)، والتأريخ الكبير (٧/ ١٨٦)، والتمييز لمسلم (ص: ١٧٦).

٤- طبقات ابن سعد (١٧٢/٧).

قـەتادە هـاوەڵ و قوتابیـەکانی هانـدەدا بـۆ نووسـینەوە، ڕێگـەی دەدا هـەر فەرموودەیەك لەوەوە گوێبیستی بـن بینووسـنەوە[١]. قوتابیەکانیشـی لەمیانـەی وانەکانیـدا فـەرموودەکانی کـە دەیـوت دەیاننوسـیەوە. پەرتووکەکـەی لـەبارەی تەفسیرەوە زۆر بەناوبانگ بوو لەسەدەی دووەم و سێیەم[٢].

٢٠. **نافیعی خزمەتکاری عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خـەتتاب (١١٧ك کۆچی دوایی کردووە):** یـەکێك بـوو لـە زاناکـانی شـوێنکەوتووان، لـە کۆمـەڵێك هاوەڵەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە. هەموو کات لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا بوو (٧٤ك کۆچی دوایی کرد). عەبدوڵڵاش زاناترین هاوەڵ بوو بە فـەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) ، زۆریـش پێـوەی پابەنـد بـوو، هـەتا ئەوەی چاودێری ئەو شوێنانەی دەکردن کە پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) لێـی وەسـتابوو، یـاخود نوێـژی لێکردبـوو، ئـەویش وەك شـوێنکەوتنی پێغەمبەر لێی دەوەستا و نوێژی تێدا دەکرد[٣].

نافیع خزمەتکار و قوتـابی عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر بـوو، لـە عەبـدوڵڵا و لـە زۆرێك هاوەڵەوە فەرموودەی نووسیوەتەوە. ئیبن سەعد دەڵێت: "متمانـەپێکراو و فەرموودەی زۆر بوون"[٤].

عەبدولمەلیکی کوڕی جورەیج، کە یەکێك بوو لە قوتابیەکانی، دەڵێت: "نافیع جانتایەکی بـۆ مـن هەڵدا کـە فـەرموودەی تێـدا نووسـیبونەوە، تێیـدا بـوو بـۆم خوێندەوە و تێیشیدا بوو پرسیارم لەبارەوە کرد"[٥].

---

١- تقييد العلم (ص: ١٠٣).

٢- بڕوانە: طبقات ابن سعد (٧/ ٢٠٤)، وعلل أحمد -رواية أبي داود - (ص: ٢٤٧).

٣- تذكرة الحفاظ (٣٩/١)، وسير الأعلام (٢١٣/٣)، والإصابة (٣٤٧/٢)، وتهذيب التهذيب (٣٢٨/٥).

٤- الطبقات (٣٤٢/٥)، وتهذيب الكمال (٢٩/ ٢٩٨).

٥- تأريخ بغداد (٤٠٦/١٠).

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نافیع فەرموودەی دەنووسییەوە، ئەوەشی کە دەینووسییەوە لە جانتایەك دەیپاراست، پەرتووکێکی لابوو کە لە ئیبن عومەرەوە گوێبیستی بووبوو، ئەوانیش بۆ نافیع دەیانخوێندەوە، هەروەك فەرموودەکانی بە قوتابیەکانی دەنووسینەوە لای خۆی، هەروەها داوای لە قوتابیەکانی دەکرد ئەوەی نووسیویانەتەوە بۆی بخوێننەوە، بۆ ئەوەی هەڵەکانیان بۆ ڕاست بکاتەوە[1].

فەرموودەی لە ئیبن عومەرەوە نووسیبووەوە، بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عەونی نارد، عەبدوڵڵاش بۆ خەڵکی باسدەکرد، هەروەها ئەو پەرتووکەی کە نافیع بۆی ناردبوو بۆ خەڵکەکەی دەخوێندەوە[2]. قوتابیەکانی ئیبن عەون ئەو فەرموودانەیان دەنووسیەوە کە بۆی دەخوێننەوە، لەوانە خالیدی کوڕی حارس و مەعازی کوڕی مەعاز و یەحیای قەتتان[3].

لەوانەی لەبەر ئەم هۆیە بووبێت کە لە گێڕانەوەکانی نافیع هیچ هەڵەیەك نەبێت تەنها لە یەك فەرموودەدا نەبێت[4]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نافیع لەگەڵ ئەوەی کە فەرموودەکانی لەبەربوو دەشگەڕایەوە بۆ کتێبەکەی و لەبەرکردنەکەی دڵنیا دەکردەوە.

بوخاری دەڵێت: "ڕاسترینی سەنەدەکان: مالیك لە نافیعەوە لە ئیبن عومەرەوە"[5].

---

١- سنن الدارمي: رقم (٥١٣)، سير الأعلام (٥/٩٨ -٩٩).

٢- مسند أحمد (٢/٢٩ - ٣١ -٣٢)، هەروەها: البخاري رقم (٢٥٤١).

٣- سير الأعلام (٩/١٨٣).

٤- الإرشاد، الخيلي (١/٢٠٥)

٥- تهذيب الكمال (٢٩/٣٠٣)، تذكرة الحفاظ (ص: ٩٩).

زۆرێك لە زانایـان و مامۆسـتایان فـەرموودەیان لێـوە گێڕاوەتـەوە، کـە سـەد کەس تێپەڕ دەکات، لەوانە ئیمام مالیـك، ئـیبن جـورەیج و ئـەوزاعی [1]. خەلیفـە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نـافیعی وەك مامۆسـتا بـۆ خـەڵکی میسـڕ نـارد، بـۆ ئـەوەی فـەرموودەیان فێرکـات[2]. پەرتووکەکـەی عوبەیـدوڵڵای کـوڕی عومـەری قوتـابی کـە فـەرموودەکانی نـافیعی تێـدا کۆکردبوونـەوە، تـا کۆتـایی سـەدەی دووەمی کۆچی هەر مابوو. یەحیای کوڕی قەتتان – مامۆستای ئەحمەدی کوڕی حەنبـەل – لـە کـاتی دروسـتبوونی نـاکۆکی و جیـاوازی لـە نێـو زانایـان لـە فەرموودەکانی نافیعدا دەگەڕایەوە بۆ ئەم کتێبە[3].

٢١. **عەمری کوڕی شوعەیبی کوڕی موحەمـەدی کـوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی عەمری کـوڕی عـاس (١١٨ك کۆچـی دوایـی کـردووە):** نـەوەی هـاوەڵی بـەڕێز عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە، خاوەنی (الصحيفة الصادقة)یە، سەحیفەکە کەوتە لای ئەو، فەرموودەی لەم سەحیفەیەدا دەگێڕایەوە، بە ناوی (نسخة عمرو بـن شـعيب عـن أبيـه عـن جـده)[4] نـاوی دەرکردبـوو. زانایـان لـەوە ڕاجیاییـان نییـە کـە سەحیفەیەکی لابووە و فەرموودەکانی پێغەمبەری (دروودی خـودای لـێبێ) تێـدا نووسرابوونەوە، بەڵکو لەوە ڕاجیان کـە ئایـا لـە بـاوکی گوێبیسـت بـووە و بـۆی خوێندۆتـەوە؟ ئایـا باوکیشـی لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمری بـاپیری گـوێی لێبووە؟[5]، لەبەر ئەوەی زۆرێك لە زانایانی فەرموودەناس گێڕانەوە لەو کەسـانە قەبوڵ ناکەن کە پەرتووکێکی هەبێت و لێی بگێڕێتەوە بێ ئەوەی بۆ ئەو کەسەی

---

١- تهذيب الكمال (٢٩/٢٩٩ -٣٠٣).

٢- طبقات ابن سعد (٥/ ٣٤٣)، وتهذيب الكمال (٢٩/٣٠٤)، وتذكرة الحفاظ (١/١٠٠).

٣- علل أحمد – رواية المروذي (ص: ١٤٨).

٤- علوم الحديث، ابن الصلاح (ص: ٣١٥): النوع الخامس والأربعين، وسير الأعلام (٥/١٧٤).

٥- مجموع الفتاوى (١٨/ ٨- ٩)، نسخة عمرو بن شعيب في أطراف مسند أحمد (٤/٢٦-٥٣).

بخوێندبێتەوە کە لێیەوە نووسیویەتەوە، چونکە دەترسێن هەڵەی چاپ و کەم و کووڕی لە خوێندنەوەکەیدا هەبێت، هەتا ئەگەر گومانیشیان نەبێت لە دروستی ئەوەی کە پەرتووکەکە هی ئەو نووسەرەیە، زانایان ناکۆکییان نییە کە عەمروی کوڕی شوعەیب پەرتووکێکی هەبوو کە فەرموودەکانی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری باپیری تێدابوون، بەڵکو هەندێکیان دوودڵ بوون لە پەسەندکردنی، لەبەر ئەوەی گومان هەبوو لەوەی عەمری کوڕی شوعەیب ئەم پەرتووکەی خوێندبێتەوە یان گوێبیستی بووبێت –هەروەك ڕێگەی فەرموودەناسان بەم شێوەیەیە– یاخود نا؟.

ئیبن تەیمییە دەڵێت: "ئەگەر دانەیەك لەسەردەمی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لێبێ) دا نووسرابێتەوە، ئەمە زیاتر تەئکیدی ئەکردەوە و بەڵگەش بوو لەسەر ڕاستێتی"[1].

٢٢. **ئەبو ئیسحاق عەمری کوڕی عەبدوڵڵای سەبیعی** (١٢٧ك): یەکێك لە زانا و لەبەرکارە گەورەکان، فەرموودەی لە زۆرێك لە زانایان وەرگرتووە، تەمەنی درێژ بوو، پەرتووکێکی حارسی کوڕی عەبدوڵڵای ئەعوەری لابوو لە دەوروبەری (٧٠ك کۆچی دوایی کردووە).

حارسی ئەعوەر یەکێك بوو لە زانایانی کوفە، یەکێك بوو لە قوتابیەکانی خەلیفەی چوارەم عەلی کوڕی ئەبوتالیب (٤٠ك کۆچی دوایی کردووە)، ئەو فەرموودانەی دەنووسینەوە کە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیب گوێی لێدەبوو[2].

ئەبو ئیسحاقی سەبیعی یەکێك بوو لە هاوەڵ و کەسە نزیکەکانی، پەرتووکەکەی ئەوی بەدەستکەوت، بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە، هەروەها دانەیەك لە

---

١– تهذيب الكمال (١١١/٢٢)، والميزان (٣٤٥/١).

٢– طبقات ابن سعد (٢٠٩/٦).

تەفسیری ئیبن عەبباسی لابوو کە لە ئەربەدی تەمیمی قوتابی ئیبن عەبباسەوە وەریگرتبوو[1].

ئەبو ئیسحاق ئەو فەرموودانەی کە لەبەری بوون بە یونسی کوڕی دەووتەوە (١٥٩ك کۆچی دوایی کردووە)، یونس چەند پەرتووکێکی لابوو کە فەرموودەی تێدا نووسرابوونەوە[2]، هەروەها ئەبو ئیسحاق فەرموودەکانی بە نەوەکەی، ئیسرائیلی کوڕی یونس دەووتەوە (١٦٠ك کۆچی دوایی کردووە)، ئەویش دەینووسییەوە و لەبەریدەکرد[3].

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت: "کاتێك ئیسرائیلی کوڕی یونس لە پەرتووکەکەی فەرموودەی دەگێڕایەوە، هیچی نەدەپەڕان و هیچی لەبیر نەدەکرد و، لەبەرکارێکی بەتوانا بوو"[4].

٢٣. **بوکەیری کوڕی عەبدوڵلای ئەشەج (١٢٧ك):** زانایەکی گەورە بوو، یەکێك بوو لەوانەی کە پەرتووکی هەبوو، یەکێك بوو لە زانا گەورەکانی مەدینە، لە ئاستی زوهری بوو لە زانست و نووسینەوەی فەرموودە[5]، تەنها ئەوە نەبێت لە مەدینە چووە میسر وەك زوهری ناوبانگی دەرنەکرد، پەرتووکەکانی بەکیر لای مەخرەمەی کوڕی بوون (١٥٩ك)، مەخرەمە فەرموودەی لە پەرتووکەکانی باوکی دەگێڕایەوە، ئیمام مالیك بۆ پەرتووکەکانی بوکەیر دەگەڕایەوە و تەماشای دەکرد، کە لای کوڕەکەی بوون، هەروەها فەرموودەشی لێ دەگێڕایەوە[6].

---

١- تهذيب الكمال (٢/٣١٠)، و (٢٢/١٠٣).

٢- تهذيب التهذيب (١١/٤٣٤).

٣- تأريخ بغداد (٧/٢٢).

٤- العلل: رواية أبي داود (٣١١).

٥- تهذيب الكمال (٤/٢٤٥)، والسير (٦/ ١٧٠)، وتهذيب التهذيب (١/٤٩١).

٦- بڕوانە: العلل لأحمد (١/٣١٦)، التأريخ الكبير (٨/١٦) الجرح والتعديل (٨/ ٣٦١ – ٣٦٢).

٢٤. **ئــەيوبی ســەختيانی (٦٨– ١٣١ك):** يەكێكـە لــە زانـا گـەورەكان و فەرموودەناسی شاری بەسرە لەگەڵ هاوەڵی بەڕێز ئەنەسـی كـوڕی مالیـك بـووە (٩٣ك كۆچی دوايی كردووە)[1] فەرموودەكانی خۆی بـە قوتابیـەكانی دەوتـەوە، هانیدەدان كە پشت بە لەبەركردن ببەستن، بە ناپەسەندی دەزانی پشت ببەستن بـە نووسـین، كاتێـك بینـی ئـەو فەرموودانـەیان نووسـیوەتەوە كـە بـۆی وتـوون فەرمانی پێكردن كە نووسینەكانیان نیشان بدەن تـا هەڵـەكان و ناڕێكییـەكانیان بۆ چاك بكاتەوە[2]. كۆمـەڵێك لـە قوتابیـەكانی فـەرموودەكانیان نووسـیوەتەوە، لەوانە حەممادی كوڕی زەید (٩٧– ١٧٩ك)[3] و مالیكی كوڕی ئەنەس[4].

هەروەها پەرتووكەكانی ئەبو قەلابەی مامۆستای لابوون، كە لە كـاتی مردنـی وەسیەتی كردبوو كە پەرتووكەكانی ببرێت بۆ بەسرە بۆ ئەیوبی قوتابی [5].

٢٥. **هەممامی كوڕی مونەببیهی سەنعانی (١٣٢ك كۆچـی دوایـی كـردووە):** یـەكێك بـووە لـە قوتابیـە تایبەتییـەكانی ئـەبو هـوڕەیرە (٥٩ك كۆچـی دوایـی كردووە)، ئەو فەرموودانەی كە ئەبو هورەیرە لە پێغەمبـەرەوە (دروود و سـڵاوی خودای لێبێ) دەیگێڕانـەوە ئـەوا ڕاسـتەخۆ دەینووسـینەوە، ئـەبو هـوڕەیرە لـە مزگـەوتی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) فـەرموودەی بـۆ هـاوەڵانی دەگێڕایەوە.

زەهــەبی دەڵێــت: "هــەممام لــە ئـەبو هـوڕەیرەوە دانەیـەكی لەبـەرگیراوی بەناوبانگی ڕیوایەت كردووە، زۆربەی فـەرموودەكان لـە كتێبـەكانی سـیحاحدان،

---

١– سير الأعلام (١٦/٦).

٢– علل أحمد (١٧٥/١)، وتأريخ التراث العربي (١٦٠/١).

٣– تهذيب التهذيب (١١/٣).

٤– تهذيب التهذيب (٣٩٨/١).

٥– بڕوانە لاپەڕە (٨٨).

موعەممەر لێی گێڕاوەتەوە، هەممامیش تەمەنی زۆر درێژ بوو"[1] تاکو "لەبەر پیریی برۆکانی بەسەر چاوانیدا هاتبوون"[2].

زەهەبی دەڵێت: "هەممامی کوڕی مونەبیه... ئەو فەرموودەناسە بەتوانایە بوو کە خاوەنی ئەو سەحیفەیە بوو کە لە ئەبو هورەیرەوە نوسیویەتییەوە، نزیکەی سەد و چل فەرموودە دەبوو"[3].

ئیبن حەجەر دەڵێت: "سەحیفەکەی هەممام لە ئەبو هورەیرەوە بەناوبانگە"[4].

خەتیبی بەغدادی باسی دەکات کە چەند دانەیەکی بەناوبانگ لای فەرموودەناسان هەبوون، لەوانە دانەیەکی هەممامی کوڕی مونەبیه لە ئەبی هورەیرەوە[5]، ئەم سەحیفەیە چەندین جار چاپکراوە[6]، کە بەتەواوی لە موسنەدی ئەحمەد بە یەك ئیسناد هەیە[7]، لە سەحیحی بوخاری و موسلمیش بە پچڕ پچڕی هەیە بە گوێرەی دەروازە فیقهییەکان، دانەیەکی دەستنووس لە کتێبخانەی (الظّاهرية) هەیە[8].

---

١- تذكرة الحفاظ (١٠١/١).

٢-سير الأعلام (٣١٢/٥).

٣- سير الأعلام (٣١١/٥)..

٤- تهذيب التهذيب (٣١٦/١).

٥- الكفاية (ص: ٢٥٠).

٦- بڕوانە: تحقيق أحمد شاكر لمسند أحمد (١٩/١٦) دەربارەی ئەم نوسخەیە، ساڵی ١٩٣٢ز لە دیمەشق چاپکراوە.

٧- المسند (٢١٣/٢- ٣١٩).

٨- فهرس مخطوطات دار الكتب الظاهرية، ياسين السواس، القسم الأول من المجاميع (ص: ٣٣٢): تحت رقم المجموع ١٢٥٤، طبعة سنة ١٩٨٣م- دمشق، السنة قبل التدوين (ص: ٣٥٦)، تأريخ التراث العربي (١٥٨/١).

٢٦. **یەحیای کوڕی ئەبی کەسیر** (١٣٢ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێك بوو لە زانا گەورەکان و خەڵکی یەمامە بوو، سەحیفەیەکی نووسیبوو، ئەو فەرموودانەی تێدابوون کە لە مامۆستاکانی گوێی لێ بووبوون، ئەم سەحیفەیە درا بە ئەوزاعی (١٥٦ك کۆچی دوایی کردووە)، ڕێگەی پێدا کە فەرموودەی لێبگێڕێتەوە. ئەوزاعی دەیوت: "کاری پێدەکەین و نایان گێڕینەوە)[1]، چونکە لای یەحیای کوڕی ئەبی کەسیر نەیخوێندبوو و گوێبیستی نەبووبوو، پێیانوانەبوو کە دروست بێت لێیەوە بیگێڕنەوە، لەگەڵ ئەوەش پێیان وابوو کە دروستە کار بەو فەرموودانە بکرێت کە تێیدان، چونکە گومانیان نەبوو لە درانە پاڵ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، بەڵکو لەبەرئەوەی ئەم فەرموودانەی لە یەحیای کوڕی ئەبی کەسیری مامۆستای گوێبیستی نەبووبوو، هەروەها بۆشی نەخوێندبووەوە –هەروەك ڕێگەی فەرموودەناسان بەمشێوەیە– لەبەرئەوە فەرموودەکانی نەدەگێڕایەوە باسی نەدەکردن.

٢٧. **عەلائی کوڕی عەبدولڕەحمان** نزیکەی (١٣٥ك کۆچی دوایی کردووە)، خەڵکی مەدینە بوو، لە هەندێك لە هاوەڵان گوێبیستی فەرموودە بووبوو لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ئەنەسی کوڕی مالیك[2]، سەحیفەیەکی لابوو فەرموودەکانی باوکی تێدابوو لە ئەبو هوڕەیرەوە.

لەو سەردەمدا ئەو سەحیفەیە لە مەدینە بەناوبانگ بوو، موسلیمیش لە سەحیحەکەی خۆیدا داینەوە[3].

---

١– سير الأعلام (١١٤/٧).

٢– الجرح والتعديل (٣٧٥/٦).

٣– طبقات ابن سعد (٥/ ٢٤٠)، وتهذيب التهذيب (١٨٧/٨)

عەبدولڕەحمانی کوڕی یەعقوبی باوکی یەکێك بوو لە قوتابیەکانی هاوەڵی بەڕێز ئەبو هورەیرە، فەرموودەی زۆری لە ئەبو هورەیرە گێڕاوەتەوە[1].

پەرتووکێکی لابوو ئەم فەرموودانەی تێدا نووسرابوونەوە، یەکێك لەوانەی ئەم پەرتووکەی بۆ عەبدولڕەحمان خوێندۆتەوە عەبدولعەزیزی دەراوەردی بوو[2].

٢٨. **موحەمەدی کوڕی عەجلان** (١٤٨ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێك بوو لە زاناکانی مەدینە، لە هەندێك هاوەڵ گوێبیستی فەرموودە بووبوو، سەحیفەیەکی گەورەی لابوو فەرموودەکانی سەعیدی مەقبور لە باوکیەوە لە ئەبو هورەیرەوەی تێدا بوو، ئیبن حیببان لەبارەیەوە دەڵێت: **"سەحیفەکە هەمووی سەحیحە"**[3].

بەمشێوەیە دەبینین زۆرێك لە قوتابیانی هاوەڵان، هەر لە زووەوە فەرموودەیان نووسیوە، هەوڵیانداوە ئەو فەرموودانە بنووسنەوە کە هاوەڵان نووسیبوویانەوە و لەبەریان کردبوو، بەم شێوەیە گێڕانەوە بە سەنەد دەرکەوت و بڵاوبووەوە لەبەرئەوەی شوێنکەوتووان بە سەردەمی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) نەگەیشتبوون، بۆیە پێویست بوو هەر یەکەیان ئاماژە بەو ناوانە بکەن کە بە هۆیانەوە فەرموودەکەیان بیستووە[4].

---

١- بڕوانە نوسخەکەی لە ئەبو هورەیرەوە لە پەراوێزی موسنەدی ئیبن حەجەر: (٣٧٦/٧ - ٣٩٣).

٢- سير الأعلام (٣٦٨/٨).

٣- ثقات ابن حبان (٣٨٦/٧)، وتهذيب التهذيب (٣٤٢/٩).

٤- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: السنة قبل التدوين (٣٢٦)، و (٣٣٧)، و (٣٤٣)، ودراسات في الحديث النبوي (١٤٣/١ -٢٢٠)، باسی نزیکەی سەد و پەنجا زانای لە شوێنکەوتووان و قوتابیانی هاوەڵان کردووە، کە لەم قۆناغەدا فەرموودەکانیان نووسیوەتەوە.

هـەروەك دەبيـنين نووسـينەوە لـە قۆنـاغی دووەمـدا، لـە هـەموو شـارە ئیسلامییەکاندا بڵاوبووەوە: لە مەدینە، مەککە، بەسرە، کوفـە، یەمـەن، شـام و میسر، کە هاوەڵان بەم ناوچانەدا بڵاوبووبوونەوە.

هەروەها دەبینین ئەو هاوەڵانەی کە بە زۆر لەبەرکردنی فەرموودە بـەناوبانگ بـوون قوتابیـان هـەبوون، فـەرموودەکانیان دەنووسـینەوە، هـەروەك ئـەو قوتابیانەشیان هەبوون کە ڕاستەخۆ لەبەریان دەکردن.

نـافیع و سـەعیدی کـوڕی جوبـەیر و جیـا لەمانـەش فـەرموودەکانی ئـیبن عومەریان دەنووسییەوە. ئیبن عەبباسیش قوتابی خۆی هەبوون فـەرموودەکانی ئەویان دەنووسینەوە وەك سەعیدی کوڕی جوبەیر و عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح و کورەیب.

سـولەیمانی یەشـکریش فـەرموودەکانی جـابیری کـوڕی عەبـدوڵڵای دەنووسییەوە، هەممامی کوڕی مونەببیه و موحەمەدی کـوڕی سـیرین و بەشـیری کوڕی نەهیك و جیا لەمانەش هی ئەبی هورەیرەیان دەنووسییەوە.

کوڕەکـانی ئەنەسـی کـۆڕی مالیـك و زوهـری هـی ئەنەسـی کـوڕی مالیکیـان دەنووسییەوە... تاد.

هەروەها وەك دەبینین لەم قۆناغەدا نووسینەوە لـە هونـەرە جۆراوجۆرەکـان دەرکـەوتن، شـەعبی پـەرتووکێکی نووسـی لـە بـارەی سـزادان (الجنایـات) و پـەرتووکێك لـە بـارەی (مـیرات) و پـەرتووکێك لـەبارەی (تـەڵاق) و یـەکێکیش لەبارەی (المغازی)[1].

عاسمی ئەلئەحوەلی قوتـابی شـەعبی دەڵێـت: "فـەرموودەکانی فیقهمـان لای شەعبی خوێند و ئەویش مۆڵەتی پێدایین)[2]، ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە

١- تأريخ بغداد (١٢/٢٣٠- ٢٣٢).

٢- المعرفة والتأريخ (٢/٨٢٦).

شـــەعبی ئـــەو فەرموودانـــەی تایبـــەتن بـــە فیقـــھ لـــە پـــەرتووکی تایبەتـــدا نووسیونیەتەوە، لەوانەیە کارەکـەی کـە دادوەر بـووە کاریگـەریی هـەبووبێت لـە هاندانی بۆ نووسینی پەرتووك و بەشی تایبەت لە فیقهـدا، کـە دادوەر پێویسـتی پێیانە[1].

هەروەك زەحاکی کوڕی موزاحیم (١٠٥ك کۆچـی دوایـی کـردووە)، پـەرتووکی (مناسك الحج)ی نووسی و به حوسەینی کوڕی عەقیلی قوتابی وتووەتەوە[2].

هەروەها(تەفسیری موجاهید) بەناوبانگ بووە و بە قوتابیـەکانی وتووەتـەوە، ئەوانیش نووسیویانەتەوە[3]. موجاهیدیش تـەفسیری ئیبن عەبباسی نووسییەوە.

---

١- دراسات في السنة النبوية (١/١٥٣).

٢- علل أحمد (١/٢١٧).

٣- علل أحمد (١/٢١٨)، وتقييد العلم (١٠٥).

## قۆناغی سێیەم: ڕێکخستن:

قۆناغی ڕێکخستن نزیکەی ساڵی (١٢٠ك) تا (١٥٠ك) دەستی پێکرد، لەم قۆناغەدا پەرتووکی ڕێکخراو بە دەروازە و بەش بەشی فیقهی دەرکەوتن، ئەمەش قۆناغێکی گەشەسەندووە لە نووسینەوە، ئەم ڕێکخستن و دەروازەدانانە زۆرێك لە پەرتووکەکانی قۆناغی پێشووتری لەخۆگرت، لەم قۆناغەدا دەبینین نووسینەوە لە زۆرێك لە شار و شوێنەکان دەرکەوتن کە ناوچەکانیان لە یەکتریەوە دووربوو، لە مەککە و مەدینە و یەمەن و شام و عێراق و میسر، هەروەك دەبینین ئەو زانایانەی بەم کارە هەڵسان لە گەورەترین زانایانی ئەم سەردەمە بوون، لە هەمان کاتدا قوتابی ئەو زانایانە بوون کە لە قۆناغی پێشتر پەرتووکیان هەبوو، زۆربەیان قوتابی زوهری بوون، مامۆستاکەیان زوهری کە(یەکەم کەس بوو کە فەرموودەی لە پەرتووکێکدا نووسییەوە، دواتر لەپاش ئەو ئەم کارە پەرەیسەندوو و بڵاوبووەوە. لەدوای ئەویش ڕێکخستن و دەروازە دانان) پەیدابوو[1]. ئەم قوتابیانە یەکەم کەس بوون کە دەستیان بە ڕێکخستن و دەروازەدانان کرد، ئەمەش ڕێکخستنە لە چەندین دەروازە و بەشێکدا بەگوێرەی بابەتی فیقهی.

زوهری هەر لە ساڵی (٧٠ك)، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی فەرموودە، لەگەڵ هاوەڵەکانی ئەبو زیناد و سالحی کوڕی کەیسان[2] و جیا لەوانەش لە قوتابی و ڕۆڵەکانی هاوەڵان، ئەگەر ئەو یەکەم کەس بووبێت کە فەرموودەی لە دووتوێی پەرتووکێکدا نووسیبێتەوە بە فەرمانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نزیکی ساڵی (١٠٠ك)، پاش ئەمە نووسینەوە لە دووتوێی پەرتووکێکدا بڵاوبووەوە، تاکو

---

١- فتح الباري (٢٠٨/١): حديث رقم (١١٣)، تأريخ التراث العربي (١٢٢/١)..

٢- بڕوانەلاپەڕە (٧٤).

دەروازەدانان نزیکەی ساڵی (١٢٠ك) دەرکەوت، بەمشێوەیە قۆناغی نووسینەوەی فەرموودە نزیکەی حەفتا ساڵ بوو (١- ٧٠ك)، ماوەی قۆناغی کۆکردنەوەی فەرموودە نزیکەی سی ساڵ بوو(٧٠- ١٠٠ك)، ماوەی قۆناغی خستنە ناو دووتوێی پەرتووکێك، نزیکەی بیست ساڵ بوو(١٠٠- ١٢٠ك)، کە نووسینەوە لە دووتوێی پەرتووکێکدا بڵاوبووەوە، تاکو ڕێکخستن و دەروازەدانان دەرکەوت لە ماوەی ساڵانی (١٢٠-١٥٠ك) واتە: نزیکەی سی ساڵ.

**بەناوبانگترین زانایانی ئەم قۆناغە کە بە ئەرکی نووسینەوە و ڕێکخستن هەڵسان:**

**١. ئیبن جورەیج (٨٠-١٥٠ك):**

یەکەم کەس بووە کە پەرتووکی داناوە و ڕێکیخستووە لە مەککە[١]، یەکێك بوو لە قوتابییە گەورەکانی زوهری، بە پەرتووکەکانی ئەویان دەوت: (کتب الأمانة)[٢]، بەناوبانگترینیان (الجامع)، یاخود (السنن) بوو[٣].

عەبدولڕەزاقی سەنعانی لەبارەیەوە دەڵێت: "یەکەم کەس کە دەروازەدانانی دانا، ئیبن جورەیج بوو"[٤]، لە تەمەنی چل ساڵی بوو کە پەرتووکی بە دەروازەدانانەوە نووسی، هەروەك ئەمە نەریتی زانایانی ئەم ماوەیە بوو، واتە نزیك ساڵی (١٢٠ك).

پەرتووکەکانی لەنێو زانایانی سەدەکانی دووەم و سێیەم و چوارەم دەستاودەستی پێدەکرا. بەناوبانگترین کەس کە پەرتووکەکەی (الجامع)ی

---

١- علل ابن المديني (ص: ٣٧)، والعلل لأحمد (٣١١/٢)، وتذكرة الحفاظ (١٦٩/١).

٢- علل أحمد (٢٣٩/٣).

٣- الرسالة المسطرفة (ص: ٣٤)، هەروەها بڕوانە: تأريخ التراث العربي (١٦٦/١).

٤- السير (١١١/٧).

گێڕاوەتەوە، قوتابیەکەی حەجاجی کوڕی موحەمەد بوو (٢٠٦ك کۆچی دوایی کردووە) کە پەرتووکەکەی لەبەردەستدابوو[١]. ئیبن نەدیم لە سەدەی چوارەمی کۆچی بینیویەتی[٢]، باس دەکات کە بەشێوەی دەروازەدانانی فیقهی ڕێکخراو بوو – هەروەك کتێبەکانی (السنن) – وەك؛ دەروازەکانی: تەهارەت، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات... تاد.

پەرتووکی زۆر بەناوبانگی هەبوو هەموو ئەو فەرموودانەی کە لە مامۆستاکانی گوێبیست بووبوو تێیدا کۆکردبوونەوە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (٢٤١ك کۆچی دوایی کردووە) پەرتووکەکانی ئیبن جورەیجی بینیوە[٣] دەڵێت: "پەرتووکەکانی ئیبن جورەیج هەموو فەرموودەکانی خۆی تێدابوون..."[٤].

یەحیای کوڕی قەتتان – مامۆستای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل – پەرتووکی ئیبن جورەیجی لەبەرگرتەوە و هەموو ڕۆژێکیش پەنجا فەرموودەی بۆ دەخوێندەوە.

پاش ئەمە پەرتووکەکانی ئیبن جورەیج – هەروەك هەموو نووسراوەکانی ئەم قۆناغە بەمشێوەیەبوون – بوونە بەشێك لەو پەرتووکانەی کە لە قۆناغی چوارەم نووسرانەوە، بەشێوەیەك هەموو نووسراوەکانی پێش خۆیان لەخۆگرت، لەبەر ئەوە گێڕانەوە و فەرموودەکانی ئیبن جورەیج لە دوو توێی شەش پەرتووکەکە (الكتب الستة) و موسنەدانەدا و جیا لەمانەش لە پەرتووکەکانی فەرموودە کە دواتر نووسران هەبوون[٥]، لەوانەیە هەندێ لە پەرتووکەکانیشی تا ئێستا

---

١– العلل لأحمد (٥٥١/٢)، هەروەها بڕوانە: تذكرة الحفاظ (١٧٠/١)..

٢– الفهرست (ص: ٢٢٦).

٣– علل ابن أبي حاتم (٤٠٨/١) رقم (١٢٢٤).

٤– علل أحمد –رواية أبي داود – (ص: ٣٥٠).

٥– سير الأعلام (٣٣٢/٦).

دەستنووس بن[1]. هەروەك دۆخی زۆرێك لە دەستنووسە كۆنەكان بەمشێوەیەیە، تا دواتر لە دونیای چاپەمەنی دەركەوتن، پاش ئەوەی ون و نادیار بوون. پەرتووكە دەستنووسەكان بە نزیكەی ملیۆنێك تا سێ ملیۆن دەستنووس ئەندازە دەكرێت كە هێشتا نەكەوتوونەتە بەر دیدی خوێنەران، كە دەكاتە نزیكەی ٨٥٪ لە پەرتووكەكانی كەلتووری ئیسلامی[2].

### ٢. سەعیدی كوڕی ئەبی عەروبە (٨٠- ١٥٦ك):

یەكێك بوو لە زانا گەورەكانی شاری بەسرە، یەكەم كەس بوو كە پەرتووكێكی دەروازەدانراوی بەش بەشی فەرموودەی دانا[3] لەگەڵ حەممادی كوڕی سەلەمە، دانراوی زۆری هەن، زۆرێك لە قوتابیانی لێیان گێڕاوەتەوە و نووسیویانە، بەناوبانگترینیان عەبدولوەهابی خەففافە (٢٠٤ك)[4]، یەكێك لە قوتابیەكانی سەعید: یەزیدی كوڕی زەریع بوو، كە هەموو فەرموودەكانی لەبەر كردبوو[5]. زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت: "زانایەكی خەڵكی بەسرە بوو، یەكەم كەس بوو كە فەرموودەی وەك دەروازەبۆدانراو و بەش بەش نووسییەوە"[6].

ئیبن نەدیم پەرتووكی سەعیدی بە(السنن) ناوبردووە[7]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕێكخراوە لەسەر چەندین بەش و دەروازەی فیقهی، لە سەدەی

---

١- دكتۆر ئەعزەمی بەشێك لە پەرتووكەكانی ئیبن جورەیجی دۆزیوەتەوە، بڕوانە: دراسات في السنة (٤٧١/٢).

٢- أهمية المخطوطات الإسلامية (ص: ١٧) مقالة بقلم جورج مقدسي، طبعة سنة ١٩٩٢م، نشر مؤسسة الفرقان للتراث الإسلامي- لندن.

٣- علل ابن المديني (ص: ٣٧)، وعلل أحمد (٣١١/٢).

٤- طبقات ابن سعد (٢٠٤/٧)، وسير الأعلام (٤١٧/٦).

٥- علل أحمد (٣٥٧/٢).

٦- سير الأعلام (٤١٣/٦).

٧- الفهرست (ص: ٢٢٧).

چـوارەم ئـەم پەرتووکـە هـەبووە و ئـیبن نـەدیم بینیویـەتی، کـە لـە پێشـەکی پەرتووکەکەی دەڵێت: "ئەمە پێڕستی پەرتووکەکانی هەموو گەلانە لە عـەرەب و عەجەم کە بە زمانی عـەرەبی نووسـراون.. تـا ئـەم سـەردەمەمان، ئێسـتا سـاڵی سێســەد و حــەفتا و حــەوتی کۆچــییە"[1]. هــەروەها پــەرتووکێکی لــەبارەی (تەلاّق)ەوە نووسیوە[2].

سەعید یەکێك بوو لە گەورە قوتابیانی قەتادە، هەر شتێکی لێیەوە گوێبیست بووبووایە دەینووسییەوە[3]، هەممامی کوڕی یەحیای هاوەڵی کتێبێکی قەتادەی لابوو، داوای لێکرد کە دانەیەکی لەبەر بگرێتەوە و ئـەویش ڕێگـەی پێـدا و دواتـر دانەیەکی لەبەرگرتەوە[4].

### ٣. موحەمەدی کوڕی ئەبو زیئب (٨٠–١٥٨ك):

یەکێك بوو لە گەورە زانایانی مەدینە، هەروەها لـە سـەردەمی مـالیکی کـوڕی ئەنەسدا دادوەر بووە،(الموطأ)ی پێش (موطأ)ی مالیك نووسی، ئیبن حەزم باسی ئەم پەرتووکەی کردووە، بە یەکێك لە پەرتووکە گرنگەکانی فەرموودەی هـەژمار کردووە[5]، ئەمەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی لـە سـەدەی شەشـەمی کۆچـیدا لـە ئەندەلوس هەبووە، لە (موطأ)ی مالیك گەورەتربووە[6]، ئیبن نەدیم بـە (السـنن) ناوی بردووە، دەڵێت: پەرتووکێکی ڕێکخراو بوو بە چەندین دەروازەی فیقهی[7].

---

١– الفهرست (ص: ٢).

٢– علل أحمد (١/٣١٨).

٣– علل أحمد –رواية المروذي (ص: ٥٢).

٤– طبقات ابن سعد (٧/٢٠٤)، هەروەها بڕوانە: تأريخ التراث العربي (١/١٦٧).

٥– سير الأعلام (١٨/ ٢٠٣)، هەروەها بڕوانە: علل أحمد (١/٣٥٤).

٦– الرسالة المستطرفة (ص: ٩).

٧– الفهرست (ص: ٢٢٥).

### ٤. عەبدولڕەحمانی کوڕی عەمری ئەوزاعی (٨٨-١٥٦ك):

شەرعناسێکی خەڵکی شام بوو، یەکەم کەس بوو کە پەرتووکی ڕێکخراوی لە چەندین دەروازەدا دانا لە شام[١]، کاتی لەدایکبوونی لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵان بوو[٢]، قوتابی زوهری و یەحیای کوڕی ئەبی کەسیر بوو، هەریەکێکیان سەحیفەیەکیان بە ئەوزاعی دا کە فەرموودەی تێدابوون، هەروەها ڕێگەیان پێدا کە لەم سەحیفانەوە فەرموودە بگێڕێتەوە، دەیوت: "کاری پێدەکەین، لێیەوە ناگێڕینەوە"[٣]، چونکە ئەم سەحیفانەی بۆ نەخوێندبوونەوە، بۆیە ڕازی نەبوو کە لێیانەوە بگێڕێتەوە[٤].

هەروەها دەڵێت: "ئەم زانستە شکۆدار بوو، کەسەکان بە یەکتریان دەگەیاند، کاتێك خرایە ناو پەرتووك، ئەوا کەسی نا شایستە تەداخولیان تیاکرد"[٥].

ئەوزاعی هەر لە بچوکییەوە زۆرێك لە فەرموودە و سوننەتی نووسیوەتەوە، لە یەحیای کوڕی ئەبی کەسیری مامۆستایەوە چواردە پەرتووکی نووسیوەتەوە، پاشان سووتان[٦]، ئەوزاعی مەزهەبێکی فیقهی هەبوو وەك چوار مەزهەبە فیقهییەکانی تر، لە شام و ئەندەلوس شوێنکەوتەی هەبوون، دواتر نەماون[٧]، ئیبن نەدیم چاوی بە پەرتووکەکەی کەوتووە (السنن في الفقه)[٨].

---

١- علل ابن المديني (٣٧-٣٩)، وسير الأعلام (١٢٨/٧)، والرسالة المستطرفة (ص: ٩).

٢- سير الأعلام (١٠٨/٧).

٣- سير الأعلام (١١٤/٧).

٤- بڕوانە: الكفاية للخطيب البغدادي (ص: ٣٤٨) بابەتی (الإجازة وأحكامها).

٥- سير الأعلام (١١٤/٧).

٦- سير الأعلام (١١٠/٧).

٧- سير الأعلام (١١٧/٧).

٨- الفهرست (ص: ٢٢٧).

### ٥. موعەممەری كوڕی ڕاشیدی یەمانی (٩٥– ١٥٢ك)[١]:

یەكێك بووە لە گەورە قوتابیانی زوهری، پەرتووكی (الجامع)ی نووسیوە، كە كۆنترین پەرتووكە كە بە ئێمە گەیشتووە، ژمارەی ئەو فەرموودانەی ئەو بەرگەی كە هەیە نزیكەی (١٦١٣) فەرموودەی پێغەمبەرە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) ، هەروەها ئەسەری هاوەڵان و شوێنكەوتووانی تێدایە، بەسەر چەندین بەش و دەروازەدا دابەش بووە. زەهەبی مێژوونووس (٧٤٨ك – ١٣٧٤ز كۆچی دوایی كردووە) سێ بەرگی پەرتووكی (الجامع)ی لابووە[٢]، دواتر بەم دواییانە دۆزراونەتەوە، لە كۆتایی (مصنف)ی[٣] عەبدولڕەزاق چاپكراوە، كە قوتابی موعەمر بوو.

عەبدولڕەزاق سەنعانی (٢١١ك كۆچی دوایی كردووە) لە موعەممەری كوڕی ڕاشیدی مامۆستای نزیكەی هەزار فەرموودەی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) و وتەی هاوەڵان و ئەوانی دوای ئەوانیشی نووسیوەتەوە، عەبدولڕەزاق زۆربەیانی لە (المصنف)دا نووسیوەتەوە، كە نزیكەی (٢٠٠٠٠) گێڕانەوە لەخۆدەگرێت. موعەممەری كوڕی ڕاشید یەكەم كەس بوو لە یەمەن پەرتووكی فەرموودەی نووسیوەتەوە[٤]، لە تەمەنی چواردەساڵیدا(١١٠ك)[٥] دەستی بە كۆكردنەوەی سوننەت و فەرموودە و دواتر نووسینەوەیان. یەحیای كوڕی ئەبو كەسیری مامۆستای هانی دەدا لەسەر نووسینەوەی[٦]، وا دەرەكەوێت كە زۆر

---

١– بڕوانە: علل .الترمذي، لە كۆتایی (السنن) (٥/٦٩٥)، وفتاوى ابن تيمية (٣٢٢/٢٠)، ومقدمة فتح الباري (ص: ٦).

٢– سير الأعلام (١١٤/٧).

٣– لە (١٠/ ٣٧٩)ەوە دەست پێدەكات بۆ (٤٧١/١١).

٤– علل ابن المديني (ص: ٣٧)، وتذكرة الحفاظ (١٩١/١).

٥– السير (٦/٧).

٦– السير (٩/٧).

سوودی له ڕێگەی زوهری مامۆستای وەرگرتبێت لـه نووسـینەوەدا و گەشەشـی پێداوە، لەبەر ئەوە زەهەبی وەسفی موعەممەری کردووە کە جوان دەنوسێت.

لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: "زانستم لای زوهری خوێند، کاتێك تـەواوبووم وتم: بەمشێوەیە لە تۆوە بگێڕمەوە؟ وتی: جیا لە من کێ ئەمانەی پێ وتویت؟!"[1].

موعەممەر بۆ ئەوە ئەم پرسیارەی لە زوهری مامۆستای کرد، چونکە زۆرێك لـه زانایانی سەدەی یەکەم و دوووەم بەو گێڕانەوەیـه ڕازی نـەدەبوون کـه کەسێك بێت پەرتووك، یاخود گێڕانەوەکە بۆ مامۆستاکەی بخوێنێتـەوە، بـەڵکو بـه مـەرجگیراوە کە مامۆستاکە بۆخۆی پەرتووکەکەی بـۆ قوتابیـەکان بخوێنێتـەوە و قوتابیـەکانیش گـوێی بـۆ بگـرن، چـونکە لەوانەیـە قوتابیەکـە لـه کـاتی خوێندنـەوەی پـەرتووکی مامۆستاکەی هەڵە بکات، بـەبێ ئـەوەی مامۆستاکە ئاگـاداری هەڵەکـە بێـت – وەك ئـەوەی مامۆسـتاکە بێئاگـا و خـەواڵو بێـت لـه کـاتی خوێندنـەوەی قوتابیەکـە – بـه پێچـەوانەوە، بـەڵکو ئەگـەر مامۆسـتاکە خـۆی ئـەو نووسـینەوەیە بـۆ قوتابیـەکانی بخوێنێتەوە، ئەو کاتە هۆشیار و ئاگادار دەبێت لەوەی دەیخوێنێتەوە[2].

ئەم پرسیارە جەخت لەسەر ئاستی مکوڕبوونی زانایانی فەرموودە دەکاتـەوە لەسەر ڕەچاوکردنی مەرجەکانی گێڕانەوەی فەرموودە، هەروەها بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کـه زوهـری هەنـدێك پـەرتووکی فـەرموودەی هـەبوو، خـەڵکی بۆیـان دەخوێندەوە، هەر لە سەرەتای سەدەی دووەمی کۆچی پـاش ئـەوەی عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز داوای نووسـینەوەی فـەرموودەی لـێ کـرد، دواتـر ئـەم نووسـینانە و پەرتووکانـە بوونـە بەشـێك لـه پەرتووکـەکانی قوتابیەکـەی وەك موعەممـەر، کـه داوای لـه زوهـری کردبـوو لـه پـەرتووك و نووسـینەکانی ئـەو بگێڕێتەوە و بۆ خەڵکی ڕیوایەت بکات، ئەویش ڕێگەی پێدا.

---

١– المعرفة والتأريخ (ص: ٨٢٧).

٢– بڕوانە: فتاوى ابن تيمية (١٨/ ٢٨ –٣١) دەربارەی ئەم بابەتە.

### ٦. شوعبەی کوڕی حەججاج (٨٣– ١٦٠ک):

یەکێك بوو لە زانایانی فەرموودە لە عێراق لە سەردەمی خۆی، یەکێك بوو لە موحەقیقە توندگیرەکان لە ڕەخنەگرتن لە گێڕانەوەکان[١].

یەکەم کەس بوو کە فەرموودەی بە ڕێکخراوی لە چەندین بەش و دەروازە لە بەسرە نووسیوەتەوە[٢].

زۆرێك لە قوتابییەکانی ئەو فەرموودانەی ئەویان نووسیوەتەوە کە بۆیانی دەخوێندەوە[٣]، سەعدی کوڕی ئیبراهیم هەموو فەرموودەکانی نووسیوەتەوە[٤]. هەروەها ئادەمی کوڕی ئەبو ئیاسی قوتابی (٢٠٠٠) فەرموودەی لێوە نووسیوەتەوە[٥]. هەروەها عەلی کوڕی جەعد(١٢٠٠) فەرموودەی لێوە نووسیوەتەوە[٦].

گرنگترین قوتابیشی موحەمەدی کوڕی جەعفەر بوو، کە بیست ساڵ هەموو کات لەگەڵ شوعبە بوو، فەرموودە و نووسینەکانی لەبەرکردبوون[٧]. پاش نووسینەوەی نیشانی شوعبەی دەدا و دواتر بۆی دەخوێندەوە[٨].

هاشیمی کوڕی قاسم پەرتووکێکی لابوو کە شوعبە پێی وتبووەوە، نزیکەی (٨٠٠) فەرموودە دەبوو[٩]، هەروەها قوتابی هەبوون ڕاستەوخۆ لە کۆڕەکەیدا لە

---

١– تأريخ بغداد (٢٥٧/٩)، وتهذيب التهذيب (٣٤٥/٤).

٢– مقدمة الجرح والتعديل (١٢٩).

٣– الجرح والتعديل (٢٦٨/١).

٤– تأريخ بغداد (٢٦٠/٩).

٥– تهذيب التهذيب (١٩٦/١).

٦– تأريخ بغداد (٣٦٣/٩).

٧– علل أحمد (٤٥٢/٢).

٨– تهذيب التهذيب (٩٧/٩).

٩– تأريخ بغداد (٦٥/١٤).

کاتی وتندا فەرموودەکەیان لەبەردەکرد[1]. شوعبە پێی باش نەبوو قوتابیە باشەکانی لە لەبەرکردندا فەرموودەکانی بنووسنەوە[2]، چونکە دەیویست فەرموودەکان لە مێشك و دڵیاندا لەبەربکەن وەك قورئانی پیرۆز، بەڵام ڕێگەی بە ئەوانی تر دەدا کە فەرموودەکان بنووسنەوە[3].

هەموو ئەو قوتابیانەی کە لە شوعبەوە فەرموودەیان نووسیوەتەوە، مامۆستای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوون[4].

### ٧. سوفیانی سەوری (٩٧- ١٦١ك):

یەکێك بوو لە گەورە زاناکانی فەرموودە لە عێراق، یەکەم کەس بوو پەرتووکی ڕێکخراوی لە چەندین بەش و دەروازە نووسی [5]، سی هەزار فەرموودەی لە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و هاوەڵان و شوێنکەوتووان لەبەربوو[6].

بەناوبانگترین پەرتووکی (الجامع)ە[7]، لەوانەی کە لێیان گێڕاوەتەوە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدولڕەحمانی ئەشجەعی قوتابی بوو (١٨٢ك کۆچی دوایی کردووە)[8].

---

١- سير الأعلام (٣٤٣/١٠).

٢- علل أحمد (٢٦١/١)، ورواية المروذي (٤٤).

٣- سير الأعلام (٣٤٣/١٠).

٤- سير الأعلام (١٨١/١١)، وتأريخ التراث العربي (١٦٨/١).

٥- علل ابن المديني (٣٩).

٦- تذكرة الحفاظ (٢٠٦/١).

٧- علل أحمد (٥٥٠/٢)، والسير (٢٣٠/٧)، والرسالة المستطرفة (٩)، و (٤١).

٨- السير (٥١٥/٨).

سەوری بە لەبەرکردن و چاکخوێندنەوە بەناوبانگ بوو، ئەوەشی کە لەبەریدەکرد هیچ هەڵەی تێدا نەدەکرد[1]، ئەمەش تەنها بەهۆی ئەوەوە بوو کە دەگەڕایەوە بۆ پەرتووك، (هەروەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێت)[2].

هەروەها زۆر ورد بوو کاتێك فەرموودەیەکی بەلەبەر ڕیوایەت دەکرد، ئەگەر لە وێژەیەك دوودڵ بووایە، ئەوا دەوەستا و نەیدەهێشت قوتابیەکانی فەرموودەکە بنووسنەوە، لەبەر ئەوەی تەنها لە یەك وشە دوودڵ بوو[3].

داوای لە قوتابیەکانی دەکرد ئەو فەرموودانەی نووسیویانەتەوە بۆی بخوێننەوە، تاکو لە دروستیی نووسینەوەکە دڵنیاببێتەوە، پاشان هەڵەکان دەستنیشان بکات و ڕاستیان بکاتەوە[4].

پەرتووکەکانی لە سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی لەبەردەستی خەڵکی بوون[5].

ئیبن نەدیم کتێبەکانی بینیوە و لەبارەیانەوە دەڵێت: "پەرتووکێکی هەبوو بەناوی (الجامع الكبير)، وەك کتێبی فەرموودە وابووە، کۆمەڵێك کەس لێیان گێڕاوەتەوە، هەروەها (الجامع الصغير)، ئەویش کۆمەڵێك گێڕاویانەتەوە، لەوانە ئەشجەعی، هەروەها(كتاب الفرائض)"[6].

---

١- الجرح والتعديل (٦٢/١).

٢- علل أحمد (٢٣٨/٣).

٣- الجرح والتعديل (٦٧/١).

٤- الجرح والتعديل (٨٠/١).

٥- بڕوانە: الإرشاد للخليلي (٦٦١/٢)، و (٧٠٤/٢)، و (٧٥١/٢). وتوضيح المشتبه، محمد بن أبي بكر ناصر الدين الدمشقي، ط١، سنة ١٩٩٣م، (١٨١/٤)..

٦- الفهرست (ص: ٢٢٥).

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل چاوی بە پەرتووکی ئەشجەعی کەوتووە، لەبارەیەوە دەڵێت: "هەر لە کۆڕەکەیدا لە سەوریەوە دەینووسییەوە، بۆیە فەرموودەکانی ڕاستن"[1].

واتە: ئەوەی سەوری لە کۆڕەکە پێی دەوتن ڕاستەخۆ ئەشجەعی دەینووسییەوە، لەبەر ئەوە نوسخەکەی ئەو ڕاستکراوەیە، کاتێکیش یەحیای قەتتان داوای لە سەوری کرد، کە فەرموودەیان بۆ بگێڕێتەوە، سەوری فەرمانی پێکرد کە بچێت بۆ کوفە، تاکو پەرتووکەکانی لای ئەشجەعی بێنێت، دواتر لەو پەرتووکانەوە فەرموودەیان بۆ باس بکات[2].

### ٨. زائیدەی کوڕی قودامە (١٦٠ك کۆچی دوایی کردووە):

یەکێك بوو لە گەورە زانایانی فەرموودە و متمانەپێکراوەکان لە کوفە[3]، یەکێك بوو لە هاوەڵانی سوفیانی سەوری لە کاتی فەقێیەتیدا[4]، پەرتووکی (المصنف)، یاخود (السنن)ی لەبارەی فەرموودەوە نووسیوە. معاویەی کوڕی عەمر (٢١٥ك کۆچی دوایی کردووە) قوتابی بووە، لە بەغدا پەرتووکەکانی زائیدەی دەگێڕایەوە، لەوانەش (المصنف)[5].

ئیبن نەدیم بینیویەتی، وەسفی کردووە و وتویەتی: "پەرتووکێکی هەبووە بەناوی (السنن)، هەموو ئەو فەرموودانەی لەخۆدەگرێت کە لە پەرتووکەکانی (السنن)دا هەن و پەرتووکی (القراءات) و پەرتووکی (التفسیر)..."[6].

---

١- علل أحمد - رواية أبي داود - (١٧٥)، و (٣٦٧) .

٢- علل أحمد (١/ ٢٦٧).

٣- تهذيب التهذيب (٣/ ٣٠٥).

٤- مقدمة الجرح والتعديل (٧٨).

٥- طبقات ابن سعد (٧/٢٤٥).

٦- الفهرست (٢٢٦).

واته: ڕێکخراو بوو لەسەر چەندین دەروازە و بابەتی فیقهی، وەك تەهارەت و نوێژ و ڕۆژوو... تاد. پەرتووکەکانی خۆی بۆ سەوری خوێندۆتەوە، بۆ ئەوەی هەموو هەڵە و کەم و کوڕییەکان ڕاستکاتەوە[1]، لەبەر ئەوەی ئەم دوانە لە هەمان مامۆستا گوێبیستی فەرموودە بوون و نووسیویانەتەوە، لە زۆرێك لە مامۆستاکانی کوفە هاوبەش بوو.

**٩. حەممادی کوڕی سەلەمەی بەسری (٩٠– ١٦٧ك):**

یەکەم کەس بوو پەرتووکی ڕێکخراوی لە چەندین بەش و دەروازە لەگەڵ ئیبن ئەبی عەروبە لە بەسڕە نووسیووە[2].

بەناوبانگترین پەرتووکی (المصنف)ـە، لەو سەردەمدا زۆر بەناوبانگ بوو گەلێك دەستاودەستی پێدەکرا، دارەقوتنی (٣٨٥ك کۆچی دوایی کردووە) بینیویەتی، لەبارەی فەرموودەیەك کە ناکۆکی لەسەر بوو دەیوت: "ئەم فەرموودەیە لە موسەننەفەکانی حەممادی کوڕی سەلەمەدا نییە)[3].

شەرعناس و فەرموودەناس موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای بورزی (٤٣٠ك کۆچی دوایی کردووە) (المصنف) یاخود (الجامع)ی بۆ فەرخانی کوڕی ئەحمەدی مامۆستای خوێندۆتەوە[4].

ئەم(موسەنەف) گەیشتە وڵاتی ئەندەلوس، ئیبن حەزم (٤٥٦ك) باسی کردووە، بە یەکێك لە پەرتووکە گرنگەکانی فەرموودەی هەژمارکردووە. ئەمەش

---

١– بڕوانە: سير الأعلام (٩/١٨٤).

٢– علل ابن المديني (٣٧)، وعلل الترمذي (٥/٦٩٤)، وتذكرة الحفاظ (١/٢٠٣).

٣– سنن الدارقطني (١/٧٧).

٤– التدوين في تأريخ قزوين (١/٤٢٢)، هەروەها بڕوانە: (٢/٤٠٥).

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چاوی پێکەوتووە و بینیویەتی[1]. ئیبن نەدیم بە(سونەن) ناوی بردووە[2].

ئەم پەرتووکە کە(موسەنەف)ـە، ڕێکخراوە لەسەر چەندین دەروازە و بەشی فیقهی، کۆکەرەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) و وتەی هاوەڵانە[3]. پەرتووکەکانی حەممادی کوڕی سەلەمە گەلێك زۆرن، ئیبن عەدی لەبارەیەوە دەڵێت: "چەندین موسەنەف و پەرتووك و شێخی زۆری هەبوونە"[4].

قوتابیە لەبەرکارەکەی: هەدبەی کوڕی خالیدی بەسری (٢٣٠ك کۆچی دوایی کردووە) دوو دانەی لەبەرگیراوی لە فەرموودەکانی حەمماد هەبوو، یەکێکیان لەسەر ناوی شێخەکان ڕێکخراو بوو، ئەوەی تریشیان لەسەر دەروازەی فیقهییەکان)[5].

قوتابیە لەبەرکارەکەی: عەففانی کوڕی موسلیم (٢١٩ك کۆچی دوایی کردووە)، دوو هەزار فەرموودەی لەوەوە نووسیویەتیەوە[6].

یەکێکی تر لەوانەی کە (موسەنەفەکان)ی حەممادی کوڕی سەلەمەی خوێندووە: قوتابیە لەبەرکارەکەی موسای کوڕی ئیسماعیل بوو (٢٢٣ك کۆچی دوایی کردووە)[7].

---

١- بڕوانە: سير الأعلام (٢٠٣/١٨).

٢- الفهرست (ص: ٢٢٧).

٣- الرسالة المستطرفة (٦٠ -٦١).

٤- الكامل - ابن عدي - (٢٦٢/٢).

٥- الكامل - ابن عدي - (١٣٨/٧).

٦- تهذيب الكمال (١٧٢/٢٠).

٧- تذكرة الحفاظ (٣٩٤/١).

هـەروەك پـەرتووك و نووسـینەكانی سـەعیدی كـوڕی ئـەبی عەروبـە بـە ئێمـە نەگەیشـتوون، بەهــەمان شـێوەش هـی حـەممادی كـوڕی سـەلەمەش بـە ئێمـە نەگەیشتوون، هەر دووكیان خەڵكی شاری بەسـڕەی عێراقـی بـوون، لـەو كاتـەی كتێبی (جامع)ی معەممەڕی كوڕی ڕاشید بە ئێمە گەیشتووە، كە لەوان كـۆنترە، هەروەها(موطأ)ی مالیكیش بە ئێمە گەیشتووە، كە لە سەردەمی ئـەوان بـووە و لە هەمان ماوەدا بووە.

لەوانەیە هۆكارەكە جەنگی مەغۆلەكان بووبێـت، كـە ڕۆژهـەڵاتی گرتـەوە، تـا گەیشتە بەغداد، لـە سـاڵی (٦٥٦ك) بەغـدادیان گـرت[١]، هــەموو پەرتووكخانـە و پەرتووكەكانیان لەناوبرد، تەنها بەشێكی زۆر كەمیان سەلامەت دەرچوون، یاخود ئەوانە نەبێت كە دانەی لەبەرگیراویان لەو وڵاتانە بوون، كـە سـوپای مەغۆلـەكان پێی نەگەیشتبوو. ئەمەش بە پێچەوانەی یەمـەن و دوورگـەی عـەرەبی، كـە لـەم جەنگە كاولكارانە پارێزراو بوون.

لەگــەڵ ئــەوەش ئــەو ئەگــەرە هــەر بــوونی هەیــە، كــە ڕۆژێــك بەشـێك لــە نووســراوەكانی حــەممادی كــوڕی ســەلەمە و ســەعیدی كــوڕی ئــەبو عەروبــە بدۆزرێنەوە[٢] لەو گەنجینانەی كە دەستنووسیان تێدان، كـە لـە هـەموو وڵاتانـدا بڵاوبوونەتەوە. بۆ زانیاری ئەوەی ئەو فەرموودانەی لە پەرتووكەكانی حـەمماد و سەعید هەبوون، لە قۆناغی چوارەمدا بوونە بەشێك لە پەرتووكەكانی فەرموودە، لەبـەر ئـەوە دەبیـنین فـەرموودەكانی حـەممادی كـوڕی سـەلەمە لـە شـەش

---

١- بڕوانە: البدایة والنهایة - ابن كثیر - (٢١٤/١٣) حوادث سنة ٦٥٦هـ، ط٤، ١٩٨٢، دار المعارف- بیروت..

٢- هەندێك دەستنووسی نووسراوەكانی سەعیدی كوڕی عەروبە دۆزرانەوە، هەروەها دكتۆر ئەعزەمی دانەیەكی دەستنووسی لە پەرتووكی (المناسك)ی سـەعیدی كـوڕی ئـەبی عەروبـە هەیـە، دراسـات في الحدیث (٤٧١/٢)..

پەرتووکەکانی فەرموودەدا، گەیشتوونەتە چوارسەد و یازدە(٤١١) فەرموودە، بەبێ دووبارەبوونەوە[1]، بە دووبارەبووەکانیشەوە دەگەنە هەزار (١٠٠٠) گێڕانەوە، سەبارەت بە موسنەدی ئەحمەدیش، زۆربەی گێڕانەوە دروست و سەحیحەکانی حەممادی کوڕی سەلەمەی تێدان، کە دەگاتە (١٥٤٢) هەزار و پێنجسەد و چل و دوو گێڕانەوە.

**١٠. هەروەك لەم قۆناغەدا ئەمانەش دانراو و نووسینیان دانا:**

**لەیسی کوڕی سەعد** (٩٤ – ١٧٥ك)، پێشەوا و موفتی خەڵکی میسڕ بوو، هاودەم و هاوەڵی مالیکی کوڕی ئەنەس.

دوو پەرتووکی لابوون، کە لە مامۆستاکەی ئەبی زوبەیری مەکییەوە وەریگرتبوون، ئەو دوو پەرتوکانە چەند فەرموودەیەکیان تێدابوو، کە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵای هاوەڵی پێغەمبەر (درورد و سڵاوی خودای لێبێ) وەریگرتبوون[2]، پەرتووکی زۆری نووسیوە، زەهەبی لەبارەیەوە وتویەتی: "پێشەوا و باوەڕپێکراو، چەندین پەرتووکی ڕێکخراوی هەن"[3]. چۆتە عێراق و فەرموودەی لەوێ دەگێڕایەوە لە ژوورێك کە لە ماڵێکی بەرز دابوو دادەنیشت، قوتابیە فەرموودەناسەکانیشی لە خوارەوە دادەنیشتن فەرموودەیان دەنووسییەوە، ئەویش لە پەرتووکەکانی بۆی دەوتنەوە، کاتێك لە خوێندنەوەکە تەواو دەبوو، ئەوا پەرتووکەکەی پێدەدان و ئەوانیش لەبەریان دەگرتەوە[4].

١- رسالة (الإختلاف على الراوي) للباحث (١٣١٢/٣).

٢- سير الأعلام (١٥٩/٨).

٣- تذكرة الحفاظ (٢٢٦/١).

٤- سير الأعلام (١٥٣/٨).

لــەبارەی خۆیــەوە دەڵێــت: "زانســتێکی زۆرم لــە زانســتی ئــیبن شــیهاب نووسیووەتەوە"[1]. ساڵی (١١٣ك) لە مەککە چاوی کـەوتووە بـە ئـیبن شـیهابی مامۆستای، کاتێك کە چووە بۆ حەج و تەمەنی ٢٠ ساڵان بوو، لە ئیبن شـیهاب و ئەبو زوبەیری مەککی و نافیعی خزمەتکاری ئـیبن عومـەر گوێبیسـتی فـەرموودە بووە[2]. ئەوانیش لە هاوەڵانەوە گوێبیستی فەرموودەببوون و ڕاستەخۆ لەوانەوە نووسیبویانەوە.

## ١١. ئەبو عەوانە وەزاحی کوڕی خالیـدی یەشـکری (١٧٥ك کۆچـی دوایـی کردووە):

یەکێك بوو لە زانایانی (واست) لـە عێـراق، یەکـەم کـەس بـوو کـە پـەرتووکی ڕێکخراوی لە ناوچەی خۆی نووسییەوە[3]، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەبارەیـەوە وتویەتی: "پەرتووکیەکانی سەحیحن"[4]، عەففانی کوڕی موسـلیم – مامۆسـتای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل – چاوی بەم پەرتووکە کەوتووە و وتویـەتی: "زۆر ورد و لێهاتوو بوو، زۆر بەڕێکی خاڵەکان خرابوونە سەر پیتەکان"[5].

زانایانی فـەرموودە لەبارەیـەوە دەڵـێن: (هـەموو ئـەو فەرموودانـەی کـە لـەم پەرتووکە هاتوون پارێزراون، ئەگەریش نەهاتبێت ئەوا پارێزراو نییە)[6].

واتــە: ئــەو فەرموودانــەی کــە لــە پەرتووکەکــەی خــۆی گێڕاویەتــەوە هاوتــا و هاوشـێوەیە لەگـەڵ ئـەو فەرموودانـەی زاناکـانی تـر گێڕاویانەتـەوە، بـەڵام ئـەو

---

١- تأريخ بغداد (١٣/٥).

٢- تأريخ بغداد (١٣/٦).

٣- علل ابن المديني (ص: ٣٨).

٤- تذكرة الحفاظ (١/٢٣٦).

٥- تذكرة الحفاظ (١/٢٣٦).

٦- طبقات ابن سعد (٧/٢١٢).

فەرموودانەی کە بە لەبەرکردن و یادگای خۆی گێڕاویەتیەوە و هەڵەی تێدا کردووە، ناکۆك بووە لەگەڵ ئەوانەی هاوپیشەکانی ئەو گێڕاویانەتەوە، لەبەر ئەوە وەرناگیرێت.

### ١٢. مالیکی کوڕی ئەنەس (٩٣– ١٧٩ك):

یەکەم کەس بوو کە پەرتووکی بە ڕێکخراوی لە چەندین بەش و دەروازە لە مەدینە نووسی[١]، ژمارەی مامۆستاکانی گەیشتە زیاتر لە سەد کەس، ژمارەی قوتابیەکانیشی گەیشتە نزیکەی (١٧٠٠) زانا و شێخ[٢]. لە مزگەوتی پێغەمبەر دادەنیشت بۆ وانەوتنەوە و فێرکردنی خەڵکی لە کاتێکدا کە تەمەنی چل ساڵ بوو[٣]. پەرتووکەکەی (الموطأ)یان لا دەخوێند[٤]. پەرتووکەکەی زۆر بەناوبانگ بوو، تاکو ئەوەی دەسەڵاتداران داوایان لێ دەکرد کە بیخوێنن لای[٥]، تا خەریك بوو خەلیفەی عەبباسی، ئەبو جەعفەری مەنسوڕ (١٥٨ك کۆچی دوایی کردووە) بیکاتە یاسایەك، دادوەرەکان پابەند بکات بەوەی کاری پێبکەن، بەڵام مالیکی کوڕی ئەنەس بەمە ڕازی نەبوو[٦].

شافیعی (٢٠٤ك کۆچی دوایی کردووە)، لەبارەی (الموطأ)ەوە دەڵێت: "سەحیحترین پەرتووکە لە دوای قورئانی پیرۆز"[٧]، ئیبن تەیمیە گوزارشتی

---

١– علل ابن المديني (ص: ٣٧)، وعلل الترمذي (٥/٦٩٤).

٢– فتاوى ابن تيمية (٢٠/٣٢٠)، وسير الأعلام (٨/٥٢).

٣– سير الأعلام (٨/٥٥).

٤– طبقات ابن سعد (٥/٤٦٧).

٥– سير الأعلام (٨/٦٦).

٦– ئیبن سەعد لە: الطبقات (٥/٤٦٨)، سير الأعلام (٨/٧٩).

٧– بڕوانە: التمهيد – ابن عبد البر – (١/ ٧٦ – ٧٧)، وتذكرة الحفاظ (١/ ٢٠٨).

شافیعی لەبارەی (الموطأ)ەوە هێناوە و دەڵێت: "قسەی شافیعی کە لەبارەی ئەم پەرتووکەوە وتویەتی ڕاستە"[1].

کۆکردنەوەی (الموطأ) و ڕێکخستنی لە چەندین دەروازەدا، نزیکەی چل ساڵی خایاند و ساڵی (١٤٣ك) کۆتایی پێهات[2]. دەیان زانا (موطأ)یان لای مالیك خوێندوە، لەوانە: شافیعی و عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی و یەحیای کوڕی یەحیا و موحەمەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی ... تاد[3].

لەناویاندا خەڵکی حیجاز و عێراق و شام و میسر و مەغریب و ئەندەلوس هەبوون، کە زیاتر لە پەنجا زانا دەبوون[4]، لەبەرگیراوەی ئەم پەرتووکە هەر لەو کاتەی ئەنەسی کوڕی مالیك لە ژیاندا بوو، لە هەموو وڵاتانی ئیسلامی بڵاوبووەوە[5]. لە سەردەمی ئەودا زانای زۆر کە خەڵکی مەدینە بوون، پەرتووکی زۆریان بە ناوی (موطأ) نووسی[6]، بەڵام ناوبانگیان دەرنەکرد وەك (موطأ)ەکەی مالیك، ئەمەش لەبەر شکۆ و پایەی ئیمام مالیك بوو.

ئیمام مالیك یەکێك بوو لەوانەی کە زۆر توندگیر بوو لە گێڕانەوەی فەرموودە، هەرگیز فەرموودەی بە مانا نەدەگێڕایەوە، بەڵکو تەنها بە پیتاوپیتی دەیگێڕایەوە[7][1].

١- فتاوى ابن تيمية (٣٢٠/٢٠).

٢- التمهيد (٧٨/١)، وإحكام الأحكام (١٣٦/٢).

٣- سير الأعلام (٨٣/٨-٨٤)، علل أحمد (٣٢١/٢)، تأريخ التراث العربي (١٣٥/١)..

٤- بڕوانە پێشەکی فوئاد عەبدولباقی بۆ (الموطأ)، ص (و).

٥- إحكام الأحكام (٢/ ١٣٧)، وفتاوى ابن تيمية (٣٢٤/٢٠).

٦- التمهيد (٨٦/١).

٧- تذكرة الحفاظ (٢١٢/١).

**قۆناغی چوارەم: دەرکەوتنی فەرهەنگ ( موسوعة )ە فەرمووده‌ییەکان[1]:**

قۆناغی دەرکەوتنی فەرهەنگە فەرموودەییەکان، - نزیکەی - لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەمی کۆچی دەستپێدەکات تا کۆتایی سەدەی دووەم (١٥٠- ٢٠٠ك)، فەرهەنگەکان دەرکەوتن، پەرتووکەکانی فەرمووده زۆر بوون، لە بابەت و ڕێکخستن و شێواز و قەبارەیان جۆراوجۆر بوون، زەهەبی ئەم قۆناغەی دیاریکردووه بەم وتەیەی: "لە ڕۆژگاری هاڕوونە ڕەشید ئەمە زیادبوو (واتە نووسینەوە لە دووتوێی پەرتووکێك)، موسەنەفەکان زیادبوون.."[2].

واتە: سەردەمی هاڕونە ڕەشید(١٧٠ك - ٢٠٣ك) سەردەمی ڕابوون و بڵاوبوونەوەی پەرتووك و نووسین بوو، لە هەموو زانستە ئیسلامی و عەرەبییەکان، لە فەرمووده و تەفسیر و فیقه و زانستی بنەماکانی فیقه و ڕێزمانی عەرەبی و ئەدەب.

زانایانی فەرمووده لەم قۆناغەدا، پشتیان بەو پەرتووك و نووسراوانە دەبەست، کە لە قۆناغی سێیەمدا دەرکەوتبوون، زانایان فەرهەنگە فەرموودەییە گەورەکانیان نووسی، کە زۆرێك لە پەرتووکەکانی ئەو سەردەمەیان لەخۆگرت. دەبینین لە قۆناغی چوارەمدا (موسەنەفەکان) و (موسنەدەکان)[3]، هەموو ئەو فەرموودانەیان لەخۆدەگرت، کە لە پەرتووکەکانی ئیبن جورەیج و مالیك و حەممادی کوڕی سەلەمە و ئەوزاعی و لەیسی کوڕی سەعد و ئیبن ئەبی

---

١- بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی نووسەرانی فەرمووده لەم قۆناغە بگەڕێوە بۆ: الفهرست (ص: ٢٢٥)، دراسات في حديث النبوي (١/٢٢١ - ٣٢٥)، کە نزیکەی باسی (٢٥٠) زانای کردووه لەوانەی لەم ماوەیەدا فەرموودەیان نووسیوەتەوە و پەرتووکیان داناوە.

٢- تذكرة الحفاظ (١/١٦٠).

٣- بڕوانە: مقدمة فتح الباري (ص: ٦).

عەروبە[1]، جیا لەمانەش کە لە زانایانی قۆناغی سێیەمدا هەبوون. ژمارەی گێڕانەوەکان لەم فەرهەنگە فەرموودەییانە تا ڕادەیەکی زۆر چەندانە بوونەوە، لەبەر ئەوەی نووسەرەکانیان لە ژمارەیەك مامۆستا گوێبیست ببوون و خوێندبوویان، کە ئەوانیش لە خاوەنی موسنەد و موسنەفەکان گوێبیست ببوون و خوێندبوویان، هەموو گێڕانەوەی ئەم مامۆستایانە لە فەرهەنگەکانی خۆیان دەیاننووسییەوە، – بۆ نموونە – دەبینین ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پەرتووکەکانی حەممادی کوڕی سەلەمە لە قوتابیەکەی حەممادی کوڕی سەلەمە خوێند یاخود گوێبیست ببوو، وەك یەزیدی کوڕی هارون و عەففانی کوڕی موسلیم و موسای کوڕی ئیسماعیلی مامۆستای[2] ...تاد، هەموو گێڕانەوەکانی ئەوانی لە (المسند) کۆکردەوە، ئەو کات فەرموودەیەك لە(موسەنەف)ی حەممادی کوڕی سەلەمە، بووە سێ فەرموودە یان زیاتر لە(مسند)ی ئەحمەددا، بە ژمارەی ئەو مامۆستایانەی کە ئیمام ئەحمەد بۆی خوێندونەتەوە یاخود ئەو لێیانەوە گوێبیست ببوو، ئەگەر فەرموودەیەك لە(موسەنەف)ی حەممادی کوڕی سەلەمە هەبووبێت، بە هەمان شێوە لە (جامع)ی ئیبن جورەیج، یاخود (جامع)ی سوفیان، یاخود (سنن)ی ئەوزاعی، یاخود (موطأ)ی مالیك، یاخود جیا لەمانەش

---

١– موسنەدی ئەحمەد (٥٩٤) فەرموودە لە فەرموودەکانی (الموطأ) و، (٦٥٥) فەرموودەی لە کتێبی ئیبن جورەیج و، (١٥٤٢) فەرموودە لە موسەنەفی حەمماد و، (٤٠٠) فەرموودە لە کتێبی ئیبن ئەبی عەروبە و، (١١٦٩) فەرموودە لە (جامع معمر) و، (٢٦٠١) فەرموودە لە کتێبی شوعبەی کوڕی حەججاج و، (١٦٢٦) فەرموودە لە (جامع الثوري) و، (١٩٤) فەرموودە لە کتێبی ئەوزاعی و، (٤٥٠) فەرموودە لە کتێبی لەیسی کوڕی سەعد و، (٢٢٤) فەرموودە لە کتێبی زائیدە و، (٢٧٧) فەرموودە لە کتێبی ئیبن ئەبی زیئب و، (٣١١) فەرموودە لە کتێبی ئەبو عەوانەی لەخۆ گرتووە، بڕوانە: موسوعة الحديث– شركة صخر العالمية.

٢– بڕوانە: الإختلاف على الراوي، هەروەها لێکۆڵینەوەیەکی پراکتیکی لەسەر ڕیوایەتەکانی حەممادی کوڕی سەلەمە لەلایەن توێژەرەوە (٩٠/١).

له نووسه‌ره‌كانی قۆناغی سێیه‌م هه‌بووبێ، ئه‌و كاته له موسنه‌دی ئه‌حمه‌ددا ده‌بوونه چوار فه‌رمووده، یان زیاتر به‌گوێره‌ی ئه‌و دووباره‌بوونه‌وه‌ی له‌و په‌رتووكانه هه‌یه، له‌وانه‌یه جارێكی تر ئه‌و ژماره‌یه چه‌ندانه ببێته‌وه، ئه‌گه‌ر ئیمام ئه‌حمه‌د دووباره له‌و په‌رتووكانه، یاخود كۆمه‌ڵێك له مامۆستاكانی گوێبیست بووبا، هه‌روه‌ك له وێنه‌ی یه‌كه‌م ڕوونمانكرده‌وه[1].

له‌به‌ر ئه‌وه زانایانی فه‌رمووده هه‌موو ڕێگه‌كان به فه‌رمووده هه‌ژمار ده‌كه‌ن، بۆ نموونه: ئه‌گه‌ر فه‌رمووده‌یه‌ك ده ڕێگه‌ی هه‌بێت، ئه‌وا به ده فه‌رمووده هه‌ژمار ده‌كرێت، به‌ڵام شه‌رعناسان به یه‌ك فه‌رمووده هه‌ژماری ده‌كه‌ن، هه‌تا ئه‌گه‌ر ئه‌و هاوه‌ڵانه‌ی كه فه‌رمووده‌كه‌یان گێڕاوه‌ته‌وه جیاوازیش بن، چونكه ئه‌وان له ده‌قه‌كه ڕاده‌مێنن نه‌وه‌ك له سه‌نه‌د و ڕێگه‌كه.

به‌م شێوه‌یه له قۆناغی چواره‌مدا په‌رتووك و نووسینی جۆراوجۆر په‌یدابوون، زانایان هونه‌ریان نواند له‌وه‌ی فه‌رمووده‌كانیان له په‌رتووكێكدا، له چه‌ندین به‌ش و ده‌روازه‌دا نووسییه‌وه. چه‌ندین موسنه‌دی وا هه‌یه، كه ته‌نها فه‌رمووده‌كانی

---

١- هه‌روه‌ك له‌و فه‌رمووده‌یه‌ی ئیبن شیهابی زوهریدا هه‌یه له ئیبن یه‌ساره‌وه له ئیبن عه‌بباسه‌وه له بابه‌تی حه‌جكردن له‌جیاتی یه‌كێكی په‌ككه‌وتوو، كه مالیك له (الموطأ)دا گێڕاویه‌ته‌وه (١/ ٣٥٩) له ئیبن شیهابه‌وه، هه‌روه‌ها ئه‌حمد له موسنه‌ددا له عه‌بدولره‌حمانی كوڕی مه‌هدی مامۆستایه‌وه له مالیكه‌وه: فه‌رمووده‌ی ژماره (٣٣٦٥)، ئه‌وه‌ی له (المسند)ایه هه‌مان ئه‌وه‌یه كه له (الموطأ)دا هه‌یه. هه‌روه‌ها ئه‌حمه‌د له موسنه‌ددا به ژماره (١٨٩٣) له سوفیانی كوڕی عویه‌ینه‌وه له ئیبن شیهابه‌وه. هه‌روه‌ها به ژماره (٣٠٤١) گێڕاویه‌ته‌وه له محه‌مه‌دی كوڕی موصعه‌به‌وه له ئه‌وزاعیه‌وه له ئیبن شیهابه‌وه. هه‌روه‌ها به ژماره (٢٢٦٦) گێڕاویه‌ته‌وه له سه‌عدی كوڕی ئیبراهیمه‌وه له باوكیه‌وه له صالحی كوڕی كه‌یسانه‌وه له ئیبن شیهابه‌وه. كه‌واته ئه‌حمه‌د ئه‌م ته‌نها فه‌رمووده‌یه‌ی چوار جار دووباره‌كردۆته‌وه له چوار سه‌رچاوه‌وه، له‌وانه (موطأ)ی مالیك كه نوسخه‌یه‌كی ده‌قاوده‌قمان بینیه‌وه تیایدا، هه‌روه‌ها ئه‌حمد گێڕاویه‌ته‌وه له‌ڕێگه‌ی ئه‌وزاعیه‌وه كه یه‌كێكه له نووسه‌ره‌كانی نیوه‌ی یه‌كه‌می سه‌ده‌ی دووه‌م، هه‌روه‌ها ئه‌حمه‌د گێڕاویه‌ته‌وه له ئیبن عویه‌ینه و صالحی كوڕی كه‌یسانه‌وه.

پێغەمبەری (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لەسەر ناوی ئەو هاوەڵانە ڕێکخرابوو کە فەرموودەکانیان گێڕابووەوە[1]، وەك موسنەدی ئیمام ئەحمەد، کە نزیکەی سی هەزار گێڕانەوەی تێدایە[2]، چاپیش کراوە.

چەندان (موسەنەف)یش هەن، کە فەرموودەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و وتەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان و بۆچوونە فیقهییەکان لەخۆدەگرێت، بە سەنەدەکانیانەوە، ڕێکخراون لە چەندین دەروازە و بەشی فیقهیدا، وەك موسەنەفی ئیبن ئەبی شەیبە (٢٢١ك کۆچی دوایی کردووە)، کە نزیکەی چل هەزار گێڕانەوە لەخۆدەگرێت، موسەنەفی عەبدولڕەزاق (٢١١ك کۆچی دوایی کردووە) کە بیست هەزار گێڕانەوە لەخۆدەگرێت، هەر دووکیشیان بەچاپ گەیەنراون.

دوای ئەم قۆناغە پەرتووکەکانی (سونەن) دەرکەوتن، کە تەنها لەسەر فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لەخۆگرتبوو – وەك لە موسنەدەکاندا بەم شێوەیە – بەڵام ڕێکخراون لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی – وەك لە موسەنەفەکاندا بەم شێوەیە – بەناوبانگترینیان شەش سونەنەکەیە: ئەبو داوود، تورمزی، ئیبن ماجە، نەسائی، دارەمی و دارەقوتنی، هەمووشیان لە چاپدراون.

خاوەنی ئەم پەرتووکانە، پشتیان بەو فەرهەنگانە بەست، کە لە قۆناغی چوارەم هەبوون.

---

١– وەك موسنەدەکانی عەبدوڵڵای کوڕی موسا، موسەدەدی کوڕی موسەرهەد، ئەسەدی کوڕی موسا، نوعەیمی کوڕی حەمماد، ئیسحاقی کوڕی راهەویە و ئیبن ئەبی شەیبە. بڕوانە: مقدمة فتح الباري (ص: ٦).

٢– بڕوانە: مقدمة مسند أحمد، تحقيق: شعيب الأرنؤوط (١/٦٠)، ط١، ١٩٩٣م، الرسالة– بيروت.

هـەروەها چـەندین پـەرتووکن هـەن، کـە فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) لەخۆدەگرێت، ڕێکخراون لە چەندین بەشی فیقهـی، لەگـەڵ بۆچوونەکانی نووسەرەکە خۆی، لەگەڵ وتەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان لە بواری فیقهدا، وەك (موطأ)ی مالیکی کوڕی ئەنەس بەم شێوەیەیە. چاپیش کراوە.

هەروەها پەرتووەکە سەحیحەکان (الصحاح)یش پەیدابوون، ئەو پەرتووکانەن کـە تـەنها فـەرموودە سـەحیحەکانی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) لـەخۆدەگرن، کـە هـەموو زانایـانی فـەرموودە لەسـەر ڕاسـتیی و دروسـتیی ئـەم فەرموودانە کـۆکن، ڕێکخـراون لەسـەر چـەندین بەشـی فیقهـی، بـەناوبانگترینیان سەحیحی بوخـاری (٢٥٦ك كۆچـی دوایـی کـردووە)، سـەحیحی موسـلیم (٢٦١ك کۆچی دوایی کردووە)... تاد.

هەروەك چەندین پەرتووکی هەمەجۆر دەرچوون، کە گرنگیان بە کۆکردنەوەی فەرموودە دەدا، بەهەمان شێوە پەرتووکی هەمەجۆر پەیـدابوون، کـە گرنگییـان دەدا بە پیاوانی گێڕەرەوەی فەرموودە، نووسینەوەی مێژووی ژیان و مردنیان و زانینی بارودۆخی زانستی و کرداریان.

پـــەرتووکی مێـــژووی گێڕەڕەوەکـــان دەرکـــەوتن، وەك: (التـــاريخ الكـــبير)ی بوخاری، (الجرح والتعديل)ی ڕازی، کە ناوی هەزاران گێڕەرەوە لەخۆدەگرێت، بە پیتـەکانی موعجـەم ڕێکخرابـوون، هـەر لەسـەردەمی هاوەڵانـەوە تـا سـەردەمی نووسەران، کە تانە و متمانەپێدان (جەرح و مەعدیل) لەبارەی گێڕەرەوەکانی تیا بوو. ئیبن سەعد پێش ئەوان لە (الطبقات)دا دەستپێشخەر بووە لەمەدا[1].

---

١– بڕوانە: الرسالة المستطرفة (ص: ٩٦– ١٠١)، ط٢، ١٩٨٠م، تصوير دار الكتب العلمية– بيروت.

پــەرتووکی تایبــەت بــە گێــڕەرەوە متمانــەپێکراوەکان دەرکــەوتن، وەك: پەرتووکی (الثقات)ی ئیبن حیبان (٣٥٦ك)، (الثقات)ی عیجلی و (الثقات)ی ئیبن شاهین[1].

هــەروەها پــەرتووکی تایبــەت بــە گێــڕەرەوە لاوازەکــان پەیــدابوو، وەك: (الضـعفاء)ی بوخـاری و نەسـائی، (المجـروحین)ی ئـیبن حیبـان، (الضـعفاء)ی عوقەیلی و (الکامل)ی ئیبن عودەی[2].

هەروەها زانایانی فەرموودە پەرتووکی تایبەتیان نووسی دەربـارەی هـاوەڵان و ناوەکانیان، ڕەچەڵەکی تیرەکانیان و مێژووی ژیانیان، وەك (الصحابي)ی ئەبی نوعەیمی ئەصفەهانی و (الاستیعاب)ی ئیبن عەبدولبەر[3].

پاشان نووسینی پەرتووکەکانی تایبەت بە ژیاننامەی زانایانی هـەر وڵاتێـك و، ژیاننامەی ئەو زانایانەی سەردانی ئەو وڵاتانەیان کردووە دەرکـەوتن، یـان پێیـدا تێپــەڕیون، بەتایبــەت فەرموودەناســان[4]، بــەناوبانگترینیان (تـأریخ بغـداد)ی خەتیبی بەغدادیـە، کـە نزیکـەی دە هـەزار ژیاننامـە لـەخۆدەگرێ، تایبەتـە بـەو زانایانەی کە هاتبوونە ناو بەغداد، هەر لـە کـاتی دروسـتبوونیەوە لـە سـەردەمی مەنسـوڕی عەبباسـی، لـە سـەدەی دووەمـی کۆچـیدا، تـا سـەردەمی خـەتیبی بەغدادی.

---

١- بڕوانە: الرسالة المستطرفة (ص: ١٠٩- ١١٠)، هەمان چاپ.

٢- بڕوانە: الرسالة المستطرفة (ص: ١٠٨-١٠٩)، هەمان چاپ.

٣- بڕوانە: الرسالة المستطرفة (ص: ٩٤-٩٦)، هەمان چاپ.

٤- زۆرن ئەوانـە، بڕوانـە: الـوافي بالوفیـات للصـفدي المـؤرخ (١/٤٧ - ٤٩) کـە لـە سەرچـاوەکانیدا ئامـاژەی پێکـردووە، هـەروەها بڕوانـە: الرسـالة المسـتطرفة (ص: ٩٨ - ١٠١)، تصـویر دار الکتـب العلمیة.

گـەورەترینیان (تـأریخ دمشـق)ی حـافیز ئـیبن عەسـاکیرە، کـە تایبەتـە بـە زانایانی دیمەشق و ئەوانەی سەردانیان کردووە، ئەوەشی کە پێیدا ڕۆیشتووە لـە فەرموودەناسان و جیا لەوانەش.

نووسینی تایبەت بە گێڕانەوە و پیـاوانی سـەنەدی فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (درووود و سڵاوی خودای لـێبێ) زۆر بـوون، تەنانـەت چـەندین جـۆر لـەو کتێبانـە پەیدا بوون، تاکو گەیشتە بیست جۆر هونەر لە هونەرەکانی زانستی فـەرموودە، هەموویان دەربارەی (پیاوانی سەنەد) بوون[1]، چەندین هونەری تری سەنەد، کە زانایانی فەرموودە بە مەبەستی زانینی دۆخـی گێڕەرەوەکـان و پیـاوانی سـەنەد نووسیویانە، تێیدا متمانەپێکراوەکانیان لە لاوازەکان جیاکردۆتەوە، هەروەها بۆ زانینی پلەی متمانەپێکراوەکان، لە وردی و لەبەرکردن و ڕێکی، بـۆ پێشخسـتنی ئەوەی شایەنی پێشخستنە لە کاتی دروستبوونی تـێکگیران لـەنێوان گێڕانـەوەی متمانەپێکراوەکانـدا. هـەروەها بـۆ زانینـی پلـەی لاوازیـی لاوازەکـان، ئەوەشـی گێڕانەوەکـەی دەسـتدەدات وەك گەواهیـدەر و پاشـکۆ، کـە زۆر جـار دەکرێـت سوودی لێوەربگیرێت، ئەوەشی کە گێڕانەوەکەی بە هیچ شێوەیەك دەستنادات. هەموو ئەمەش لـەپێناو گەیشـتن بـووە بـە ناسـین و جیاکردنـەوەی فـەرموودەی سەحیح لە فەرموودەی لاواز.

مێژوونووس سەلاحەدین سـەفدی لـەبارەی پـەرتووکی زۆری فەرموودەناسـان دەربارەی گێڕەرەوەکان دەڵێت: "سەبارەت بە پەرتووکـەکانی فەرموودەناسـان لــە ناسـینی هــاوەڵان (ڕەزای خودایــان لێبێــت)... پەرتووکــەکانی تانــە و

---

١– بڕوانە: علوم الحديث، عثمان بن عبد الرحمن بن الصلاح، تحقيق: نورالدين عتر، طبعة ١٩٨٦م، دار الفكر– بيروت.

متمانەپێــدان، ڕەچەڵكناســی، فەرهــەنگی فەرموودەناســان، مامۆســتاكانی لەبەركاران و گێڕەرەوەكان، شتێكە لە هەژمار نایەت"[1].

هەروەها پەرتووكی تایبەت هەبوونە، سەبارەت بە ڕەخنـە لـەو فـەرموودە و گێڕانەوانــە و خســتنەڕووی ڕووی هەڵــە و كــەم و كووڕیــەكانیان، ئەمانــەش پەرتووكەكانی (العلل)ن[2]، كە نووسـەرەكانیان هەڵسـاون بـە كۆكردنـەوەی ئـەو فەرموودانەی كە كەم و كووڕی ناڕوون و نادیاری تێدایە، لەگەڵ ئەوەی لە ڕووكار بـێ كـەم و كوڕییـە، بـەناوبانگترینیان پـەرتووكی (علـل الحـدیث)ی ئـیبن ئـەبی حاتەمی ڕازییە، لە چەندین دەروازەی فیقهیدا ڕێكیخستووە، تێیدا وەڵامی باوكی و مامۆسـتاكەی ئـەبی زەرعـەی ڕازی گواسـتۆتەوە لـەبارەی كـەم و كـوڕی ئـەم فەرموودانە. هەروەها پەرتووكی (العلل الكبیر)ی تـورمزی، كـە وەڵامـی بوخـاری مامۆستای لەبارەی كەم و كوڕی زۆرێك لە فەرموودەكان گواستۆتەوە.

گـەورەترین پـەرتووكی (علـل) بریتیـە لـە (العلـل)ی دارەقـوتنی، كـە لەسـەر سەنەدی هاوەڵان ڕێكیخستووە، هەموو ئەو فەرموودانەی كە هەركام لە هـاوەڵان كەم و كوڕییان تیایە بەجیا كۆی كردوونەتەوە، دواتر هەڵساوە بە ڕەخنەگرتن لە یەكـە یەكـەیان، ڕووی هەڵـە و كـەم و كووڕییـەكانی لـە وێـژە و دەقـەدا ڕوون كردۆتەوە، یاخود هەڵە لە سەنەدەكەیدا.

دوای ئەمە پەرتووكی تایبەت بە فەرموودەی لاواز و هەڵبەسـتراو دەركـەوتن، كە زانایانی فەرموودە بە لاواز دایانناوە، یاخود بە هەڵبەسـتراو، وەك پـەرتووكی (الأباطیل)ی جوزقانی و (الموضوعات)ی ئیبن جەوزی[3]. هەموو ئەو پەرتوكانەی باسكران لە چاپدراون و لەبەر دەستان.

---

١- بڕوانە: الوافي بالوفيات (١/٥٥).

٢- بڕوانە: الرسالة المستطرفة (١١٠ - ١١١)، تصوير دار الكتب العلمية.

٣- بڕوانە: الرسالة المستطرفة (ص: ١١١- ١١٥)، تصوير دار الكتب العلمية..

بــەهۆی زۆری و جۆراوجــۆری پــەرتووكی فــەرمووده و زۆری هونــەرەكانی زانستی فەرمووده و جێگیربوونی ڕێساكانی، پەرتووكەكانی تایبەت بـە (زاراوەی فەرمووده) دەركەوت، ئەمانەش پەرتووكی تایبەتن بە ڕوونكردنەوەی ئەو بنـەما و ڕێسـایانەی، كـە زانسـتی فـەرموودەی لەسـەر دەوەسـتێ، چـۆنیەتی ناسـینی گێڕانــەوە سـەحیحەكان و جیاكردنــەوەیان لـە گێڕانــەوە لاوازەكـان، چـۆنیەتی گوێبیستبوونی فـەرمووده و گێڕانـەوە و نووسـینەوەی و پلـەی گێڕەرەوەكـان و پلەی گێڕانەوەكان.. تاد.

بــەناوبانگترین پــەرتووكی زاراوەی فــەرمووده، پــەرتووكی (معرفــة علــوم الحديث)ی حـاكيم و، (الكفايـة)ی خـەتيبی بەغـدادی و، (علـوم الحـديث)ی ئـیبن سەڵاحە، كە بە (المقدمة) ناسراوە[1].

دوای ئەمەش زانایـانی فـەرمووده بینیـان ئەوانـەی پسـپۆڕن لـە فیقهـدا، زۆر پێویستیان بـە پـەرتووكی كـورت و پوختـە، كـە ئـەو فەرموودانـەی پێغەمبـەری لەخۆگرتبێت كە شەرعناسان پێویستیانە بۆ هەڵێنجانی حوكمە فیقهییـەكان، بـۆ بەڵگەهێنانەوە بۆ بابەت و پێشهاتەكان، چونكە شتێكی سەخت بوو بـۆ ئەوانـەی پسپۆڕن لـە فیقهـدا، بەشـدار بـن لـە پسـپۆڕیی زانایـانی فـەرمووده لەبـەر زۆری پەرتووكی فەرمووده و هونەرەكانی، دواتر جۆرێكی تر لە پـەرتووكی فـەرمووده دەركەوتن، كە پێویستی شەرعناسانی فەراهەم دەكرد، ئەو كاتە ئاسـان بـوو بـۆ زانینی ئەو فەرموودانەی پسپۆڕییەكان پێویستیانە، بـەبێ زۆر خـەریك بـوون لـە گەڕان لە پەرتووكە گەورەكانی فەرمووده، بۆیە پەرتووكـەكانی (فـەرموودەكانی ئەحكام)[2] دەركەوتن.

---

١- بڕوانە: الرسالة المستطرفة(ص: ١٠٧)، تصوير دار الكتب العلمية.

٢- بڕوانە: الرسالة المستطرفة (ص: ١٣٤)، هەمان چاپ.

هیچ پێویستیەك بە نووسینی پەرتووكی تایبەت بەو بابەتە نەبوو، تەنها پاش سەدەی دووەمی كۆچی نەبێت، كە پەرتووكی تایبەت بە فەرموودەی حوكمەكان و بەڵگەی فیقهی ڕێكخراو لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی دەركەوتن، كە ئەمانەی لەخۆدەگرت:

١. پەرستشەكان: وەك نوێژ و زەكات و ڕۆژوو... تاد.

٢. مامەڵەكان: وەك كڕین و فرۆشتن و هاوبەشیكردن... تاد.

٣. باری خێزانی: هاوسەرگیری و تەلاَق و میرات... تاد.

٤. دادوەری: سكالاَكان و ڕوونكردنەوە و گەواهیدان... تاد.

دەكرێ پەرتووكی (المنتقى في الأحكام)ی[1] حافیز عەبدوڵڵای كوڕی عەلی كوڕی جارود (٢٣٠– ٣٠٧ك) بە یەكێك لە پەرتووكە یەكەمەكانی فەرموودەكانی ئەحكامی تایبەت بە فەرموودەكانی فیقه دابنرێ، زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت: "بەرگێكە لە (ئەحكام) فەرموودەكانی تیایدا لە پلەی حەسەن دانابەزن، تەنها بە دەگمەن نەبێت، لەو فەرموودانەی كە بۆچوونی ڕەخنەگرانی تێدا جیاوازە"[2].

لەبەر ئەوە ناوی نا (المنتقى)، ژمارەی فەرموودەكانی دەگاتە (١١١٤) فەرموودە، ڕێكخراو لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی، بە بابەتی پاك و خاوێنی دەستپێدەكات، دواتر نوێژ، بە دەستكەوتی جیهاد و باج و خەراج كۆتایی دێت. ئەویش ئەو فەرموودانەی بە سەنەدەوە لە مامۆستاكەی گێڕاوەتەوە، یەكێك بوو لە قوتابی قوتابییەكانی مالیكی كوڕی ئەنەس و شافیعی و ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، پەرتووكەكەشی لە چاپدراوە و بژاركراوە[3].

---

١– تذكرة الحفاظ (٣/٧٤٩).

٢– سير الأعلام (١٤/ ٢٣٩).

٣– بڕوانە: غوث المكدود بتخريج منتقى ابن الجارود، تأليف: أبي إسحاق الحويني، ط١، ١٩٨٨م، الكتاب العربي– بيروت.

لەوانەیە ئەم پەرتووکە یەکەم پـەرتووك بووبێـت کـە ڕێگـەی والاّ کردبێـت بـۆ بەرەوپێشخستنی نووسینی پەرتووکەکانی (ئەحکام)ی تایبەت بە بەڵگە، هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی لە ئەندەلوس ناسراو بوو، کـە بـووە هـۆی ئەوەی حافیز قاسمی کوڕی ئەسبەغ (٢٥٠– ٣٤٠ك) فەرموودەناس و شەرعناسی قورتوبە پەرتووکێك بە ناونیشانی (المنتقی) بە هەمان شـێوەی پـەرتووکی ئـیبن جارود بنووسێت، کە تایبەت بوو بە فەرموودەکانی ئـەحکام، بـە هـەمان ڕێگـەی ڕێکخستنەکەی، فەرموودەکانی بە سەنەدەوە ڕێکخراو لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی[1].

---

١– الرسالة المستطرفة (٢٥)، هەروەها بڕوانە بەشی سێیەمی ئەم توێژینەوەیە.

# بەشی دووەم

## تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسان دەربارەی نووسینەوەی فەرموودە و تاوتوێکردنی

## تێڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسان دەربارەی نووسینەوەی فەرمووده و تاوتوێکردنی

چەندین پرسیار و ڕەخنە و بۆچوون هەن، هەندێك پسپۆڕ لە توێژینەوە ئیسلامییەکان دەربارەی سوننە و فەرموودەکانی فیقە و ئەحکام خستوویانەتەڕوو، پێویستە تاوتوێ بکرێت، بۆ زانینی ئاستی ڕاستیی و دروستییەکەی، دەتوانرێت بوترێت گرنگترین ئەو بۆچوونانە ئەمانەن:

١. **بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناس (مۆیەر):** ئەم ڕۆژهەڵاتناسە پێیوایە کە کۆمەڵێك نووسراوی فەرموودەیی متمانەپێکراو، پێش ناوەڕاستی سەدەی دووەم بوونیان نەبوو[1].

٢. **بۆچوونی گۆلدزیهر:** (شاخت)یش هەمان بۆچوونی ئەوەی هەبووە، پێیانوایە ئەو فەرموودانەی کە لە سەردەمی ئەمەوییەکان بوونیان هەبوو، پەیوەست نەبوون بە فیقهەوە، بەڵکو پەیوەست بوون بە ئەخلاق و زوهد و دواڕۆژ و سیاسەت[2].

٣. **بۆچوونی شاخت:** باوەڕی وایە زۆر سەختە هیچ کام لە فەرموودەکانی فیقە بە سەحیح هەژمار بکرێت، بەڵکو ئەمانە هەر لە نیوەی سەدەی دووەمی کۆچییەوە و بۆ دەستاودەستکردن لە نێو خەڵکی دانراون[3].

٤. **بۆچوونی ڕۆبسۆن:** پێی وایە کە سەنەدەکان لە سەدەی دووەم دروستکراون، پاشان بۆ فەرمووده هەڵبەستراوەکان پێکهێنراون، بۆ ڕەواج پێدانیان دراونەت پاڵ کەسایەتی و سەرچاوەی پێشتر[1].

---

1 –W. Muir. The Life of Mohammed from Original Sources, London, Smith, Elder, 1858 - 61..

2 –Goldziher, History of Classical Arabic Lit, p. 31 Literature, trans. by j. Desomgyi. Hildesheim 1960, Scgacht, A revalution of Islamic Traditions, J.A.R.S. 1949, P. 148 (2).

3 –Schacht, Introduction to Islamic law, p, 34.

دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی ڕەخنەی یەکەم بدەینەوە:

١. ناتوانین بە بڕاوەیی و سەدا سەد دڵنیابین، لەوەی کە پێش ناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچی کۆمەڵێك پەرتووکی متمانەپێکراو بوونیان نەبووبێ، لەگەڵ بوونی نزیکەی ملیۆنێك و نیو تا سێ ملیۆن (١٥٠٠٠٠٠– ٣٠٠٠٠٠٠) پەرتووکی دەستنووسی ئیسلامی، کە تا ئەمڕۆش چاوەڕێی ئەوە دەکەن کە یەکێك کار لەسەر دەرهێنانیان بکات بۆئەوەی بیانخاتە نێو جیهانی لەچاپدراوانەوە[2]. چەندین پەرتووك پێش چەندین ساڵ بە ونبوو و نادیار دادەنران، بەڵام ئەمڕۆ هاتوونەتە ناو پەرتووکخانەکان و نمایش دەکرێن و کڕین و فرۆشتنیان پێدەکرێت[3].

پڕۆگرامی زانستی داخوازی ئەوەیە، کە بە بڕاوەیی و ڕەها بڕیار نەدرێت لەسەر نەبوونی هەندێك پەرتووکی ئەو قۆناغە، تا گەڕان بەناو هەموو ئەو دەستنووسانە نەکرێت، لەوانەیە تێیاندا بدۆزرێنەوە.

٢. ئەگەر گریمانەی ئەوە بکرێت، کە پەرتووکەکانی ئەو قۆناغە لە نێو ئەو دەستنووسانە بوونیان نییە، ئەوا ئەمە بەڵگەیەکی شیاو نییە لەسەر ڕەتکردنەوەی بوونی ئەم پەرتووکانە لە سەدەی یەکەم و دووەم، لەبەر ئەوەی

---

1 –(A) Robson, J. The Isnad in Muslim Traditions, Glasgow. Unif. Oriental Society Transaction, vol. xv, p. 18, quoting Annali dellislam..
(B) Robson, Muslim Tradition, vol, XCIII, no. 7, pp. 98.
)c) Schacht, Origins of Muhammad an Jurisprudence, pp. 163, 164, 165, 166, 169, 263. Burtons criticism share the elements mentioned in the above. John Burton, Edinburgh University press Ltd 1994. .

٢– بڕوانە: أهمية المخطوطات الإسلامية (ص: ١٧) وتارێکە بە پێنوسی: جورج مقدسي.

٣– وەك کتێبی (جامع)ی موعمەر و، (مصنف)ی عەبدولرەزاق و، (مسند)ی ئیسحاق... تاد. دەستنووسی تریش هەن هی نووسەرانی سەدەی دووەمی کۆچی کە تا ئێستا تەحقیق نەکراون، بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/ ٤٧١)، وتأريخ التراث العربي (١/ ١٥٣ – ١٧٣).

زۆرێك له كهلهپوری نووسراوی ئیسلامی تووشی كارەساتی گەورە بوو، بەشێكی زۆری ئەم كهلهپوره نووسراوه ونبووه، هەروەك له سەدەی پێنجی كۆچی ولاتی شام ئەمەی بەسەر هات، سەدەی حەوتەم له ڕۆژهەلاتی ئیسلامی له ناوچەكانی ئاسیای ناوەڕاست و بەغداد و سەدەی نۆیەمی كۆچی له ئەندەلوس[1] زۆرێك له پەرتووك و پەرتووكخانەكان سووتێنران، كەواتە توێژەر هیچ ڕێگەیەكی لەبەردەمدا نییە، تەنها گەڕانەوە نەبێت بۆ ئەو سەرچاوانەی كە باسی ئەو پەرتووكانەیان كردووە، هەروەها سوودوەرگرتن لەو زانیارییانەی ئەو پەرتووكانە باسیان لێوە كردووە لەبارەی پەرتووكە ونبووەكان.

هەروەها گەڕانەوە بۆ ئەو سەرچاوانەی كە لەو پەرتووكانە هەلێنجراون، یاخود لەخۆیان گرتوون و هەموو ئەوەی كە تێیدابووە لە ماددەی زانستی گواستویەتییەوە. نابێت نەبوونی بنچینەی ئەم پەرتووكانە ببێتە هۆكاری گومانكردن لەوەی پەرتووكە مێژووییەكان باسیان كردووە، یاخود گومان كردن لەوەی پەرتووكەكانی تر لێیان وەرگرتووە.

٤. زۆرێك له سەرچاوە مێژووییەكان، باسی ناوی زۆر پەرتووكیان له بواری فەرموودەی پێغەمبەر (دروود و سلاوی خودای لێبێ) و ناوی نووسەرەكانیان كردووە[2]، ئەوانیش لە زاناكانی سەدەی یەكەمی كۆچی بوون و ئەم پەرتووكانەش لە نێو زانایانی هەر دوو سەدەی دووەم و سێیەمی كۆچی

---

١- بڕوانە: الكامل في التأريخ لابن الأثير، (٢٨٢/١٠)، (١٢/ ٣٦٥- ٣٩٧)، ط ١٩٦٦. دار صادر- بيروت، والبداية والنهاية، ابن كثير (١٣/ ٢٠٠- ٢٠٣)، ط٤، ١٩٨٢، دار المعارف- بيروت، كە باسی هەندێك لەو شەڕە كاولكارانەی كردووە كە بۆتە هۆی داڕمان و سووناتی تەواوی ئەو ناوچە و شارە زانستیانە.

٢- بڕوانە ئەوەی پێشتر باسكرا لە بابەتی قۆناغی دووەم و قۆناغەكانی نووسینەوەی فەرمووده.

دەستاودەستی پێدەکرا[1]، ئیبن نەدیم هەندێکی لە کتێبەکەیدا (الفهرست) باسکردووە[2]، لە پێشەکی پەرتووکەکەی وتویەتی ئەم پێڕستە هی ئەو پەرتووکانەیە کە لە سەردەمی ئەودا بە زمانی عەرەبی بوونیان هەبوو، هەر لە سەرەتای هەموو زانستێکەوە تا سەردەمی ئەو، ساڵی (٣٧٧ك)[3].

٤. کۆنترین پەرتووکەکانی فەرموودە، کە ئەمڕۆ لەبەردەستماندایە پەرتووکەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی کۆچییە، نەوەك نووسراو و پەرتووکەکانی نیوەی دووەمی سەدەی ناوبراو؛ (الجامع)ی پێشەوا موعەممەری کوڕی ڕاشید (٩٥– ١٥٢ك) لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەم کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە، هەروەها (موطأ)ی پێشەوا مالیك (٩٣– ١٧٩ك) کە هەڵسا بە کۆکردنەوە و نووسینەوەی هەر لەو کاتەی کە گەنج بوو، ساڵی (١٤٣ك) لە چەندین دەروازە و بەشدا ڕێکی خست[4].

بەهەمان شێوە (الجامع)ی عەبدولمەلیکی کوڕی جورەیج (٨٠– ١٥٠ك)[5]، سونەنی ئەوزاعی (٨٨– ١٥٦ك)[6]، سونەنی سەعیدی کوڕی ئەبی عەروبە (٨٠– ١٥٦ك)[7]، جیا لەمانەش لەو پەرتووکانەی کە بە ئێمە نەگەیشتوون، لە واقعیدا ئەمانە لە نووسراو و پەرتووکەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمن، لەبەر

---

١– الفهرست (٢٢٥) ط. ١٨٧١م.
DR. JOHANNES ROEDIGER LEIPZIG VERLG VON F.C. W VOCEL 1871.

٢– سەرچاوەی پێشتر (٢).

٣– پێش چەند ساڵێك دۆزرایەوە و لە کۆتایی موسەنەفی عەبدولڕەززاق چاپکراوە.

٤– بڕوانە: إحكام الأحكام (٢/١٣٦).

٥– بڕوانە: لاپەڕە (١٠٦).

٦– بڕوانە: لاپەڕە (١١٠).

٧– بڕوانە: لاپەڕە (١٠٨).

ئەوەی زانایان لە تەمەنی بیست ساڵی دەستیان بە نووسینەوەی فەرموودە و خوێندنەوەی بۆ مامۆستاکانیان دەکرد، پێش نووسینەوە و ڕێکخستنی بە بیست ساڵ دەستیان بە کۆکردنەوەی ماددەکانی نووسینەوە دەکرد[1]، ئەم زانایانەش هەندێکیان هەر لە منداڵیەوە بەدوای زانست گەڕاون، لە کۆتایی سەردەمی هاوەڵاندا وەك: سەعیدی کوڕی ئەبی عەروبە و عەبدولمەلیکی کوڕی جورەیج.

٥. ئەو زانایانەی کە پەرتووکیان لەبارەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەم نووسیوە، هەندێکیان پەرتووکەکانیان بە ئێمە گەیشتووە، وەك: (الموطأ)ی مالیك و (الجامع)ی موعەممەر، ئەمانە قوتابی ئەو زانایانە بوون کە لەسەدەی یەکەم پەرتووکیان نووسیووە، پەرتووکی ئەم مامۆستا و شێخانە بوونە بەشێك لە پەرتووکی قوتابیەکانیان، ئەوانیش باسی مامۆستاکەیان کردووە، پێش باسکردنی ئەو دەقانەی کە لە پەرتووکی مامۆستاکانیان وەرگرتووە و گوێیان لێبووە، ئەمەش بەسە بۆ سەلماندنی ئەو کۆمەڵە پەرتووکە متمانەپێکراوەی کە مۆیەر بەدوایدا دەگەڕێت، بە بەراوردکردنی خێرای نێوان هەندێك ئەو فەرموودانەی کە لە (الموطأ)دا هاتوون و ئەو فەرموودانەی کە لە (الجامع)دا هاتوون، دەبینین هاوشێوەیی زۆر لە نێوان سەنەد و وێژەی ئەو فەرموودانەدا هەیە، ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە مالیك و موعەممەر لە یەك سەرچاوە وەریان گرتووە، ئەمانەش بریتین لە پەرتووکی مامۆستا بەناوبانگەکانیان، لە کۆتاییەکانی سەدەی یەکەم و سەرەتاکانی سەدەی دووەم، وەك پەرتووکی نافیع، پەرتووکی زوهری و پەرتووکی عورڕوە... تاد[2]. ئەم پەرتووکانە کە

---

١- بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/ ٣٦٨).

٢- بڕوانە: لاپەڕە (٧٧) و دوواتر، هەروەها: تأريخ التراث العربي (١/ ١٤٧).

هەموو پەرتووکەکانی زانایانی فەرموودەی سەدەی یەکەم و دووەمی کۆچی لەخۆدەگرت، لەوانەیە ئەمە ئەو هۆکارە بێت کە ئەو پەرتووکانە گرنگییان لەدەستدابێ، زانایان گرنگیان بە پەرتووکەکانی سەدەی دووەم دا، چونکە قەبارەیان گەورەتر بوو، فەرموودەیان زیاتر تێدا بوو، ڕێکخستنەکەیان چاکتر بوو، هەروەها هەموو پەرتووکەکانی پێشتری تێدابوون، بە هەمان شێوە ئەم شتە لە پەرتووکەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی دووەم ڕوویدا، کاتێك فەرهەنگە فەرموودەییە گەورەکان لە کۆتایی سەدەی دووەم هاتنە کایەوە –کە پەرتووکەکانی مالیك و موعەممەر و ئیبن جورەیجیان، جیا لەمانەش لە پەرتووك و پەڕاوەکانی فەرموودەی لەخۆگرتبوو– وەك موسەنەفەکان[1]، ئەو موسنەدە گەورانەی دەبینین لێکچوون و هاوشێوەیەکی گەورە لەنێوان ئەمانە و پەرتووکەکانی پێشتر هەیە. ئەو سەرچاوانەی کە لێی وەرگرتوون دیاریدەکات، پێش هێنانەوەی هەر دەقێك، ئەمەش بە باسکردنی سەنەدی ئەم پەرتووکانە، ئەو فەرموودانەی لە (الموطأ)ی مالیك، (جامع)ی موعەممەر، (جامع)ی ئیبن جورەیج، (موسەنەف)ی حەممادی کوڕی سەلەمە و (سنن)ی ئیبن ئەبی عەروبە... تاد بوونە بەشێك لە (مسند)ی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، کە هەموو ئەم پەرتووکانەی لای مامۆستاکانی خوێندبوو، هەروەها مامۆستاکانی هەموو ئەو پەرتووکانەیان لای نووسەرەکانیان خوێندبوو، تەنانەت پێشەوا ئەحمەد[2]

---

١– بڕوانە: مصنف عبد الرزاق (٢/ ٣ –٥) کە لە پەڕتووکەکانی موعەممەر و ئیبن جورەیج و مالیك و سەوری و ئەوانی تری نەقلّ کردووە.

٢– هەروەك فەرموودەی ئەبی هورەیرەدا هەیە – لەبارەی فەزڵ و پاداشتی ڕۆژوو – پێشەوا ئەحمەد لە موسنەدەکەی (٢٤) جار گێڕاویەتەوە، لە (٦) سەرچاوەی جیاوازەوە، لەوانە: (موطأ)ی مالیك، موسەنەفی حەمماد و (جامع)ی موعەممەر و جیا لەمانەش لە سوحوفە بەناوبانگەکان، هەروەها دوو جار لە ڕێگەی (موطأ)ی مالیکەوە گێڕاویەتییەوە.. بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/ ٥١٥ – ٥١٩).

یەك فەرموودەی بە ژمارەی ئەو جارانەی کە لە یەك پەرتووکدا خوێندبووی دووبارە دەکردەوە بە پێی ژمارەی ئەو مامۆستایانەی کە لای خوێندبوون، ئەگەر لەنێوانیاندا نوسخەی جیاوازی هەبێت لە وێژە یاخود سەنەدەکان - کە ئەمڕۆ پێی دەوترێت دیاریکردنی جیاوازییەکان (إثبات الفروق) لەنێوان چەند دانەیەکی لەبەرگیراوی پەرتووکێکدا[1]، هەروەها پێشەوا ئەحمەد ئەو فەرموودەیەی بە ژمارەی دووبارەبوونەوەی ئەو فەرموودەیە لەو پەرتووکانە دووبارە دەکردەوە، بەتایبەت ئەو پەرتووکانەی لە وێژەدا، یاخود سەنەد لە یەك فەرموودەدا جیاوازییان هەیە، بەم شێوەیە ئەو فەرموودانەی کە لەو پەرتووکانە بوون، لە موسنەدی ئەحمەددا کۆکرانەوە، لەگەڵ دیاریکردنی جیاوازی نێوانیان، تەنها ئەوە نەبێت کە ڕێکخراوە بەوشێوەیەی کە ئەحمەد هەڵیبژاردووە، نەك بەو شێوازەی کە لەم پەرتووکانەدا ڕێکخرابوون، واتە: بە شێوازی موسنەدی هاوەڵان نەوەك بە شێوازی دەروازەی فیقهی، هەروەها خاوەنانی موسنەدەکانی تر ئەم شێوازەیان گرتەبەر، لەو کاتەی خاوەنانی (موسەنەفەکان) وەك عەبدولڕەزاق - کە لە قوتابییەکانی موعەممەری کوڕی ڕاشید و ئیبن جورەیج و نووسەرانی پەرتووکەکان بوو - هەڵسا بە کۆکردنەوەی پەرتووکی ئەو مامۆستایانەی کە لێیانەوە گوێبیست بووە، یاخود بۆی خوێندونەتەوە لە پەرتووکەکەیدا (موسەنەف)، کە نووسینیەوە بە هەمان ڕێکخستنەوە هێشتییەوە، واتە: بەشێوازی دەروازەی فیقهی، ئیبن ئەبی شەیبە لە (مصنف)ەکەی هەمان شتی کرد[2].

---

١- بڕوانە: سير أعلام النبلاء (١١/١٨٧) لە بابەتی نووسینەوەی ئەحمەد بۆ یەك فەرموودە لە حەوت ڕێگەوە، تا بزانێت ئایا جیاوازیی هەیە لەنێوان گێڕەڕەوەکانەدا لە گێڕانەوەکانیانەوە یان نا؟

٢- بڕوانە: الرسالة المستطرفة (ص: ٦٠ - ٦١).

بـەم شـێوەیە دەیـان سەرچـاوەی فەرهــەنگی کەوتنــە بەردەسـتمان، کـە پەرتووکـەکانی زانایـانی سـەدەی یەکـەم و زانایـانی نیـوەی یەکـەمی سـەدەی دووەمیان پاراستووە و لەخۆیانگرتووە.

نموونەی ئەمەش (الصـحیفة)ی هـەممامی کـوڕی مونەبیهـە[1]، کـە لـە کـۆڕی هاوەڵی بەڕێز ئەبو هورەیرە نووسییەوە، کاتێك لە مزگەوتی پێغەمبـەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) فەرموودەی پێدەنووسینەوە، ئەم سەحیفەیە کە لە نیوەی سـەدەی یەکـەم نووسـراوەتەوە و موعەممـەری قوتـابی بـە جیـا لـە (الجـامع)[2] هێناویـەتی بـە پەرتـەوازەیی، پاشـان عەبـدولڕەزاق بـۆ موعەممـەری مامۆسـتای خوێندۆتەوە، دواتر لە پەرتووکەکەی (المصنف)دا[3] دایناوە، پاشـان ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل بۆ عەبدولڕەزاقی مامۆسـتای خوێندۆتـەوە، دواتـر هـەموویانی لـە موسنەدەکەی خۆی داناون[4] بە یەك سەنەد و یەك شێواز بـەبێ پچـڕان، چـونکە لە فەرموودەی یەك هاوەڵی بەڕێزە کە ئەبو هورەیرەیە.

بەم شێوەیە (الصـحیفة) گواسـترایەوە بـۆ (الجـامع)، دواتـر بـۆ (المصـنف)، پاشان بۆ (المسند)، لە کۆتاییدا بۆ دەیان سەرچاوەی فەرموودەیی.

کتێبی (الصحیفة) دۆزراوەتەوە و هاوشێوە و هاوتا بووە لەگەڵ ئەوەی لـەناو (المسـند)دا هــەبووە[5]، هــەروەها لـەوەی کــە لــەناو (المصـنف) و (الجـامع)دا هەبووە. هەروەك فەرموودەکانی سەحیفەی هەممام تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی

---

١- بڕوانە لاپەڕە (٩٩)، هەروەها: تأریخ التراث العربي (١٤٩/١).

٢- بڕوانە فەرموودەی ژمارە (١٩٤٣٥) و ژمارە (١٩٤٤٥) لە: جامع معمر، لە کۆتـایی: مصـنف عبـد الرزاق (٣٨٤/١٠، ٣٨٨).

٣- هەروەك لە موسەنەفدا (٤٤/٢) هەیە- فەرموودەی ژمارە (٢٤٢٤).

٤- المسند (٢/ ٣١٢ -٣١٩).

٥- بڕوانە تەحقیقی ئەحمەد شاکر بۆ: مسند أحمد (١٩/١٦).

ئەو دانە لەبەرگێراوەی سوهەیلی کوڕی ئەبو ساڵح بوون، ئەویش لە باوکیەوە لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوییەتەوە.

هەروەها هاوشێوەی ئەو دانە لەبەرگێراوەی ئەبو زناد بووە، کە لە ئەعرەجەوە لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوییەتەوە.

هەروەها هاوشێوەی ئەو دانە لەبەرگێراوەی ئەیوب بووە، کە لە موحەمەدی کوڕی سیرین لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوییەتەوە.

هەروەها هاوشێوەی ئەو دانە لەبەرگێراوەی زوهری بووە، کە لە ئیبن موسەیبەوە لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوییەتەوە.

بەهەمان شێوە هاوشێوەی ئەو دانە لەبەرگێراوەی ئەبو سەلەمە بووە، کە لە عەبدولڕەحمان لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوییەتەوە... تاد[1].

ئەگەر هەموو ئەمانە بەس نەبن بۆ سەلماندنی کۆمەڵە پەرتووکێکی متمانەپێکراو، پێش نیوەی سەدەی دووەم، ئەوا ناتوانین هیچ کۆمەڵە پەرتووکێکی مێژوویی لە هەر لقێك لە لقەکانی زانستە مرۆڤایەتییەکان بسەلمێنین، زانراویشە کە بۆ دانەپاڵی پەرتووکێك بۆ نووسەرەکەی، مەرج نییە ئەو پەرتووکە ئەسڵەی کە نووسەرەکە بەدەست و خەتی خۆی نووسیبێتی هەبێت، ئەوەندە بەسە دانەیەکی لەبەرگێراوی گواستراوە هاوشێوەی ئەو ئەسڵە هەبێت، کە هاوشێوەیەکی وردی متمانەپێکراو بێت، ئەمەش ئەوەیە کە بە کردار لە سەحیفەی هەممام و جیا لەمەش لە سەحیفە و پەرتووکە فەرموودەییەکانی تر، لە سەدەی یەکەمی کۆچی و سەرەتای سەدەی دووەم ڕوویدا.

---

١- بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/٣٠٥) – ح (٣)، و (٢/٥٠٧) – ح (٤)، (٤)، (٢/٥١١) – ح (٦)، (٢/٥١٣) ح (٧)، (٢/ ٥٢٣) ح (١١)، ٢/ ٥٥٧) ح (٣٠)، هەروەها بڕوانە: أطراف مسند احمد للحافظ ابن حجر (٨/ ٧٣ – ٩٢)، (٨/ ٣٢ – ٤٩)، (٨/ ١٣٤ – ١٨٣)، (٧/ ٢٥٨ – ٢٨٠)، (٧/ ٣٤٠ – ٣٧٥)، (٧/٣٧٦ –٣٩٢) کە فەرموودەی ئەم نوسخانە لە ئەبو هورەیرەوە کۆکراونەتەوە.

ئــەوەی ڕادەی متمانــە و دڵنیــایی زیــاتر دەکــات ئەوەیــە کــە ئەوانــەی لەبەریانگرتەوە و لە فەرهەنگەکانی خۆیان پاراستیان قوتابی ئەم نووسەرانە بوون، لای ئەوان نووسییانەوە و لەوانیشەوە گوێبیست بوون، نووسەرەکانیشیان ڕێگەیان پێداون کە لێیانەوە بگێڕنەوە، ئەم قوتابیانەش بوونە گەورەترین زانای سەردەمی خۆیان، بە زانست و نووسینەوە و پاراستن و ئەمانەتپارێزی زانستی بەناوبانگ بوون.

ئەمە ئەنجام هەڵهێنجانێك نییە کە لێکۆڵەر پێی گەیشتبێت، بەڵکو ئەمە ئەو ڕاستییە مێژوویە زانستیەیە کە هیچ زانایەکی فەرمووده، یاخود مێژوونووسێك گومانی لێ نییە و ناکۆکیشیان نییە کە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل قوتابی عەبدولڕەزاق بووە و پەرتووکەکانی بۆ خوێندۆتەوە[1]، لەوانە (الصحيفه)ی هەممام، هەروەك هیچ ڕاجیایی نییە کە عەبدولڕەزاق قوتابی موعەممەر بووە[2]، نووسراوەکانی بۆ خوێندۆتەوە، لەوانە (الجامع) کە کردوویەتیە بەشێك لە (موسەنەف)، بەم شێوەیەش ڕاجیایی نییە کە موعەممەر قوتابی هەممام بووە و هەموو گێڕانەوەکان و لەوانەش (الصحيفة)ی ئەبو هورەیرەی بۆ خوێندۆتەوە[3]، بە هەمان شێوە ڕاجیایی نییە کە هەممام قوتابی ئەبو هورەیرە بوو، (الصحيفة) لای ئەبو هورەیرە نووسیوەتەوە، کە لە مزگەوتی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، بە ئامادەبوونی هاوەڵە زاناکانی تر وانەی دەوتەوە، ئەوان گوێیان لە ئەبو هورپرە دەگرت و ژمارەی قوتابیەکانیشی سەدان قوتابی دەبوون، فەرموودەی فێردەکردن، دواتر ئەگەر هەڵەی بکردایە هاوەڵان وەڵامیان دەدایەوە.

---

١- بڕوانە: سير الأعلام (٩/ ٥٦٣، ٥٦٨، ٥٦٩).

٢- بڕوانە: الجرح والتعديل (٦/ ٣٨)، وسير الأعلام (٩/ ٥٦٤، ٥٦٥).

٣- بڕوانە: سير الأعلام (٩/٥٧١).

ئەوەتا موسنەدی ئەحمەد و موسەنەفی عەبدولڕەزاق و جامعی موعەممەر وصەحیفەی هەممام دۆزراونەتەوە، چاپکراون و لێکۆڵینەوەیان لەسەرکراوە، ئەو فەرموودانە دەبینین کە ئەحمەد لە (المسند) لە عەبدولڕەزاقی مامۆستای گێڕاویەتییەوە، کە سەدان فەرموودە دەبێت[1]، هاوشێوەی ئەو فەرموودانەیە کە لە موسەنەفەکەی هەن، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە زۆر بە وردی و ئەمانەتەوە گواستویەتییەوە. ئەو فەرموودانەش کە لە (صەحیفە)ی هەممام هەن هاوشێوەی ئەوەن کە ئەحمەد لە (المسند) گێڕاویەتییەوە لەو (صەحیفە)یە، ئەمەش بۆ سەلماندنی ڕادەی ڕێك و وردی ئەمانەتپارێزی زانستیی لای ئەم زانایانە، ئەمە لەگەڵ ئەوەی (الصحیفة) لە نیوەی سەدەی یەکەم نووسینەوەی تەواو بووە و، (الجامع) لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەم نووسراوەتەوە و، (المصنف) لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەم و، (المسند)یش لە دەوروبەری ساڵی (٢٠٠ك) نووسراوەتەوە، ئەمە بەسە بۆ پووچەڵکردنەوەی بانگەشەی مۆیەر، کە باوەڕی وایە هیچ کۆمەڵە پەرتووکێکی باوەڕپێکراو پێش نیوەی سەدەی دووەم بوونی نەبووە.

ئەوەی متمانەمان بەو سەرچاوە گەورانە زیاتر دەکات -کە هەموو پەرتووکەکانی پێشتر لەخۆدەگرێت و هەموو فەرموودەکانی ناوی دەگرێتەوە- ئەو ڕێگە زانستییەیە کە لەو سەردەمدا بەربڵاوبووە، ئەو شێواز و پەیڕەوە توندەی زانایان بووە لە گێڕانەوەدا، لەوانە:

١. قەدەغەکردنی گێڕانەوەی بە مانا لە لای زۆرێك لە زانایانی فەرموودە، پابەندبوونیان بە گێڕانەوەی پیتاوپیتی، خەتیبی بەغدادی دەڵێت: "زۆرێك لە پێشینان و زانایانی پشکنینی فەرموودە دەڵێن: گێڕانەوە بە مانا دروست نییە،

---

١- ئەحمد لە موسنەددا (١٦٤٦) فەرموودەی لە عەبدولرەزاقی مامۆستایەوە گێڕاوەتەوە.

بەڵكو پێویستە خودی وێژەكە بەبێ پێشخستن و پاشخستن و كەم و زیاد بوترێتەوە... تاد)[1].

لەبەر ئەوە موحەمەدی كوڕی سیرین فەرموودەی بە پیتاوپیتی دەگێڕایەوە[2]، تاوسیش فەرموودەی پیت بە پیت دەژمارد[3]، قاسمی كوڕی موحەمەدی كوڕی ئەبو بەكری سدیق و ڕەجائی كوڕی حەیوە و زوهری[4] و، عەبدولمەلیكی كوڕی عومەیر بەم شێوەیە بوون[5].

بەهەمان شێوە عوقەیلی كوڕی خالیدی ئەیلی (١٤٤ك كۆچی دوایی كردووە) و یونسی كوڕی یەزیدی ئەیلی (١٥٩ك كۆچی دوایی كردووە)، پابەندی گێڕانەوەی پیتاوپیتی بوون[6].

واتە: چۆن قورئانیان دەخوێندەوە و دەوتەوە ئاواش فەرموودەیان دەخوێندەوە و دەوتەوە.

ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەڵێت: "خالیدی كوڕی حارس چۆن گوێی لە فەرمووده دەبوو، ئەوا وەك خۆی دەیگێڕایەوە، ئیبن مەهدیش هەمان ئەم كارەی دەكرد، وەكیعیش كۆششی دەكرد لەوەی گوێبیست بووە بیگێڕێتەوە، هەتا ئەوەی بە پیتاو پیتی بێ زیاد و كەم دەیگێڕایەوە، لەوانەیە هەندێك جار لەبارەی وشەیەكەوە وتبای: بەم شێوەیە"[7].

---

١- الكفاية (ص: ٢٣٢).

٢- طبقات ابن سعد (٧/ ١٤٤)، وعلل الترمذي (٥/٧٠١).

٣- طبقات ابن سعد (٩٦/٦).

٤- علل الترمذي (٥/ ٧٠١, ٧٠٣).

٥- علل أحمد (١٧٧/١).

٦- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٢٦٨) .

٧- علل أحمد - رواية المروذى - (ص: ٥٠).

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بەراورد لە نێوان سێ لە مامۆستاکانی دەکات، کە ماوەیەکی درێژ لەگەڵیان بووە، شارەزای توانا و لێهاتوویی ئەوان بوو لە لەبەرکردندا، بینی کە خالید و ئیبن مەهدی تەواو پابەند بوون بە گێڕانەوەی پیتاوپیتی، بە پێچەوانەی وەکیع کە کۆششی تێدا دەکرد، هەوڵی دەدا بە پیتاوپیتی بیگێڕێتەوە، بەڵام هەندێ جار بە مانا دەیگێڕایەوە.

لەبەر ئەوە هەندێ لە زانایان لە هەر ڕۆژێکدا تەنها سێ فەرموودەیان بۆ قوتابیەکانیان دەگێڕایەوە، بۆ ئەوەی بە جوانی لەبەری بکەن، هەروەك "ئەبو قلابە" ئەم کارەی دەکرد[1].

٢. گوێبیستبوونیان لە یەك فەرموودە چەند جارێك لە مامۆستاکەیان و لە کات و سەردەمی جیاواز، بۆ ئەوەی لە توانای لەبەرکردنی دڵنیاببنەوە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموودەکانی سوفیانی کوڕی عویەینەی مامۆستای گوێبیست بووە و نووسیویەتەوە[2]، هەروەها موحەمەدی کوڕی جەعفەر – کە مامۆستای ئەحمەدە – فەرموودەکانی شوعبەی کوڕی حەجاجی مامۆستای نووسییەوە و چەندین جاریش گوێبیستی ببوو[3]، چونکە بیست ساڵ لەگەڵ شوعبە بوو[4]، ئەگەر قوتابی نوێ بهاتنایە، ئەوا لەگەڵیان دادەنیشت و جارێکی تر گوێی لێدەگرت، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە هەڵەی نەکردووە، گێڕانەوەکە کەم و کووڕی تێدا نییە.

هەروەها شوعبەی کوڕی حەجاج (٨٣– ١٦٠ك) لەگەڵ مامۆستاکانی ئەم کارەی دەکرد، لەبارەی خۆیەوە دەڵێت: "هەر فەرموودەیەکم لە هەر کەسێك

١– بڕوانە لاپەڕە (٨٨).

٢– علل أحمد (١٦٩/١).

٣– علل أحمد (٤٥٢/٢) .

٤– تهذيب التهذيب (٩٧/٩).

گێڕابێتەوە، ئەوا زیاتر لە جارێك چوومەتە لای، ئەو كەسەی دە فەرموودەم لێگێڕاوەتەوە، ئەوا زیاتر لە دە جار چوومەتە لای، ئەوەشی كە پەنجا فەرموودەم لێگێڕاوەتەوە، ئەوا زیاتر لە پەنجا جار چوومەتە لای، هەروەها ئەوەی سەد فەرموودەم لێگێڕاوەتەوە، ئەوا زیاتر لە سەد جار چوومەتە لای"[1].

بەم شێوەیە ڕادەی توانای لەبەركردنی گێڕەرەوەیان دەدۆزیەوە، ئەگەر گێڕانەوەكەی نەگۆڕیبایە، ئەوا ئەو كاتە دەیانزانی لەبەركاری فەرموودەیە، ئیبراهیم دەڵێت: "جارێكیان ئەبو زەرعەی كوڕی عەمری كوڕی جەریر فەرموودەیەكی بۆ گێڕامەوە، دواتر پاش دوو ساڵ لێم پرسییەوە تەنانەت یەك وشەشی نەگۆڕیی"[2].

لەبەر ئەوە یەحیای كوڕی سەعیدی قەتتان ئەگەر مامۆستایەكی ببینیبایە فەرموودەی بە لەبەر دەووتەوە، هەر جارەی بە شێوەیەك، لەسەر گێڕانەوەیەك جێگیر نیە، وازی لێ دەهێنا[3]. بەڵكو هەندێكیان مامۆستاكەیان تاقی دەكردەوە، سەنەدی فەرموودەكانیان سەراوژێر دەكرد و بەم شێوە بۆیان دەخوێندەوە – وەك ئەوەی سەنەدی فەرموودەی یەكەمیان بۆ فەرموودەی دووەم دانابێت و هی دووەمیش بۆ یەكەم – ئەگەر مامۆستاكە ئاگادار نەبایە لەم سەراوژێر كردنە ئەوا دەیانزانی كە لەبەركردنەكەی باش نییە، هەروەك حەممادی كوڕی سەلەمە ئەم كارەی لەگەڵ سابتی بەنانی مامۆستای كرد[4]، كە قوتابی هاوەڵی بەڕێز ئەنەسی كوڕی مالیك بوو.

---

١– علل الترمذي (٥/٤٠٧).

٢– علل الترمذي (٥/ ٧٠٢).

٣– علل الترمذي (٥/ ٦٩٩).

٤– علل ابن المديني (٧٢)، تهذيب التهذيب (٣/٢) .

٣. ڕازینـەبوون بـە گێڕانـەوەی زارەکـی و بـە مـەرج گرتنـی ئـەوەی مامۆسـتاکە دەبێت پەرتووکەکەی بێنێت، بۆ ئەوەی پەرتووکەکەی بۆیان بخوێنێتەوە، ئەگەر لـە لەبەرکارە بەتواناکان نەبایە، هەروەك تورمزی دەڵێـت: "خوێندنـەوە بـۆ زانـا ئەگـەر ئـەوەی بـۆی دەخوێندرێتـەوە لەبـەریبووبێ، یـان ئەسـڵەکەی لا بێـت – واتـە: کتێبەکـەی – ئەگـەر لەبەرینـەکردبێت، ئـەوا دروسـتە لای فەرموودەناسـان وەك گوێگرتن)[1]. هەندێك لە توندگیرەکان ڕازینەدەبوون گوێبیستی فەرموودە ببن تـەنها لـە پـەرتووکی مامۆسـتاکە نـەبێت، بـا ئەگـەر مامۆسـتاکەش لەبـەرکاریش بوایـە، هەروەك یەحیای کوڕی مەعین و ئەحمەدی کوڕی حەنبـەل[2] ئـەم کارەیـان دەکـرد، عەبـدولڕەزاق بــە یــەحیای کــوڕی مــەعینی قوتــابی دەوت: (بــەبێ پــەرتووك فەرموودەیەك لە من بنووسەوە، ئەویش وتی: نەخێر، یەك پیتیش نانوسمەوە)[3].

یەحیا و ئەحمەد ڕازینەدەبوون تەنها ئەگەر عەبدولڕەزاق پەرتووکەکەی خۆی دەربهێنایە، بۆ ئەوەی لەو پەرتووکەوە فەرموودە بگێڕێتەوە.

پەرتووکی مامۆستاکەیان لەبەر دەگرتـەوە، پاشـان داوایـان لێدەکرد کـە لـە لەبەرکردنەکەی فەرموودەیان بۆ بگێڕێتەوە، ئەگەر لەبـەرکار بووایـە، یـاخود لـە پەرتووکەکەی ئەگەر لەبەری نەبووایە، یـاخود ئـەوان دەیانخوێنـدەوە و ئـەویش گوێی دەگرت ئەگەر پەرتووکەکەی لەبەر بووایـە، یـاخود پەرتووکەکـەی لـەپێش خۆی دادەنا لێیڕادەما، تاکو هەڵەکانی خوێنـەری ڕاسـت دەکـردەوە، ئەگـەر لـە خوێندنەوە هەڵەی بکردایە[4].

---

١– علل الترمذي (٥/ ٧٠٥).

٢– الأنوار الكاشفة (ص: ٨٠).

٣– سير الأعلام (٥٦٨/٩).

٤– علل أحمد (٢٦١/١).

٤. ئەگەر لە پەرتووکی مامۆستاکە زیادەیەکیان لە دەرەوەی ئەسڵەکە یاخود بە خەتێکی نوێ پێچەوانەی خەتە کۆنەکە بینیبا، ئەوا وازیان لێدەهێنا، فەرموودەکەیان وەرنەدەگرت، بە لاواز حوکمیان بەسەردا دەدا[1].

٥. فەرموودەیان لەو مامۆستایە وەرنەدەگرت، کە لە پەرتووکێك وەریبگرتایە کە بەخۆی گوێبیست نەبووبێت لە نووسەرەکەی، نووسەرەکەش ڕێگەی بە گێڕانەوەکەی نەدابوایە، جا ئەگەر پەرتووکەکەش ناسراو بوایە، لەبەر ئەوە هەندێ لە فەرموودەناسان لە پەسەندکردنی گێڕانەوەی حەکەمی کوڕی نافیع وەستان، کە لە پەرتووکی شوعەیبی کوڕی ئەبی حەمزەی مامۆستای دەیگێڕایەوە، چونکە نەدەزانرا کە مامۆستاکەی ڕێگەی پێداوە بیگێڕێتەوە یان نا[2].

بەم شێوەیەش بە گێڕانەوەی بازانی کوڕی ئەبی سالح لە پەرتووکەکانی تەفسیر ڕازینەدەبوون، چونکە نە لای خوێندبووی، نە گوێبیستیشی ببوو لە نووسەرەکەی[3]. بە هەمان شێوە زاناکان گێڕانەوەی عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی حازمیان لە پەرتووکەکانی سولەیمانی کوڕی بیلال (١٠٠- ١٧٢ك) پەسەند نەدەکرد، چونکە لە سولەیمانی کوڕی بیلال گوێبیست نەببوو، هەروەها بۆشی نەخوێندبووەوە، لەگەڵ ئەوەی وەسیەتی کردبوو پەرتووکەکانی لای عەبدولعەزیز بێت[4].

بەڵکو هەندێ لە زانایان فەرموودەکانی ئەو پەڕاو و پەرتووکانەیان پەسەند نەدەکرد، هەتا ئەگەر نووسەرەکەش ڕێگەی بدایە بیگێڕنەوە، ئەگەر بۆ نووسەرەکەیان نەخوێندبایەوە، یاخود لەو نووسەرە گوێبیست نەبوونایە.

---

١- علل أحمد - رواية المروذي (ص: ١٢٧)، ميزان الإعتدال (٣/ ٣٩١)، (٤٥١/٤).

٢- علل أحمد - رواية المروذي (ص: ١٣٢)، تأريخ التراث العربي (١٤٠/١).

٣- علل أحمد رواية المروذي (ص: ١٧٧).

٤- علل أحمد - رواية أبي داود (ص: ٢٢١)، الجرح والتعديل (٣٨٢/٥).

ڕاجیایی گەورە لەنێو زانایان هەبوو، هەر لە سەردەمی شوێنکەوتووانەوە، لەسەر دروستیی خوێندنەوە بۆ مامۆستا، هەندێکیان بە مەرجیان گرتبوو کە دەبێت مامۆستا بەخۆی بیخوێنێتەوە و بۆ قوتابیەکانی بیگێڕێتەوە و باس بکات، تاکو هەڵە نەکات و مێشکی پەرت نەبێت لە کاتی خوێندنەوەی قوتابیەکانی بۆی، نەوەك لەو کاتەدا قوتابیەکان هەڵە بکەن و ئەویش لێیان بێئاگا بێت.

ئیبن جورەیج دەڵێت: "زانایان ڕاجیان لە دروستیی وەرگرتنی فەرموودە لە یەکێك سەحیفەیەك وەردەگرێت و دەڵێت ئەوەی تێدایە دەیگێڕمەوە و بۆ نووسەرەکەشی نەخوێندۆتەوە، بەڵام ئەگەر بۆی خوێندبێتەوە ئەوا یەك ڕان کە دروستە"[1]. زەهەبی دەڵێت: "گومانی تێدا نییە کە وەرگرتن لە پەڕاوەکان، ئەگەر بە مۆڵەتیش بێ – مۆڵەتدان لەلایەن نووسەرەکەوە بە گێڕانەوەی بەبێ خوێندنەوە بۆ نووسەرەکە یان گوێبیستبوون لێی – کەم و کووڕی تێدەکەوێت، بەتایبەت لەو سەردەمەدا، ئەو کات خاڵ و سەروبۆری تێدا نەبوو، وشەکە تێکدەچوو و ماناکەی دەگۆڕا، بەڵام ئەم شتە ڕوونادات کاتێك لە زاری زانایان وەردەگیرێت، بە هەمان شێوە باسکردن و گێڕانەوە بە لەبەرکردن ئەگەر هەڵەی تێبکەوێت، بە پێچەوانەی گێڕانەوە بە نووسینێکی وردبینی کراو کە کەم وایە هەڵەی تێبکەوێت"[2].

٦. پەرتووکەکانی زانایان و نووسینەکانیان دەکردە دادوەر و بۆی دەگەڕانەوە، ئەگەر قوتابیەکە فەرموودەیەکی لە مامۆستاکەی گێڕابایەوە و لە پەرتووکەکانی ئەودا نەبووبایە، ئەوا گێڕانەوەکەیان پەسەند نەدەکرد، بەڵکو بۆ پەرتووکەکانی مامۆستاکە دەگەڕانەوە، ئەگەر ئەو فەرموودانە لەو پەرتووکەدا هەبوبان، ئەوا پەسەندیان دەکرد، ئەگەر نا ڕەتیان دەکردەوە.

---

١– طبقات ابن سعد (٨٣/٦).

٢– سير الأعلام (١١٤/٧).

هەندێك لە گێڕەڕەوان فەرموودەیان لە عەبدولڕەزاق گێڕاوەتەوە، پێشەوا ئەحمەد پەسەندی نەکردووە، پێیوابووە کە پووچەڵە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەمانە لە پەرتووکەکانی عەبدولڕەزاقدا بوونیان نەبووە، ئەمەش بەسە بۆ حوکمدان بە پووچەڵی ئەم فەرموودانە[1]. بە هەمان شێوە بۆ پەرتووکەکانی عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك (١٨١ ك کۆچی دوایی کردووە) دەگەڕانەوە، ئەگەر لە فەرموودەیەکیدا ڕاجیاییان هەبووبایە[2]، لەبەر ئەوەی پەرتووکەکانی ناوبراو ناسراو بوون و زۆر دەستاودەستیان پێدەکرا لە نێو زانایاندا[3].

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموودەیەکی ڕەتکردەوە و پەسەندی نەکرد، بەڵگەی هێناوەتەوە بەوەی: (موحەمەدی کوڕی عوبێد پەرتووکێکی بە ئێمەدا کە لە میسعەرەوە ڕیوایەتی کردبوو و، ئێمەش لەبەرمان گرتەوە، ئەم پەرتووکە ئەم فەرموودەیەی تێدا نەبوو)[4].

نەبوونی فەرموودەکە لە پەرتووکەکەی میسعەردا، بەس بووە بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو فەرموودەیەی هەندێك لە قوتابیانی میسعەر گێڕاویانەتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی پەرتووك و نووسینەوە لایان.

٧. گێڕانەوەی ئەو قوتابیانەیان پێشدەخست و پەسەند دەکرد، کە لە پەرتووکی مامۆستاکەیان دەیاننووسییەوە و لەبەریان دەگرتەوە، بەسەر گێڕانەوەی ئەو قوتابیانەی کە گوێبیستی گێڕانەوەکە ببوون و نووسیبویانەوە لە لەبەر وتنی مامۆستاکەیان، پێشەوا ئەحمەد دەڵێت: "شەریکی کوڕی عەبدوڵڵای قازی پەرتووکێکی هەبوو، ئیسحاقی ئەزڕەق و عەببادی کوڕی عەووام و یەزیدی

---

١- سير الأعلام (٩/ ٥٦٨).

٢- علل أحمد - رواية المروذي (ص: ٨٥).

٣- طبقات ابن سعد (٢٦٣/٧)

٤- علل أحمد (٣/ ٣٤٧)، بۆ ئەم بابەتەش بگەڕێوە بۆ: تأريخ التراث العربي (١/ ١٤٣).

یـەمامی لەبـەریانگرتبووەوە، گێڕانـەوەی ئەمانـە زۆر چـاکترە لـە گێڕانـەوەی ئەوانەی تەنها گوێبیست بوون لە شەریك لە لەبەر وتنەکەی"[1].

شـەریك یـەکێك بـوو لـە شـەرعناس و دادوەر و فەرموودەناسـەکان (٩٠–١٧٧ك)، چەندین پەرتووك و نووسینی دەربارەی فەرمووده سەحیحەکان هەبوو، ئەگەر بە لەبەرکراوی دەیگێڕایەوە، ئەوا هەڵەی زۆری دەکرد[2].

هەروەك گێڕانەوە لە هەممامی کوڕی یەحیایان (١٦٤ك کۆچی دوایی کردووە) لە پەرتووکەکەی بە باشتریان دادەنا، لە گێڕانەوە بە لەبەرکراوی، لەبـەر ئـەوەی پەرتووکەکەی سەحیح و ڕێك و ورد بوو[3].

جیا لەمانەش لە مەرجی تـر کـە تێیـدا زۆر توونـد بـوون، کـە پـێش زانایـانی فەرمووده لای هیچ میللەتێکی تر بوونی نەبووە، مـەرجی گێڕانـەوەی پـەرتووك، چـۆنیەتی لەبەرگرتنـەوەی و ڕێگـەی خوێندنـەوەی بـۆ نووسـەرەکانیان دانـا، هەروەها مەرجەکانی گێڕەرەوەیان دانا، کە بوونیان پێویستە بۆ پەسـەندکردنی گێڕانەوەکەی، وەك دادگەریی و ڕاستگۆیی و ڕێك و ڕەوانی... تاد.

لەبەرئـەوە دەبیـنین موسـنەدی ئەحمـەد – وەك نموونـە – گێڕانـەوەی عەبـدولڕەحمانی کـوڕی مەهـدی لـە پـەرتووکی (الموطـأ)ی مـالیکی بـۆ ئێمـە گواستۆتەوە و پاراستویەتی، دەبینین لەنێوان ئەمە و فەرموودەکانی (الموطأ)ی لە گێڕانەوەی یەحیای کوڕی یەحیا کە چاپکراوە، هاوشـێوەبوونێکی زۆر گـەورە هەیە، هەروەك دەبینین ئەو فەرموودانەی ئەحمەد لە(جامع)ی موعەممەر، یاخود (صحیفة)ی هەممام، یاخود (مصنف)ی عەبدولڕەزاق هێناویەتی، تەواو وەك ئـەو

---

١– علل أحمد – رواية أبي داود – (ص: ٣٢١).

٢– الجرح والتعديل (٢/ ٤١٧)، تأريخ بغداد (٩/ ٢٨٠)، تهذيب التهذيب (٤/ ٣٣٥).

٣– علل أحمد – رواية أبي داود – (٣٣٥)، تهذيب التهذيب (١١/ ٦٧).

فەرموودانەن کە لەو پەرتووکانـەدان، پـاش دۆزینـەوە و بـەراوردکردنیان لەگـەڵ گێڕانەوەکانی نێو موسنەدی پێشەوا ئەحمەد.

مادەم کارەکە بەم شێوەیەیە، ئـەوا متمانـەمان بـە پەرتووکـەکانی تـر زیـاتر دەکات کـە ئەحمـەد لـە موسـنەدەکەی کۆیکردوونەتـەوە، کـە لـە مامۆسـتاکانی گێڕاویەتییـەوە – ئـەوانیش قوتـابی نووسـەرەکانیان بـوون – وەك (مصـنف)ی حەممادی کوڕی سەلەمە، (جامع)ی سەوری، (جامع)ی ئیبن جورەیج... تاد.

ئەی ئەگەر دەیـان سەرچـاوەی تـر ببـینی لـە موسـنەدەکان و سـونەنەکان و سـیحاحەکان و موعجەمـەکان، ئـەو پـەرتووك و سـوحوفانە لـەخۆدەگرێت کـە موسـنەدی ئەحمـەد لـەخۆی دەگرێـت، فـەرموودەکانی هاوشـێوەن لەگـەڵ ئـەو فەرموودانـەی کـە لـە موسـنەدی ئەحمـەد هـەن، ئەمـەش جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتەوە کە نووسەری ئەم فەرهەنگە گەورانە مادەکانی پەرتووکەکانیان لە یەك سەرچاوەوە وەرگرتووە، کە پێش ئـەو فەرهەنگانـە بوونیـان هـەبووە، دەکرێـت توێژەر تەنها بە بـەراوردکردنی ئـەو فەرموودانـەی کـە لـە موسـنەدی ئەحمـەددا هەن، لەگەڵ ئەو فەرموودانەی لە سەحیحی بوخاری و موسـلیم و سـونەنی ئـەبی داود و تورمزی و ئیبن ماجە و نەسائیدا هەن بەم ئەنجامە بگات، جا چـی ئەگـەر ئەمـە ڕاسـتییەکە بـێ و زاناکـان بـە ڕاشـکاوی باسـیان کردبـێ، ئەوانـەی ئـەو فەرهەنگە فەرموودەییانەیان نووسیوەتەوە، ئـەوا لەلایـەن توێـژەر پێویسـت بـە هەڵێنجان، یاخود توێژینەوە ناکات بۆ دڵنیابوونەوە، ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل هەر خۆی هەندێك لەو سەرچاوانەی کە لێی وەرگرتوون، یاخود بینیویەتی یاخود سوودی لێبینیوە باسکردووە. لەوانە:

١. پـەرتووکی هوشـەیمی کـوڕی بەشـیر (١٠٤- ١٨٣ك)، یـەکێك بـوو لـەو شێخانەی پێشەوا ئەحمەد کە فـەرموودەکانی لەبـەردەکرد، یـەکێك بـوو لـە زانـا گەورەکانی فەرموودە، لە پەرتووکەکانی بە قوتابیەکانی دەنووسییەوە[١].

٢. (موطـأ)ی مالیـك، قوتابیـانی مالیـك (موطـأ)یـان لای دەخوێنـد[٢]، لەوانـە عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی مامۆستای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، کە ئەحمـەد لە موسنەدەکەیدا (موطأ)ی لێ گێڕاوەتەوە.

٣. پەرتووکەکانی سوفیانی سەوری، سوفیان داوای لە یەحیای قەتتان کـرد، کـە بچێت بـۆ کوفـە و پەرتووکـەکانی بـۆ بێنێـت، تـاکو لـە پـەرتووکانی پێیـان بڵێتەوە[٣]، یـەحیای کـوڕی قـەتتانیش یـەکێك بـوو لـە مامۆسـتاکانی ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل، کە ئەحمەد زۆرێك لە فەرموودەکانی سەوری لێیەوە گێڕاوەتەوە.

ئەحمـەد هـەموو فـەرموودەکانی سـەوری لەبـەرکردبوو، لـەلای هەنـدێك لـە قوتابیـەکانی سـەوری نووسـیبویەوە، هـەروەها پـەرتووکی (الجـامع)ی سـەوری لەبەرگرتەوە کە لای ئەشجەعی بوو، کە قوتابی سەوری بوو[٤].

٤. پـەرتووکی شـەریکی کـوڕی عەبـدوڵڵای قـازی (٩٠- ١٧٧ك)، سـێ لـە قوتابیەکانی پەرتووکەکەیان لەبەرگرتەوە[٥]، ئەوانیش لە مامۆستاکانی ئەحمـەد بوون، کە بەهۆی ئەوانەوە ئەحمەد فەرموودەکانی شەریکی گێڕابۆوە.

---

١- علل أحمد (٢/٣٤٣)، سير أعلام النبلاء (١١/١٨٤)، لە موسنەددا (٣٣٥) فەرموودەی هەیە.

٢- علل أحمد (٢/ ٣٢١)، پێشەوا ئەحمەد (٥٩٤) فـەرموودەی لـە (الموطـأ) گێڕاوەتـەوە لـە ڕێگـەی عەبدولرەحمانەوە.

٣- علل أحمد (١/٢٦٧).

٤- سـير الأعـلام (١١/ ١٩٠)، پێشـەوا ئەحمـەد لـە موسـنەددا (١٦٢٦) فـەرموودەی لـە کتێبـەکانی سەوری گێڕاوەتەوە.

٥- علل أحمد – رواية أبي داود – (ص: ٣٢١)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٢١١) فەرموودەی هەیە.

٥. پـەرتووكی عەبدولعـەزیزی كـوڕی موحەمـەدی دراوەردی (١٨٧ك كۆچـی دوایـی كـردووە)، یـەكێك بـوو لـە مامۆسـتای مامۆسـتاكانی ئەحمـەد، ئەحمـەد لەبارەیـەوە دەڵێـت: "ئەگـەر لـە پـەرتووكی ئـەو گێڕدرایـەوە و باسـكرا ئـەوا سەحیحە..."[١].

٦. پەرتووكی ئیسرائیلی كوڕی یونس (١٠٠- ١٦٠ك)، ئەحمەد باسی دەكات و دەڵێت: "ئەگەر لە پەرتووكەكەی خۆی بیگێڕێتەوە ئەوا هیچ لەبیر ناكات"[٢].

واتـە: هـیچ شـتێكی لـەبیر ناكـات، هـەتا پیتێكیشـی بـەجێناهێڵێت، بـەڵكو فەرموودەكە وەك ئەوەی لە پەرتووكەكەیدا هەیە دەیخوێنێتەوە، ئەمـەش لەبـەر ڕێكی و ئەو وردبینیەی.

ئیسـرائیل فـەرموودەكانی ئـەبو ئیسـحاقی سـەبیعی بـاپیری (٢٩- ١٢٧ك) لەبەردەكرد، وەك چۆن سوڕەتێكی قورئانی لەبەردەكرد[٣].

ئەبو ئیسحاق یەكێكە لە زانا گەورەكان لە شوێنكەوتووانی هاوەڵان، ژمـارەی مامۆسـتاكانی نزیكـەی (٤٠٠) مامۆسـتا بـوو لـە گـەورە هـاوەڵان و جیـا لەمانەش[٤]،یونسی كوڕی و ئیسرائیلی نەوەی كە خـاوەنی پـەرتووكی زۆر بـوون فەرموودەكانی ئـەویان نووسـینەوە[٥]، مامۆسـتای ئەحمـەدی كـوڕی حەنبەل بوو، ئەبو ئیسحاقی باپیری فـەرموودەكانی پێدەنووسـییەوە[٦]، دەیـان

---

١- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٢٢١)، لە موسنەدی ئەحمەددا (١٣) فەرموودەی هەیە.

٢- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٣١١)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٤٥٩) فەرموودەی هەیە.

٣- تأريخ بغداد (٧/ ٢١)، وتهذيب التهذيب (١/٢٦٢).

٤- تهذيب التهذيب (٨/٦٥)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٧٤٤) فەرموودەی هەیە.

٥- تأريخ بغداد (٧/٢٢).

٦- تهذيب التهذيب (١/٢٦٢).

زانا فەرموودەکانی ئەبو ئیسحاقیان نووسییەوە، دواتر بۆیان خوێندەوە، لەوانە سەوری و شوعبە و شەریك و جیا لەمانەش لە نووسەرانی فەرموودە.

٧. پەرتووکی ئیبن جورەیج، یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتان لەبەریگرتەوە، هەموو ڕۆژێك پەنجا فەرموودەی بۆ ئیبن جورەیج دەخوێندەوە[١]، یەحیای قەتتان یەکێك بوو لە گەورە مامۆستاکانی ئەحمەد، کە بەهۆی ئەوانەوە فەرموودەی لە پەرتووکی ئیبن جورەیج گێڕایەوە.

٨. پەرتووکی هەممامی کوڕی یەحیا (١٦٤ك کۆچی دوایی کردووە)، لە پەرتووکەکەی فەرموودەی دەوتەوە پاش نەخۆشکەوتن، پەرتووکەکەشی سەحیح بوو[٢]، یەکێك بوو لە مامۆستای مامۆستاکانی ئەحمەد، کە لەوانەوە فەرموودەی لە موسنەدەکەی گێڕاوەتەوە.

٩. پەرتووکی ئەشجەعی کە دانەیەکی لەبەرگیراوەیە لە پەرتووکی (جامع)ی سوفیانی سەوری، ئەشجەعی لە کۆڕی سوفیان فەرموودەی دەنووسییەوە، لەبەر ئەوە پەرتووکەکەی سەحیح بوو، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بینیویەتی و تەماشای کردووە[٣].

١٠. پەرتووکی زەکەریای کوڕی ئەبی زائیدە (١٤٨ك کۆچی دوایی کردووە)[٤]، ئەحمەد هەندێك فەرموودەی لە پەرتووکی زائیدە لە موسنەد گێڕاوەتەوە.

---

١- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٣٥٠)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٦٥٥) فەرموودەی سەحیح هەیە لە کتێبی ئیبن جورەیج.

٢- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٣٣٥)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٤٦١) فەرموودەی هەیە.

٣- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ١٧٥)، (٣٦٧).

٤- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٢٩٨)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٢٢٤) فەرموودەی هەیە.

١١. پەرتووكی ئەبو زینادی عەبدوڵڵای كوڕی زەكوان (٦٤– ١٣٠ك)[١]، یەكێك بوو لە زانا شەرعناسەكان، چەندین دانراوی هەن[٢]، پێشەوا ئەحمەد زۆر فەرموودەی لەوەوە لە ڕێگەی ئەعرەجەوە لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوەتەوە[٣].

١٢. پەرتووكی سولەیمانی كوڕی میهرانی ئەعمەش (٦١– ١٤٧ك)[٤]، یەكێك بوو لە لەبەركارە گەورەكان، قوتابی ئەبو ئیسحاقی سەبیعی بوو، لە ئەبو ئیسحاقەوە فەرموودەی دەنووسییەوە[٥]، هەروەك ئەعمەش (١٠٠٠) فەرموودەی لە ئەبو ساڵح، زەكوانی سەمانەوە نووسییەوە[٦]، كە یەكێك بوو لە قوتابییانی ئەبو هورەیرە.

١٣. پەرتووكەكانی ئەبو قیلابە كە وەسیەتی كردن بۆ ئەیوبی سەختیانی قوتابی[٧].

١٤. پەرتووكی بەشیری كوڕی نەهیك كە لە ئەبو هورەیرەوە نووسیویەتی[٨].

١٥. موسەنەفەكان و پەرتووكەكانی سەعیدی كوڕی ئەبو عەروبە، كە یەزیدی كوڕی زەریعی قوتابی لەبەریكردبوون[١]، كە یەكێك بوو لەو مامۆستایانەی كە ئەحمەد لە موسنەدەكەی فەرموودەكانیانی گێڕاوەتەوە.

---

١– علل أحمد – رواية أبي داود – (ص: ٢٦٣)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٢٥٥) فەرموودەی هەیە.

٢– تأريخ بغداد (١٠/ ٢٣٠)، وتهذيب التهذيب (٥/٢٠٥).

٣– ئیسنادەكەی لە ڕاسترین ئیسنادە لە ئەبو هورەیرەوە، بڕوانە: سير الأعلام (٢/٦٠٩).

٤– علل أحمد (٢/٣٣٢)، تأريخ بغداد (٩/١٠– ١١)، لە موسنەدی ئەحمەددا (١١٢٥) فەرموودەی هەیە.

٥– علل أحمد(٢/ ٣٣٢).

٦– علل أحمد – رواية أبي داود – (ص: ٢٩٢).

٧– علل أحمد (٢/ ٣٨٦)، و لە موسنەدی ئەحمەددا ئەبو قیلابە (١٩٨) فەرموودەی هەیە، ئەیوبیش (٥٢٩) فەرموودە.

٨– علل أحمد (١/ ٢١٥)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٣٥) فەرموودەی هەیە.

١٦. (موطـأ)ی ئـيبن ئـەبی زيئـب، کـە لـە سـەردەمی ئەحمـەد زۆر ناسـراو و بــەناوبانگ بــوو[٢]، ئەحمــەد چــەند فەرموودەيــەکی لــەم پەرتووکــەی لــە موسنەدەکەی گێڕاوەتەوە.

١٧. پەرتووکی هيشامی کوڕی عەبدولمەليکی تەياليسـی (١٣٣– ٢٢٧ك) کـە نووســينەکەی خــاڵ و ســەروبۆری نــەبوو، لەبــەر ئــەوە ئەحمــەد ڕەخنــەی لێگرتووە[٣]، هيشام يەکێك بوو لە مامۆستاکانی ئەحمەد.

١٨. پــەرتووکی ئيسـماعيلی کـوڕی عەلييـە – مامۆسـتای ئەحمـەد بـوو – چوارسـەد فـەرموودەی کـە لـە ئـيبن عەونـەوە گێڕابـووەوە تێـدا بـوو، نۆسـەد فەرموودەشـی لـە يونسـەوە تێـدابوو، لەگـەڵ فـەرموودەی تـری لـە ئەيوبـەوە تێدابوو[٤].

١٩. پەرتووکی هيشامی دوستوائی (٧٤– ١٥٢ك) کەعوسمانی کوڕی عومـەر، لە ڕەوحی کوڕی عوبادەوە خوداستبووی[٥].

ئەحمەد سەيری دانەيەکی لەبەرگيراوەی کتێبەکەی ئيسماعيلی کـوڕی عەليـە لـە هيشـامەوە کـردووە، بينيويـەتی کـە زۆر باشـە، پەرتووکـەکانی هيشـام لای مەعازی کوڕی بوو، هەروەها هيشام لە قـەتادەی مامۆسـتای نزيکـەی دە هـەزار فەرموودەی نووسيوەتەوە[٦].

---

١– علـل أحمـد (٢/ ٣٥٧)، لـە موسـنەدی ئەحمـەددا (٤٠٠) فـەرموودەی هەيـە لـە کتێبـەکانی ئـەبو عەروبە.

٢– علل أحمد (١/ ٣٥٤)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٢٧٧) فەرموودەی هەيە.

٣– علل أحمد (٢/ ٣٦٩)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٣٦) فەرموودەی هەيە.

٤– علل أحمد (٢/ ٣٦٣)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٦٠٢) فەرموودەی هەيە.

٥– علل أحمد (٢/ ٣٥٤)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٣٥٥) فەرموودەی هەيە.

٦– تهذيب التهذيب (١٠/ ١٩٧).

٢٠. (جامع)ی ئیبن جورەیج، کە لای حەجاجی کوڕی موحەمەدی قوتابی بوو[1].

٢١. پەرتووکی موحەمەدی کوڕی جەعفەر، چەند فەرموودەیەکی لە سوفیانی کوڕی عوەیینەوەی تێدا بوو[2].

٢٢. پەرتووکی موحەمەدی کوڕی عوبەید لە میسعەرەوە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە موحەمەدی کوڕی عوبەیدەوە وەریگرتووە و لەبەریگرتۆتەوە[3].

٢٣. پەرتووکەکانی شوعەیبی کوڕی ئەبی حەمزە (٩٠- ١٦٢ك)، ئەحمەد دەڵێت: "پەرتووکەکانی شوعەیبی کوڕی ئەبی حەمزەم بینیوە و هەموویان چاککرابوون"[4]، واتە: خاڵ و سەروبۆری بۆ کراوە، پەرتووکەکانی لای بەشیری کوڕی بوون[5]، ئەحمەد تەماشای کردوون، ئەحمەد زۆر سەرسام بووە بە جوانی پەرتووکەکانی شوعەیب و جوانی خەتەکەی و باشییەکەی[6]، شوعەیب یەکێك بوو لەو قوتابییە گەورانەی زوهری کە فەرموودەکانی زوهرییان بۆ خەلیفە هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکی ئەمەوی (١٢٥ك کۆچی دوایی کردووە) نووسییەوە[7]،، ئەحمەد لە موسنەدەکەی لە شوعیبەوە فەرموودەکانی گێڕاوەتەوە.

---

١- علل أحمد (٢/٥٥١).

٢- علل أحمد (١/ ٣٠٥)، لە موسنەددا (١٧٦٨) فەرموودەی لە موحەمەدی کوڕی جەعفەرەوە و (٧٩٠) فەرموودەی لە سوفیانەوە گێڕاوەتەوە.

٣- علل أحمد (٣/٣٤٧).

٤- علل أحمد - رواية أبي داود - (٢٦٣)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٩٥) فەرموودەی هەیە.

٥- علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٢٦٦)، هەروەها بڕوانە: علل أحمد - رواية المروذي - (ص: ١٣٢).

٦- الجرح والتعديل (٣/ ٣٤٥)، نوسخەیەکی دەسنووسی هەیە لای دکتۆر ئەعزەمی - دراسات في الحديث (٢/ ٤٧١).

٧- تذكرة الحفاظ (١/ ٢٢١)، تهذيب التهذيب (٤/٣٥١)، تأريخ التراث العربي (١/١٣٤).

٢٤. صــەحیفەی ئــەبو زوبــەیر لــە هــاوەڵی بــەڕێزەوە جــابیری کــوڕی عەبدوڵلاوە[1].

٢٥. تەفسیری قەتادە[2].

٢٦. پەرتووکەکانی سولەیمانی کوڕی بیلالی مەدەنی (١٠٠– ١٧٢ك)[3].

٢٧. پــەرتووکی شــوعبەی کــوڕی حــەججاج (٨٠– ١٦٠ك)، قوتابیــەکانی لەبەریاندەگرتەوە، پاشان شوعبە بە لەبەرکردن بۆی دەوتنەوە[4].

٢٨. پەرتووکەکانی عەبدوڵلای کوڕی موبارەك (١٨١ك کۆچی دوایی کردووە)، زۆر بەناوبانگ بوون، ئەگەر فەرموودەناسان لە شتێك لە فەرموودەکانی ئیبن موبارەك ڕاجیاییان بکەوتایە نێوان، ئەوا دەگەڕانەوە بۆ ئەو پەرتووکانەی ئەو کە قوتابیەکانی لەبەریانگرتبوەوە[5].

٢٩. پەرتووکی عوبەیدوڵلای کوڕی عومەر، لە نافیعەوە، یەحیای قەتتان – مامۆستای ئەحمەد – لە کاتی ڕاجیایی لە فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی نافیع بۆ ئەم پەرتووکە دەگەڕایەوە[6].

---

١– علل أحمد – رواية أبي داود – (ص: ٢٢٨)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٦٠٣) فەرموودەی هەیە.

٢– علل أحمد – رواية أبي داود – (ص: ٣٤٧).

٣– علل أحمد – رواية أبي داود – (ص: ٢٢١)، بڕوانە: تهذيب التهذيب (٤/ ١٧٦)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٦٤) فەرموودەی هەیە.

٤– علل أحمد (١/ ٢٦١)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٢٦١٠) فەرموودەی هەیە.

٥– علل أحمد – رواية المرُّوذي – (ص: ٨٥)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٣٣٩) فەرموودەی هەیە.

٦– علل أحمد – رواية المرُّوذي – (ص: ١٤٨)، نافیع لە موسنەددا (٩٢٥) فەرموودەی هەیە، و عوبەیدوڵلاش لە موسنەددا (٣٥٣) فەرموودەی هەیە، ئەم پەرتووکە دەستنووسەکەی لای دکتۆر ئەعزەمیە، بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/ ٤٧١).

٣٠. موسەنەفی وەکیعی کوڕی جەڕاح (١٢٩– ١٩٦ك) مامۆستای ئەحمەد بوو، یەکێك بوو لە گەورە قوتابیانی سەوری، پەرتووکی (المصنف)ی نووسی، پێشەوا ئەحمەد ئەم پەرتووکەی لەبەربوو، هەروەك دانەیەکی لەبەرگیراوەی لابوو[1].

لەبەر ئەوە ئەحمەد ژمارەی فەرموودەکانی وەکیعی باش دەزانی کە جیاواز بوون لەوەی عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی[2]، کە هەردووکیان مامۆستای ئەحمەد بوون، چونکە بەراوردی لەنێوان ئەو گێڕانەوانە دەکرد کە لە پەرتووکەکانیاندا هەبوون، هەروەها فەرموودەکانی لەبەربوون و لەبەرگیراوەی ئەوانیشی لابوون.

پێشەوا ئەحمەد قوتابییەکانی هاندەدا کە پێویستە دانەی لەبەرگیراوەی موسەنەفەکانی وەکیعیان لابێت[3].

٣١. پەرتووکی عەبدوڵڵای کوڕی ئیدریس (١٩٢ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێکە لە مامۆستاکانی ئەحمەد، ئەحمەد دانەیەکە لەبەرگیراوەی پەرتووکەکەی هەبوو[4].

٣٢. موسەنەفەکانی عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی (١٩٨ك کۆچی دوایی کردووە)، یەکێك بوو لە گەورە مامۆستایانی ئەحمەد[5].

٣٣. پەرتووکەکانی یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتان (١٢٠– ١٩٨ك)، یەکێك بوو لە گەورە زانایانی فەرموودە لە سەردەمی خۆیدا[6]، هاوتای ئیبن مەهدی

---

١– سیر الأعلام (١١/ ١٨٦)، لە موسنەدی ئەحمەددا (١٧٩٨) فەرموودەی هەیە، بڕوانە: دراسات في الحدیث (٢/ ٤٧١).

٢– سیر الأعلام (١١/ ١٧٤).

٣– سیر الأعلام (٩/١٥٤)، لە موسنەدی ئەحمەددا (٤٩) فەرموودەی هەیە.

٤– سیر الأعلام (١١/ ٢١٥).

٥– سیر الأعلام (٩/ ١٧٧)، لە موسنەدی ئەحمەددا (١٠٥٧) فەرموودەی هەیە.

٦– سیر الأعلام (٩/ ١٧٧).

بوو، قوتابی سەوری و شوعبە و مالیك و جیا لەمانەش بوو، سەوری مامۆستای داوای لێکرد کە پەرتووکەکانی بۆ بخوێنێتەوە، تا بۆی ڕاست و چاك بکاتەوە، هەروەك ئەم کارەی لەگەڵ پەرتووکەکانی زائیدەی کوڕی ئەبی قودامە کرد، یەحیا قەتتان ڕەتی کردەوە کە پەرتووکەکانی بۆ مامۆستاکەی بخوێنێتەوە[1].

ئەحمەد فەرموودەکانی یەحیای قەتتانی نووسیوەتەوە[2].

شوعبەی کوڕی حەججاجی مامۆستای، ئەگەر لەگەڵ قوتابییەکانی لە گێڕانەوەی فەرموودەیەك ڕاجیاییان هەبایە، ئەوا بۆ یەکلاییکردنەوە بۆ لای ئیبن قەتتان دەگەڕانەوە[3].

یەحیای قەتتان پەرتووکەکانی دایە دەست ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە قوتابی ئەو بوو، ئەویش لەبەری گرتنەوە[4].

ئەمە هەندێك سەرچاوە و پەرتووك بوون پێش سەردەمی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (١٦٤- ٢٤١ك)، کە هەر لە تەمەنی ١٦ ساڵییەوە دەستی بە نووسینەوەی فەرموودە و لەبەرکردنی کردوە[5]. لە تەمەنی چل ساڵیدا دەستی بە نووسییەوەی موسنەد کرد، واتە: لە دەوروبەری ساڵی (٢٠٠ك)، پاش ئەوەی ساڵی (١٩٧ك) بووە موفتی[6]، ئەحمەد لە پەرتووکەکەی (العلل) مەبەستی نەبوو کە باسی ئەو سەرچاوانە بکات کە فەرموودەی لێوەرگرتووە، بەڵکو بۆ نیشاندان باسی کردووە، نەوەك بە مەبەست لەبەر هۆکارێك لە هۆکارەکان، وەك: بۆ

---

١- سير الأعلام (٩/ ١٨٤).

٢- سير الأعلام (٩/ ١٧٨)، لە موسنەدی ئەحمەددا (١٣٠٨) فەرموودەی هەیە.

٣- سير الأعلام (٩/ ١٨٠).

٤- سير الأعلام (١١/ ١٨٩).

٥- سير الأعلام (١١/ ١٧٧- ١٧٩).

٦- سير الأعلام (١١/ ١٩١).

ئاگاداربوون لە لاوازی گێڕەرەوە، یاخود توانای لەبەرکردنەکەی ڕێك و ڕەوانی نووسینەوەی و شتی لەم جۆرە، ئەحمەد خۆی چاوی بەم سەرچاوانە کەوتووە، بۆیە توانویەتی وەسفیان بکات و لێیان بگوازرێتەوە و حوکمیان لەسەر بدات. زۆربەیان پێش ناوەڕاستی سەدەی دووەم نووسراونەتەوە، هەندێکیشیان پەرتووکی سەدەی یەکەمن.

ئەوەی کە ئەم ڕاستییە دوپات دەکاتەوە ئەوەیە کە ئەحمەد ڕەخنەی لە موحەمەدی کوڕی ئیسحاق (١٥١ك کۆچی دوایی کردووە) گرتووە، لەبارەیەوە دەڵێت: "پەرتووکی خەڵکی وەردەگرێ و لەناو پەرتووکی خۆی دادەنێ"[(١)]، واتە: پەرتووکی کۆنی بەناوبانگ هەبوون، موحەمەدی کوڕی ئیسحاق لێی وەردەگرتن و لێی هەڵدەهێنجان، لەو پەرتووکەی خۆیدا دایدەنا، لەگەڵ ئەوەی بۆ نووسەرەکەی نەیخوێندبووەوە – هەروەك ڕێگەی فەرموودەناسان بەم شێوەیە بوو – لەبەر ئەوە فەرموودەناسان ڕەخنەیان لێگرتووە، بێگومان ئەو پەرتووکانەی کە ئیبن ئیسحاق فەرموودەی لێوەرگرتووە، پەرتووکی کۆتاییەکانی سەدەی یەکەم و سەرەتاکانی سەدەی دووەم بوون، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل هەموو ئەم فەرموودانەی دەناسینەوە و هەروەها ئەوانەشی دەناسینەوە کە ئیبن ئیسحاق گوێبیستی بووبوو لە مامۆستاکانی و ئەوەشی کە گوێبیستی نەبووبوو لە پەرتووك و فەرموودەکانی[(٢)].

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بە هەموو ئەو سەرچاوانە گەیشتووە کە لێی گێڕاونەتەوە و لێی وەرگرتوون، لەبەر ئەوەش کە لە توندگیرەکان بووە لە نووسینەوەدا، وێڕای ئەوەی لە گەورە لەبەرکارەکان بوو، بەڵام پێیوابوو کە نووسینەوە چاکتر و باشترە لە یادەوەری (الذاكرة)، بەتایبەت لە سەدەی دووەم

---

١– تأريخ بغداد (١/٢٢٩)، تهذيب الكمال (٢٤/ ٤٢١)، والمفصل في تأريخ العرب (٩/ ٢٦٩).

٢– تهذيب الكمال (٢٤/ ٤٢١).

که سەنەدەکان زۆر بوون و ژمارەی فەرموودەکان چەندانە بوونـەوە بـە ژمـارەی قوتابیانی هـەموو مامۆسـتاکان، لەبـەر ئـەوە فـەرموودەی نەدەوتـەوە تـەنها لـە پەرتووکی خۆی نەبێت، بۆ ئەمەش فەرمانی بە هاوەڵانی دەکرد[1].

ئەحمـەد کاتێـك لـە (موطـأ)ی مالیـك فـەرموودەی لـە موسـنەدی خـۆی دەگێڕایەوە، ئەو پێشتر (موطأ)ی لای عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی مامۆسـتای خوێندبوو، کە ئەویش (موطأ)ی مالیکی لەبەرگرتبووەوە و بـۆی خوێنـدبووەوە، مالیکیش پەرتووکەکانی مامۆسـتاکانی لەبەردەگرتنـەوە، پـێش ئـەوەی (موطـأ) بنووسێتەوە، چەند دانەیەکی لەبەرگیراوەی لە پەرتووکـەکانی زوهـری و نـافیع و بەکیری کوڕی عەبدوڵڵای هەبوو، جیا لەمانەش لە پەرتووکەکانی زانایانی مەدینە لە قوتابیانی هاوەڵان، ئەوانـەی فـەرموودەکانی هاوەڵانیـان نووسـییەوە، یـاخود ئەو پەرتووکانەی هاوەڵانیان لەبەرگرتنەوە کە فـەرموودەکانیان نووسـیبوونەوە، یــاخود لــە پێغەمبــەرەوە (درووود و ســڵاوی خــودای لــێبێ) فــەرموودەیان لەبەرکردبوو.

موسنەد گوزارشتە لە فەرهەنگێك، کـە ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل زۆرێـك لـە پەرتووك و سوحوفەکانی پێش سەردەمی خۆی تێدا کۆکردۆتەوە، کە گوێبیستی بـووە، یـاخود خوێندویەتیـەوە بـۆ قوتابیـانی نووسـەرەکانیان، یـاخود قوتـابی قوتابی نووسـەری ئـەم پەرتووکانـە، کـە دانەیـەکن لـەو بەڵگەنامـە نووسـراوانای کە(مۆیەر) بەدوایدا دەگەڕێت.

موسنەدی ئەحمەد کە بە دەستی خـۆی نووسـییەوە، تـا سـەدەی پێنجـەمی کۆچی مایەوە، فەرموودەناس و مێـژوونووس خـەتیبی بەغـدادی (٤٦٢ك کۆچـی دوایـی کـردووە) چـاوی پێکـەوتووە و وەسـفی کـردووە، دەڵێـت: "پـەرتووکی

---

١- سير الأعلام (١١/ ٢٠٠).

ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم بینی، کە بەدەستنووسی خۆی بوو، لەنێوان هەموو دوو فەرموودەیەك بازنەیەك هەبوو، هەندێك لە بازنەکان خاڵێکی لە ناوەڕاست بوو، هەندێکی تریشیان خاڵی لەسەر نەبوو"[1]، عەبدوڵڵای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل پرسیاری لە باوکی کردووە دەربارەی ئەو بازنانە و ئەو خاڵەی لە ناوەڕاستیەتی، وتویەتی: "ئەگەر یەکێك هەڵەی کرد من دەزانم، پێم وت: من سێ جار گوێم لێبووە"[2]، واتە: بە ژمارەی ئەو جارانەی کە فەرموودەی لە مامۆستاکەی گوێبیست بووە خاڵەکانی دادەنا[3]، هەموو ئەمەش بەڵگەیە لەسەر وردبینی و ڕێك و ڕەوانی ئەم زانایە.

بەڵگەش لەسەر وردبینی و پشکنینی ئەحمەد، ئەوەیە کە شافیعی مامۆستای داوای لێکرد کە لای ئەو کامە فەرموودە ڕاستییەکەی سەلمێنراوە، ئەوا پێی بڵێت بۆ ئەوەی کاری پێبکات، گەواهی ئەوەی بۆ دا کە ئەو لە گێڕانەوە سەحیحەکان زاناترە[4].

سێ هەزار قوتابی لە کۆڕی ئەحمەد دادەنیشتن، لەوانە پێنج سەدیان فەرموودەیان دەنووسییەوە کە لە پەرتووکەکانی خۆی بۆی دەخوێندنەوە[5]، ئەحمەد پاش مردنی، پەرتووکی زۆری دوای خۆی بەجێهێشت[6].

هەموو ئەو فەرموودانەی کە ئەحمەد لە موسنەدەکەی خۆی لەبارەیەوە وتویەتی: (بۆی گێڕاینەوە: حدثنا)، لەڕاستیدا بەڵگەنامەی نووسراون – پەرتووك

---

١– الجامع لأخلاق الراوي وأداب السامع: أحمد بن على الخطيب البغدادى (١/ ٢٧٣) – تحقيق د. محمود الطحان – ط ١٠، ١٩٨٣، المعارف – الرياض.

٢– الجامع في أداب الراوي وأخلاق السامع (٢٧٤/١).

٣– دراسات في الحديث النبوي (٣٤٩/٢).

٤– سير الأعلام (٢١٣/١١).

٥– سير الأعلام (٣١٦/١١).

٦– سير الأعلام (١٨٨/١١).

یان سوحوفن – ئەحمەد لەبەری گرتوونەوەتەوە، بۆ مامۆستاکەی خوێندۆتەوە، یاخود لەوانەوە گوێی لێبووە، لە پاش ئەمە لـە موسـنەدەکەی وتویـەتی، فلانـە کـەس بـۆی گێڕاینــەوە (حـدثنا فـلان) و (حـدثنا فـلان)، چـونکە بـەم ڕێگەیـە فەرموودەکە بۆ ئەو سەرچاوەیە دەگەڕێنرێتەوە کە لێیوەرگرتووە، بەبێ ئەوەی بلێت: (فلانە کەس بۆی گێڕاینەوە لەو پەرتووکەی کە دانەیەکی لەبەر گرتبـوو و بـۆی خوێنـدبووەوە)، بـەڵکو زانایـانی فـەرموودە گوزارشـتی (بـۆی گێڕاینــەوە: حدثنا) کورتکردۆتـەوە و کردویانەتـە (ثنـا)، بـۆ ئـەوەی کـەمترین پـەڕاو خـەرج بکەن.

ئەحمــەد هــەزاران فــەرموودەی نووســی و لەبــەرکرد، دەیــان پــەرتووکی فەرموودەی هەبوو، کە نزیکەی (٧٥٠٠٠٠) فەرموودە و گێڕانەوەی لە پێغەمبەر و هاوەڵان و شوێنکەوتووان تێدا بـوو[1]، لەگـەڵ ئـەوەش ئەحمـەد لـەو گێڕانەوانـە نزیکـەی (٣٠٠٠٠) فــەرموودەی هەڵبــژارد – کــە زۆربــەیان دووبــارەبوون – لــە پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) هەڵیبژاردن.

ئەو مامۆستایانەی کە لێیانەوە گوێبیست بووە، یاخود ئەو پەرتووکانەی بۆی خوێندوونەتەوە، ئەوانەی لە موسنەدەکەی خۆی پشـتی پێبەسـتوون، زیـاتر لـە دووسەد و هەشتا مامۆستا و زانا دەبوو[2]، ئەمانە لە گـەورە زانایـانی فـەرموودە بوون، لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەم.

ئەحمــەد ســێ هــەزار فــەرموودەی لــە پــەرتووکی هوشــەیمی مامۆســتای لەبەرگرتــەوە، دواتــر لەبــەریکردن[3]، بــەڵام تــەنها ســێ ســەد و ســی و پێــنج فەرموودەی لە هوشەیمەوە لە موسنەدەکەی خۆی باسکردووە، واتە: سەدا دەی

١– سير الأعلام (١٨٧/١١)، (١١/ ٣٢٨)، ئەمە لەگەڵ دوبارەوەبووەکاندا.

٢– سير الأعلام (١١/ ١٨١).

٣– سير الأعلام (١١/ ١٨٣).

گێڕانەوەکانی پەرتووکی هوشەیم، ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە هەموو پەرتووکەکان سەحیحترین فەرموودەی تێدا هەڵبژاردووە.

هەموو ئەو موسنەد و موسەنەفانەی زانایان، لە نیوەی دووەمی سەدەی دووەم نووسییان، فەرهەنگی فەرموودەیی بوون، کە لە دوو توێی بەرگەکەیدا کۆنترین دانەی لەبەرگیراوە و پەرتووکی لەخۆدەگرت، کە توانیان لە ونبوون و لەناوچوون بیانپارێزێت، توێژەران دەتوانن بەراورد لەنێوان ئەو فەرموودانەی کە لەو فەرهەنگانەدا هەیە و ئەو سەرچاوە کۆنانەی کە لێیان وەرگرتوون بکەن، بۆ ئەوەی بزانن تا چ ڕادەیەك هاوشێوەن[١].

## ٢. ئەو گومان و بۆچوونەی کە دەڵێت: ئەو فەرموودانەی کە لە سەردەمی ئەمەوی بڵاوبوون، پەیوەندییان بە فیقهەوە نەبووە، ئەمەی خودارەوە وەڵامەکەیەتی:

١. ڕاجیایی لەنێوان مێژوونووساندا نییە، کە سەردەمی ئەمەوییەکان دوای خەلیفە موعاویە دەستی پێکرد، کە دەستەڵاتەکەی لە ساڵی (٤٠ تا ٦٠ك) بەردەوام بوو[٢]، ئەم سەردەمە بە کوشتنی کۆتا خەلیفەی ئەمەوی ساڵی (١٣٢ك) کۆتایی هات[٣].

کۆتا هاوەڵیش لە دەوروبەری ساڵی (١٠٠ك) کۆچی دوایی کرد، لەوانە ئەنەسی کوڕی مالیك –خزمەتکاری پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) – یەکێك بوو

---

١– بڕوانە: تأريخ ابن خلدون (١/ ٤٢٢) باسی کردووە کە لە سەردەمی ئەو – سەدەی هەشتی کۆچی – کە سەرچاوەی کۆن هەبوون لە نووسراوەکانی زانایان لە سەدەکانی سەرەتا کە بەڵگەیە لەسەر ڕادەی وردبینی و ڕێك و ڕەوانی لە نووسین.

٢– سير الأعلام (٣/ ١١٩ – ١٦٢)، الإصابة (٣/ ٤٣٣)، تهذيب التهذيب (١٠/ ٢٠٧).

٣– سير الأعلام (٧٦/٦).

لە زانا لەبەرکارەکان[1]، واتە سەردەمی هاوەڵان دوو سێیەکی سەردەمی ئەمەوی دەگرێتەوە لەساڵی (٤٠ تا ١٠٠ك)، ئایا (گۆلدزیهەر و شاخت) مەبەستیان ئەوەیە کە هاوەڵان لەم سەردەمدا – کە هەزاران کەس دەبوون لە هەموو شـار و وڵاتـان بڵاوببونەوە[2]– ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) لە وتە و ئەو شتانەی کە بینیبوویان لە کردەوەکـانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) لـە پەرسـتش و مامەڵـەکان گوێبیسـت بووبـوون بـۆ قوتابیـەکانیان بـاس نەدەکرد و نەدەوتەوە؟! هەروەها ئـەوان لـەو ماوەیـەدا کاروبـاری ئاینیـەکانیان نیشانی موسوڵمانان نەدەدا؟! ئایا ئەو کـات سـەدان دادوەر بوونیـان نـەبوو کـە دادوەرییـان لـەنێوان خـەڵکی دەکـرد لەسـەر کاروبـاری ژیانیـان بـە گـوێرەی شەریعەتی ئیسلامی؟! ئایا دەیان زانا و شەرعزان بوونیان نەبوو، کە کۆششـیان دەکرد بۆ هەڵێنجان و دەرهێنانی حوکم لە قورئان و سوننەتدا؟!

زۆرێك لە زانایانی هاوەڵان لەو سـەردەمدا لـە ژیانـدا مـابوون، وەك عائیشـەی خێزانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) ، ئیبن عەبباس، ئەبو هورەیرە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس، جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، ئەنەسی کوڕی مالیك ...تاد.

چ شتێك ڕێگر بوو لەوەی موسوڵمانان ئـەو فەرموودانـەی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) نەڵێنـەوە، کـە پەیوەنـدییان بـە فیقهـەوە هـەبوو، ئـەو فەرموودانەی کە لە هەموو بوارەکانی ژیان پێویستیان پێبووە، لە پاك و خاوێنی و نوێژ و زەکات و ڕۆژو و کڕین و فرۆشتن و تەڵاق و هاوسەرگیری و میرات...تاد؟

١- إحكام الأحكام (٤/ ١٥٢)، سير الأعلام (٣/ ٣٩٥)، الإصابة (١/ ٧١).

٢- إحكام الأحكام (١٧٧/٤).

٢. ئیبن عەبباس وانەکانی خۆی دەربارەی فیقه و تەفسیر لە مزگەوتی حەڕام لە مەککە دەوتەوە، سەدان قوتابی لە وانەکانی ئەو دادەنیشتن[1]. جابیری کوڕی عەبدوڵڵا لە مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینە کۆڕی وانەوتنەوەی هەبوو سەدان کەس تێیدا دادەنیشتن[2]. ئەنەسیش لە بەسرە و عەبدوڵڵای کوڕی عەمر لە میسر... تاد.

قوتابیانی ئەم هاوەڵانە کە دواتر بوونە زانای گەورە، ئەوانەی تەمەنیان درێژ بوو و زۆرێکیان گەیشتنە سەردەمی عەبباسییەکان، سەدان فەرموودەی فیقهییان بۆ خەڵکی دەوتەوە و باس دەکرد، لەم هاوەڵانەوە فەرموودەکانیان دەگێڕایەوە، کە ئەوانیش لە پێغەمبەرەوە گێڕبویانەوە، زۆرێك لەمانە فەرموودەکانیان لە سوحوف نووسیبووەوە، وەك سەحیفەی هەممام لە ئەبو هورەیرەوە و سەحیفەی نافیع لە ئیبن عومەرەوە، سەحیفەی سولەیمانی یەشکوری لە جابیرەوە و سەحیفەی زوهری لە ئەنەسەوە.. تاد.

پاشان قوتابیانی ئەم هاوەڵانە هەڵسان بە نووسینی پەرتووکی ناسراو و بەناوبانگ، لە فەرموودەکانی ئەم سوحوفانە، وەك: (الجامع)ی موعەممەر، (الموطأ)ی مالیك و (الجامع)ی ئیبن جورەیج...تاد.

ئەم پەرتووکە گەورانە فەرموودەکانیان لە سەردەمی ئەمەوییەکان نووسیبووەوە، نەوەك لە سەردەمی عەبباسی – ئەگەر مردنی نووسەرەکانیشیان درەنگ کەوتبێت تا سەرەتای سەردەمی عەبباسییەکان – ئەگەر توێژەر بڕوانێتە فەرموودەکانی (الموطأ)، ئەوا دەبینێت کە زۆربەیان فیقهین، بەڵکو (الموطأ)

---

١– بڕوانە: حلية الأولياء (١/ ٣٢٤)، سير الأعلام (٣/ ٣٣١ – ٣٣٣)، تذكرة الحفاظ (١/ ٣٧)، الإصابة (٢/ ٣٣٠)، تهذيب التهذيب (٥/ ٢٧٦)..

٢– بڕوانە: سير الأعلام (٣/ ١٨٩ – ١٩٤)، تذكرة الحفاظ (١/ ٤٠)، الإصابة (١/ ٢١٣)، تهذيب التهذيب (٢/ ٤٢).

خەریکە هەمووی دەبێتە فیقھ، تەنها بەشی کۆتایی نەبێت کە دەربارەی ئادابە، زۆربەی فیقهی مالیکی تێدایە، جگە لە وتەی هاوەڵان و شوێنکەوتووان. ئا بەم شێوەیە دۆخی هەموو ئەو پەرتووکانەی کە قوتابیانی شوێنکەوتووانی هاوەڵان نووسیویانەتەوە بەم جۆرەیە، هەروەك ئیبن نەدیم لە فەهرەستەکەی خۆی وەسفی دەکات، هەروەك لە موسەنەفی عەبدولڕەزاق (٢١١ك کۆچی دوایی کردووە)[١] و موسەنەفی ئیبن ئەبی شەیبە (٢٣٢ك کۆچی دوایی کردووە)[٢] سابت بووە، کە هەڵساون بە دانانی هەموو گێڕانەوەکانی پەرتووکە کۆنەکان لە موسەنەفە فەرهەنگییە گەورەکانی خۆیان، کە مادە زانستییەکانی نێو ئەم پەرتووکانە پێکهاتبوون لە فەرموودە و وتەی هاوەڵان و وتە فیقهیەکان، کە بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی و نادروستی بۆچوونی (گۆڵدزیهەر و شاخت)، ئەگەر ئەوەی ئەمان باسی دەکەن ڕاست بوایە، ئەوا پەرتووکی گەورە دەربارەی ئەخلاق و زوهد و سیاسەت دەردەکەوتن و دەبوونە بەڵگەیەك لەسەر بڵاوبوونەوەی فەرموودە لەبارەی ئەم بابەتانەوە، گوزارشتی دەکرد لە ڕادەی گرنگیدانی خەڵکی بەم بابەتانەوە، بەڵام توێژەر هیچ پەرتووکێکی لەم بارەیەوە چنگ ناکەوێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە توێژەر پێی وایە پەرتووکەکانی فەرموودە فیقهییەکان لە پەرتووکە یەکەمەکانن لەو سەردەمەدا، کە بەناوبانگترینی پەرتووکەکانی ئەو سەردەمەن، چونکە نووسەرەکانیان هەر لە منداڵییەوە لای زاناکان لە سەردەمی ئەمەوییەکان بەدوای زانستدا گەڕاون، کاریگەری بڵاوبوونەوەی فەرموودەکانی زوهد و ئەخلاق و سیاسەت لە نووسینەکانیان دەرنەکەوتبوون، بەڵکو کاریگەری بڵاوبوونەوە و ناسراوی فەرموودەکانی

١- نزیکەی (٢٠٠٠٠) فەرموودە و دەق لە (١١) بەرگدا لەخۆدەگرێت.

٢- نزیکەی (٤٠٠٠٠) فەرموودە و دەق لە (٧) بەرگدا لەخۆدەگرێت.

فیقهییان لەسەر بوو، ئەمەش ڕێك پێچەوانەی بۆچوونی گۆلدزیهەر و شاختە، (موطأ)یش بەناوبانگترین پەرتووك و بەربڵاوترینیان بوو[1].

٣. ئەگەر گریمان ئەم بانگەشەیە ڕاست بێ، كە فەرموودەكان لەبارەی زوهد و ئەخلاق و سیاسەت بەربڵاوبوون، ئەوا ئەمە چ پەیوەندی بە ڕەتكردنەوەی فەرموودەكانی فیقهەوە هەیە؟!، ئەگەر گریمان كە كەسی دونیانەویست و خوداپەرست هەبووبن، گرنگییان بە گێڕانەوەی فەرموودەكانی زوهد دابێ، سیاسییەكانیش ئەو فەرموودانەی تایبەت بوون بە سیاسەت بڵاویان كردبێتەوە، ئەوانەشی گرنگیان بە بواری ڕەفتار دەدا ئەو فەرموودانەیان بڵاوكردبێتەوە كە تایبەت بوون بە ئەخلاقەوە، هەموو ئەمانە ڕێگر نین لە بڵاوبوونەوەی فەرموودە فیقهییەكان لە نێو شەرعناس و دادوەر و موفتییەكان، كە لەسەر دەستی هاوەڵە زاناكان فێربوون و پێگەیشتون، فەرموودەكانیان و وتە و بۆچوونە فیقهییەكان كە پێویستیان پێبووە، لە پسپۆڕییەكانیان نووسیوەتەوە.

لەبەر ئەوە دەبینین عاسمی ئەحوەل (١٤٢ك كۆچی دوایی كردووە)[2]، دەڵێت: "فەرموودەكانی فیقهمان لای شەعبی خوێند و ئەویش مۆڵەتی پێداین"[3].

شەعبیش یەكێكە لە شەرعزان و دادوەرە گەورەكان (٣٠- ١٠٣ك)، زانستی لە كۆمەڵێك لە هاوەڵە زاناكان وەرگرتووە.

قوتابییەكانی شەعبی فەرموودە فیقهییەكانیان، كە كۆكردبووەوە لەبەریاندەكرد و دەیاننووسییەوە، دواتر بۆیان دەخوێندەوە، ئەویش مۆڵەتی

---

١- مجموع الفتاوى، ابن تيمية (٢٠/ ٣٢٤)، هەروەها بڕوانە: التمهيد (١/ ٧٦ - ٨٦)، إحكام الأحكام (٢/ ١٣٧).

٢- تهذيب التهذيب (٥/ ٤٣).

٣- المعرفة والتأريخ (٢/ ٨٢٦).

پێدەدان کە لێیەوە بیگێڕنەوە، یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنساری (١٤٤ك کۆچی دوایی کردووە)، کە دادوەری مەدینە بوو، داوای لە ئەنەسی کوڕی مالیك کرد، کە فەرموودەکانی زوهری (٥٠- ١٢٣ك) تایبەت بە دادوەری بۆ بنێرێت، مالیکیش بە سەحیفەیەکی زەرد دەربارەی دادوەری سەد فەرموودەی بۆ نارد[١].

شافیعی (٢٠٥ك کۆچی دوایی کردووە) دەڵێت: "هەموو فەرموودەکانی ئەحکام (فیقە)م لای سوفیانی کوڕی عوەینە بینی، تەنها شەش فەرموودە نەبێت، هەمووشیانم لای مالیك بینی، تەنها سی فەرموودە نەبێت"[٢].

هەروەها دەڵێت: "فەرموودەکانی بنەمای ئەحکامەکان پێنچ سەد و شتێك فەرموودە بوون، هەموویان لای مالیك هەبوون تەنها سی فەرموودە نەبێت، هەمووشیان لای ئیبن عویەینە هەبوون تەنها شەش فەرموودە نەبێت"[٣].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕادەی گرنگیدانی زانایان بە فەرموودەکانی فیقە و کۆکردنەوەی، کە نزیکەی (٥٠٠) فەرموودە لە فەرموودەکانی بنەماکانی ئەحکام لای هەریەکە لە مالیك و سوفیانی کوڕی عویەینە هەبوون، ئەمانەش ئەو فەرموودە سەرەکییانەن کە فیقهی لەسەر دادەمەزرێت.

مالیکی کوڕی ئەنەس لە مزگەوتی مەدینە لە سەردەمی ئەمەوییەکان فەتوای دەدا و وانەی دەوتەوە[٤]، سوفیانی کوڕی عوەینە (١٠٧- ١٩٦ك)، یەکێك بوو لە قوتابیانی زوهری، لە سەردەمی ئەمەوییەکان لە دەورووبەری ساڵی (١٢٢ك) هەر

---

١- المعرفة والتأريخ (٢/ ٨٢٣ - ٨٢٤).

٢- سير الأعلام (٨/ ٤٥٧).

٣- سير الأعلام (٨/ ٤٥٩)، مەبەست لە بنەماکانی ئەحکام فەرموودە سەرەکییەکانە لە فیقهی ئیسلامیدا، فەرموودەی تریش هەیە لە لقەکان.

٤- بڕوانە لاپەڕە (١٢٢).

له تەمەنی گەنجیەوە بەدوای زانست دەگەڕا دەیخوێند و وانەی دەوتەوە[1]، نزیکەی (٧٠٠٠) فەرموودەی لەبەربوو، قوتابیەکانی هەر لەو کاتەی ئەعمەشی مامۆستای (١٤٧ك کۆچی دوایی کردووە) لە ژیاندا بوو فەرموودەکانی ئەویان نووسینەوە[2]. هەموو ئەمانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە فەرموودەکانی فیقه لە سەردەمی ئەمەوییەکان پێش ناوەڕاستی سەدەی دووەم بەربڵاوبوون، نەوەك وەك ئەوەی (شاخت) و (گۆلد زیهەر) بۆی دەچن.

هەروەك ناکرێت بەربڵاوبوونی پەرتووکەکانی هونەر و ئەدەب لە ئینگلتەرا بێنینەوە بە بەڵگە لەسەر ڕەتکردنەوەی بوونی سەرمایەیەکی یاسایی و تەشریعی گەورە، کە قوتابیانی کۆلیژی یاسا گرنگی بە پاراستن و توێژینەوەی دەدەن، پیاوانی دادوەریش لە دادگاکانی بەریتانیا بە جێبەجێکردنی هەڵدەستن، بەم شێوەیەش ناکرێت بوونی فەرموودەکانی فیقه لەسەردەمی ئەمەوییەکان ڕەتبکرێتەوە بە بیانووی بەربڵاوی فەرموودەکانی زوهد و ئەخلاق و سیاسەت، ئەگەر وادانێین ئەمە ڕاستە، ئەوا دەبێت بوونی زانا و دادوەرەکان لەسەردەمی ئەمەوییەکان ڕەتبکەینەوە، کە ناکرێت هیچ کەسێك ئەم بانگەشەیە بکات.

٤. دەوڵەتی ئەمەوی تەنها نەوەد ساڵ بەردەوام بوو، ساڵی (٤٠– ١٣٢ك)، بیست ساڵیان ماوەی حوکمی هاوەڵی بەڕێز موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (٤٠–٦٠ك) بوو، دە ساڵیان ماوەی حوکمی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (٦٤ – ٧٣ك) بوو – کە توانی حوکمڕانی بۆ ماوەی نۆ ساڵ لە بەنی ئومەییە بسەنێتەوە[3] –

---

١– سير الأعلام (٨/ ٤٥٤).

٢– سير الأعلام (٨/ ٤٥٨).

٣– عەبدولای کوڕی زوبەیر حوکمی عێراق و حیجازی دەکرد لەو کاتەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان تەنها حوکمی شامی دەکرد لەو ماوەیەدا، دواتر حوکمەکەی جێگیر بوو دووای ئیبن زوبەیر، تا ساڵی

زۆرێك لە هاوەڵان لەم سەردەمەدا دەژیان، هەندێكیان تا ساڵی (١٠٠ك) هەر لە ژیاندابوون، كە عومەری كوڕی عەبدولعەزیزی خەلیفەی دادگەر (٩٩- ١٠١ك) حوكمی دەكرد و فەرمانی بە زانا و دادوەرەكان كرد كە فەرموودەكان بنووسنەوە[1]. زۆرێكیان لەو كاتەوە بەردەوام خەریكی نووسین بوون، كە ژمارەیان دەگەیشتە سەد و پەنجا زانا، بە تێپەڕینی كات بەردەوام ژمارەیان لە زیادبووندابوو، سا ئەو كاتە كەیە لای ئەوانەی بانگەشە دەكەن كە ئەو فەرموودانەی پەیوەندییان بە فیقهەوە هەیە لە سەردەمی ئەمەوییەكان نەنووسرانەوە؟!

**٣. سەبارەت بەو بانگەشەیەی كە دەڵێت فەرموودە فیقهییەكان لە ناوەڕاستی سەدەی دووەم و دواتر دانراون، بۆ ئەوەی لەنێو یەكتری ئاڵوگۆڕی پێبكە ، زۆر زەحمەتیشە هیچ فەرموودەیەكی سەحیح لەنێو ئەم فەرموودانە هەژمار بكرێت، ئەم فەرموودانە و سەنەدەكانیان دروستكراون، دواتر خراونەتە پاڵ سەرچاوەكانی پێشوو.**

ئەمەی خودارەوە وەڵامەكەیەتی:

١. ئەم بانگەشەیە ئەو كاتە گریمانەی دەكرێت كە پێغەمبەر موحەمەد (درود و سڵاوی خودای لێبێ) كەسایەتییەكی نەناسراو بوایە و نەیتوانیبایە بانگەواز و پەیام و ئایینەكەی خۆی بگەیەنێت، یاخود دەوڵەت بەگوێرەی شەریعەتەكەی ئەو دانەمەزرابوایە، لەبەرئەوەی كارەكە پێچەوانەی ئەمەیە ئەوا ناكرێت ئەم جۆرە بانگەشانە قبوڵ بكرێن.

---

(٨٦ك)، عەبدولمەلیك یەكێك بوو لە گەورە زانایانی شوێنكەوتووان، بڕوانە: تهذیب الكمال (١٨/ ٤٠٨ - ٤١٤).

١- عومەری كوڕی عەبدولعەزیز نافیعی قوتابی ئیبن عومەری بۆ لای خەڵكی میسر نارد كە فەرموودەیان فێربكات، بڕوانە: سیر الأعلام (٥/٩٧).

له ڕاستییه مێژووییه دڵنیابەخشەکان ئەوەیە، کە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) سێزده ساڵ له مەککه بانگەوازی بۆ ئیسلام کردوه[1]، تەحەددای هەموو عەرەبەکانی کردوه تا هاوشێوەی ئەوەی قورئانەی بۆی دابەزیوه ئەوانیش بیهێنن، نەیانتوانی یەك سورەتیش بێنن. باوەڕداران شوێنیکەوتن، دواتر تووشی چەوساندنەوه و ئازاردان هاتنەوه[2]، لەسەر ماڵ و حاڵ و شوێنی خۆیان دەربەدەرکران، ماڵ و سامان و خزم و کەسوکاریان بەجێهێشت، تووشی هەژاری و نەداری بوونەوه لەو کاتەی له شوێنی خۆیان زەنگین و ساماندار بوون، لاواز و دەربەدەربوون لەو کاتەی له شوێنی خۆیان گەوره و ڕێزداربوون[3].

هەموو ئەمەش له پای باوەڕبوونیان بوو به پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، که تەنها بەڵێنی بەهەشتی پێدەدان ئەگەر باوەڕ به ئایینەکەی بێنن. پاشان کاریان به شەریعەت و سوننەتەکەی کرد، دواتر خۆیی و باوەڕداران توانییان له مەدینه دەوڵەتی خۆیان دابمەزرێنن، هەر خۆی پێشەوا و دادوەر و سەرکرده و مامۆستای باوەڕداران بوو، به تەواوی و بێ دوودڵی گوێڕایەڵ و ملکەچی بوون، له ڕادەبەدەر خۆشیان دەویست، تاکو ئەوەی لەگەڵ باوك و ڕۆڵەکانی خۆیاندا دەجەنگان لەپێناویدا، تەنها بۆ بەرگریکردن لەم پەیام و پێغەمبەره. ده ساڵیش له مەدینه ژییا، کۆچی دوایی نەکرد تاکو هەموو دوورگەی عەرەبی نەخستە ژێر ڕکیفی خۆی. شوێنکەوته باوەڕدارەکانی بەردەوام بوون له حوکمڕانی کردنی ئەم دەوڵەتەیان بەگوێرەی شەریعەتەکەی که لەسەر قورئان و سوننەت دامەزرابوو، که له وڵاتی فارسەوه له ڕۆژهەڵاتەوه

---

١- بڕوانه: صحيح البخاري مع فتح الباري (٧/ ١٦٢) ح (٣٨٥١).

٢- بڕوانه: صحيح البخاري مع فتح الباري (٧/ ١٦٤ - ١٧٠) ح (٣٨٥٢).

٣- سيرة ابن هشام (١/ ٢٧٥، ٢٨١، ٣٣٩، ٣٤٣)، و (٢/ ٧٦) -ط١٠، ١٩٣٧، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد.

بۆ ليبيا له ڕۆژئاواوەی درێژدەبووەوە، مليۆنان خەڵك هاتنه ناو ئيسلامەوە و لـه هاوەڵانەوە كاروباری ئايينەكەيان لـه بيروبـاوەڕ و پـەرسـتش و مامەڵـه و ڕەفتـار فێردەبوون، له مزگەوتەكان كه له هەموو شار و گوندێك هەبوون، هەزاران هاوەڵ له هەموو ناوچه و وڵاتێك پـەرت و بڵاوبووبوونـەوە بـۆ ئـەوەی موسـوڵمانان فێـر بكەن، بانگی نا موسوڵمانەكانيان دەكرد بێنه نـاو ئـەم ئاينـه. دوا هـاوەڵێش تـا ساڵی (١٠٠ك) ژييا، توانييان بۆ هەر شوێنێك كه پێيگەيشتبێتن ئەم ئايينەی تێدا بڵاوبكەنەوە.

هەروەك هـەزاران شـوێنكەوتوو لەسـەر دەسـتی ئەمانـه پێگەيشـتن، هـەتاكو ژمارەی قوتابيانی ئەبو هوريره كه ناسراوبوون گەيشـتنه هەشـت سـەد قوتـابی، ئەمـه جيـا لەوانـەی كـه ناسـراو نـەبوون، زۆرێـك لـه قوتـابی هـاوەڵان تـا دوای ناوەڕاستی سەدەی دووەم هەر مابوون، چۆن وێنا ناكرێت – لەكاتێكدا دۆخەكـه بەم شێوەيه بووه – كه هەزاران هاوەڵ شـتێكيان لـه فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ)، كـه لـه هـەموو كاروبـاری ژيانيـان پێويسـتيان پێبووه لەبەركردبێت، لـه بـواری پـاك و خـاوێنی و نوێـژ و زەكـات و بازرگـانی و دادوەری و ميرات... تاد؟!

چۆن شوێنكەوتووانی هاوەڵان نەيانتوانيوه شتێك لەم فەرموودانەی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) لەبەر بكەن؟ كەچی ژمارەيان سەدان هەزار كەس دەبوو، لەوانەی لەگەڵ هاوەڵان ڕۆژانه نوێژيان دەكرد له هەزاران مزگەوتـدا، كـه له هەموو شار و گوندەكان بڵاوبووبوونەوە[1]؟!

لەوانەيه فـەرموودەی فيقهـی ناسـەحيح بوونيـان هـەبێت، كـه دراونەتـه پـاڵ پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) ، هـەروەها شـتێكی ئەسـتەمه هـيچ

١– بڕوانه: إحكـام الأحكـام (٢/ ١٢٧)، (٤/ ٦٣)، لـه (الأوسـط)دا لـه (السـنن)ی ئـيبن مـونزيردا (١/ ٤٣٢)، قەيسی كوڕی سەعيدی هاوەڵ پێشنوێژی بۆ ده هەزار كەس كردوه.

فەرموودەیەکی سەحیح نەبێت کە درابێتە پاڵ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، تەنها ئەگەر وادابنێین کە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) هیچ یاسایەکی دانەنابێ، هیچ حوکمی فیقهی دەرنەکردبێ بەدرێژایی ماوەی پێغەمبەرایەتیەکەی، کە بیست و سێ ساڵ بوو، هیچ دادوەرییەکی نەکردبێت کە ڕۆژانە پێنج جار لەگەڵی کۆدەبوونەوە؟! یاخود ئەگەر وامانـدانا کە دەوڵەتی خەلیفەکان دادوەر و موفتی و زانای تێدانەبووبێ، یاخود هەموو هاوەڵان هەموو ئەوەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) نیشانیدان لە یاسا و سوننەتەکان لەبیریان چوو، یاخود ئەگەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) وازیان لە ئیسلام هێنابێ و گەڕابنەوە سەر هاوبەشدانان، یاخود ئەگەر وادامانـا لەنێوان سەردەمی پێغەمبەر و هاوەڵان و سەردەمی شوێنکەوتووان سەدەی زۆری لەنێوان بووبێ، ئیسلام پەرش و بڵاوبووبێ، هیچ یەکێك لە شوێنکەوتووان بە هیچ هاوەڵێك نەگەیشتووبێ، ئەگەر هەموو ئەم گریمانانە سەلمێنران کە ناواقیعین، ئەوا هیچ شتێك لە بەردەم توێژەر نامێنێتەوە، تەنها داننان نەبێت بەوەی کە ئەوەی شاخت و گۆلدزیهەر بانگەشەی بۆ دەکەن شتێکی بابەتی پەیڕەوی زانستی نییە، بەڵکو ئەوە دەسەلمێنێت کە فەرموودەی فیقهی سەحیح زۆر هەن، کە لە پێغەمبەرەوە هاتوون (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) .

٢. ئەوەی جەخت لەسەر نادروستی ئەوە دەکاتەوە کە ئەو دوو ڕۆژهەڵاتناسە پێی گەیشتوون، ئەوەیە کە هاوەڵان توانییان زۆر بە وردی و ڕێکی قورئان بپارێزن، تاکو ئەوەی دوای چواردە سەدە لەنێوان موسحەفێك و یەکێکی تردا هیچ جیاوازییەك نابینین، بەڵکو هەموو موسحەفەکانی دونیا تەواو بە پیتاوپیت هاوشێوەی یەکترن، هەر لەو کاتەی نووسینەوەی موسحەف تەواو بووە هەر لە سەردەمی پێشەوا عوسمان (٣٠ك کۆچی دوایی کردووە) تا ئەم ڕۆژگارەمان،

چـۆن دەوڵــەت و ئوممــەت کــە بــەم کــارە زانســتییە بێهاوتایــە هەڵســاون، دەستەوەسـان دەبـێ لـە پاراسـتنی ڕوونکـەرەوەی ئـەم قورئانـە، کـە خـۆی دەنوێنێـت لـە سـوننەتی پێغەمبـەر (درودی خـودای لێبێـت) و یاسـا فیقهییەکانیدا[1].

چۆن زۆرێك لە هاوەڵان توانیویانە قورئان لە دڵ و مێشکی خۆیان لەبەربکەن، ڕاسـتەوخۆ لـە زاری پێغەمبـەرەوە، کـە زیـاترە لـە (٦٢٣٢) ئایـەت بـە یـەك ڕێکخسـتنەوە، دواتـر بێتوانـابن لـە لەبـەرکردنی فـەرموودە فیقهییـەکان کـە نـە پێویستی بە ڕێکخستن و نە پێویستی بە لەبەرکردنی پیتاوپیتی بوو، بەڵکو تەنها پێویستی بەوە بوو مەبەستی پێغەمبەر (درود و سڵاوی خودای لێبێ) بزانن؟!

ژمـارەی ئـەو فـەرموودە فیقهییانـە ڕێژەکـەی ناگاتـە شەشـیەکی ژمـارەی ئایەتـەکانی قورئـان؟! لەگـەڵ ئـەوەی ئـەم فەرموودانـە ڕوونکـەرەوەی ئایەتـە یاساییەکانی قورئانن. ناکرێت وا بیربکرێتەوە کە دەتوانرێـت بـە تـەواوی ئایەتـە قورئانییـەکان لەبـەر بکرێـت، لەولاشـەوە بێتوانـای تـەواو بـن بـۆ لەبـەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر.

هەروەکو چۆن هاوەڵان ڕاستەوخۆ قورئـانی پیرۆزیـان لـە زاری پێغەمبـەرەوە (درود و سڵاوی خودای لێبێ) لەبەرکرد[2]، بەم شـێوەیەش قوتابیـەکانی ئـەوان قورئانیـان لەبـەرکرد – کـە ئەمـە ڕێگەیـەکی نەریتیـە بـۆ لەبـەرکردن لەلایـەن مامۆسـتاکەوە بـەبێ پێویسـت بـوون بـە پـەرتووك – بەهـەمان شـێوە هـاوەڵان فەرموودە فیقهییەکانیان ڕاستەوخۆ بە زارەکی لە پێغەمبەرەوە (درود و سڵاوی خودای لێبێ) لەبەردەکرد، دواتر قوتابیانی هاوەڵانیش بەم جـۆرە فـەرموودەیان لەبەرکردووە، بێگومان لەبەرکردنی فەرموودە ئاسانترە لـە قورئـان، ژمارەشـیان

١- بڕوانە: تأريخ ابن خلدون (١/ ٤٣٧) لە بابەتی تەواتوری قورئان و خوێندنەوەی و زانینی ماناکانی.

٢- بڕوانە: مجموع فتاوی ابن تیمیة (١٨/ ٢٧).

کەمترە، ئەم قوتابیانەش بوون دەستیان کرد بە نووسینەوەی فـەرموودە، وەك: زوهری (٥٠– ١٢٣ك) و عوروەی کوڕی زوبەیر (٣٠– ٩٠ك)...تاد.

چۆن تەسـەوردەکرێت کـە هـاوەڵان تـەواو سـەرکەوتووبن، لـەوەی بەتـەواوی قورئان بە پیتـاوپیتی بـەبێ زیـاد و کـەمی بـە قوتابیـەکانیان لەبەربکـەن، بـەڵام شکستیان هێنابێ لەوەی شـتێك لـە فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خودای لێبێ) و فەرموودە فیقهییەکانی بە قوتابیەکانیان لەبەربکەن؟

ئەگەر ژمارەی موسحەفەکانیش گەیشتبێتە نزیکەی سەد هـەزار موسـحەف[1] لـە سـەدەی یەکـەم لـە هـەموو شـار و دێیـەکانی دەوڵـەتی ئیسـلامی، چـی سەرسـوڕهێنەری تێدایـە کـە هەنـدێك پـەرتووکی فـەرموودە هـەبووبن هـەروەك سەرچاوە مێژووییەکان ئەوە دەسەلمێنن؟!.

٣. یەکێکی تر لەو بەڵگانە ئەوەیە کە هەموو زانا موسوڵمانەکان لە زۆرێك لـە بابەتە فیقهییەکان کۆکن، بەهەمان شێوەی کۆکبوونیان لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو فەرموودە فیقهییانەی کە دەدرێنە پـاڵ پێغەمبـەر (دروود و سـڵاوی خـودای لێبێ)، وێڕای جیاوازی قوتابخانە و پەیڕەوی فیقهی و سیاسیان[2]، زۆر دوورە کە ئەم جۆرە ڕێکەوتنە ڕووبدات بەبیناکردن لەسەر چەند فەرموودەیەکی دروستکراو کە دوایی لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچیدا دەرکەوتبێت.

پێشەوا ئەبو حەنیفە (٨٠– ١٥٠ك) لە کۆتایی سـەردەمی هـاوەڵان لـەدایکبوو دواتر خوێندی، دواتر بـووە بـەناوبانگترین شـەرعناس لـە عێـراق، لـە سـەرەتای سەدەی دووەم پاش کۆچکردنی مامۆسـتا گـەورە و شەرعناسـەکەی، حـەممادی کوڕی ئەبو سولەیمان (١٢٠ك کۆچی دوایـی کـردووە)[3]. پێشـەوا مـالیکی کـوڕی

---

١– إحكام الأحكام (٤/ ١٦٣).

٢– بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية (١٨/ ١٦ – ١٧)، (١٨/ ٧٠).

٣– بڕوانە: سير الأعلام (٥/ ٢٣١– ٢٣٧)، والفصول في الأصول للجصاص (٣/ ٢٧٣).

ئەنەس (٩٣– ١٧٩ك) بووە بەناوبانگترین شەرعناسی مەدینە، پێش کۆچکردنی مامۆستاکەشــی، ڕەبیعــی کــوڕی عەبــدولڕەحمان (٦٥– ١٣٦ك)[١]، چــەندین گفتوگــۆی بــەناوبانگ هــەبوون لــەنێوان شەرعناســانی عێــراق – قوتابخانــەی بۆچـوونگەرا: أهـل الـرأي – و شەرعناسـانی مەدینــە – فەرمووددەناسـان: أهـل الـحديث –، لەگـەڵ ئەمەشـدا هـیچ یـەکێك لـە زانایـانی عێـراق ڕەخنـەیان لـەو فەرموودانەی کە لە(موطأ)ی مالیك هەبوون نەگرت[٢]، بـەڵکو موحەمـەدی کـوڕی حەسـەنی شـەیبانی کـە هـاوەڵی ئـەبو حەنیفـە بـوو گەشـتی کـرد بـۆ مەدینـە و(موطـأ)ی مـالیکی بـۆ مالیـك خوێنـدەوە، دواتـر گـەڕاوە بـۆ عێـراق[٣]، ئــەو نوسخەیەی موحەمەدی کوڕی حەسەن بوو بە نوسخەیەکی (موطأ) کە پشتی پێ دەبەسترێت. کاتێکیش ئەبو یوسفی قوتـابی ئـەبو حەنیفـە، کـە یەکـەم سـەرۆك دادوەر بوو لە دەوڵەتی ئیسلامیدا (١٨٣ك کۆچی دوایی کردووە)، لەگەڵ پێشەوا مالیك کۆبووەوە و گفتوگـۆی کـرد، پاشـگەزبووەوە لـە بۆچـوونەکانی، دەیـوت: "ئەگەر ئەوەی مـن زانـیم مامۆستاکەشـم زانیبایـە، ئـەوا پاشـگەزدەبووەوە"[٤]. واتە: ئەگەر ئەبو حەنیفە بەو فەرموودانەی زانیبووایە لـەم بابەتانـە، ئـەوا کـاری پێدەکرد و وازی لە کۆششی خۆی دەهێنا[٥].

قوتابخانــەی فیقهــی عێراقــی و قوتابخانــەی فیقهــی حیجــازی بۆچــوونە فیقهییــەکانیان بڵاوبــووەوە و ناوبــانگی دەرکــرد بــوو، بنچـینە و بنــەمای هــەر

١– بڕوانە: سير الأعلام (٦/ ٨٩– ٩٣)، (٨/ ٦٢– ٧٧).

٢– مجموع فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣٠٤ – ٣٠٦).

٣– سير الأعلام (٨/٧٥).

٤– بڕوانە: فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣٠٤).

٥– بڕوانە: فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٢٣٢ – ٢٥٠)، لە بارەی پاساوی ئـەو زانایانـەی لـە هەنـدێك بابـەت ئاگاداری هەندێ فەرموودە نەبووینە.

یەکێکیان پێش ناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچی جێگیر ببوو، جا دوایی چ پێویست بوو فەرموودەی فیقهی دابنێن بۆ دەستاودەستکردن لە نێو خەڵکیدا؟!

لەگەڵ ئەوەی زۆربەی بۆچوونە فیقهییەکانی ئەبو حەنیفە و مالیك بۆچوون و کۆششی مامۆستاکانیان بوون، لە زانایانی کوفە و مەدینە هەر لە سەردەمی هاوەڵان تا سەردەمی ئەوان، قوتابخانەی کوفەش بە درێژکراوەی قوتابخانەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و شەرعناس و دادوەرە هاوەڵەکان کە لە کوفە جێگیربوون هەژمار دەکرێت، هەروەك قوتابخانەی مەدینە بە درێژکراوەی قوتابخانەی عومەری کوڕی خەتتاب و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و عایشە و ئەبو هورەیرە و زانا و هاوەڵەکان لە مەدینە هەژمار دەکرێت[1].

لەبەر ئەمە مالیکی کوڕی ئەنەس داواکەی خەلیفەی عەبباسی ئەبو جەعفەری مەنسوری ڕەتکردەوە، کاتێك دەیویست (موطأ) بکاتە یاسایەك هەموو دادوەرەکان لە هەموو هەرێمە جیاوازەکان پێوە پابەند بکات، بەڵام مالیك داوای لێبووردنی لێکرد، کە ئەو شەرعناس و دادوەرانە زانستیان لە هاوەڵان وەرگرتووە، کە لە پێش ئەو بوون و پێویست ناکات ئەوان بە (موطأ)ەوە پابەند بکات، بەڵکو پێویستە ڕێزی بۆچوونە فیقهییەکانیان بگرین، کە کۆششی مامۆستاکانیان بووە لە هاوەڵان و قوتابیەکانیان[2]، ئەگەر کۆششەکەیان لەسەر بناغەیەکی دروست نەبووبایە، ئەوا مالیك داوای لە خەلیفە دەکرد خەڵکی عێراق پابەند بکات بە (موطأ)وە، چونکە ئەوان دەیانزانی ئەوەی دەیڵێن و دادوەری پێدەکەن هەمووی لەوەی پێش خۆیانەوە سەلمێنراوە، لە زانا و دادوەر و هاوەڵان و قوتابیانی هاوەڵانەوە.

---

١- الفصول للجصاص (٣/ ٣٢٣)، إحكام الأحكام (٢/ ١٢٧-١٢٨)، سير الأعلام (٥/ ٢٣٦)، (٥٨/٨)، إعلام الموقعين (١/ ٢١ - ٢٨).

٢- بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣١١)، وسير الأعلام (٨/ ٧٨).

٤. گریمان فەرمووده فیقهییەکان هەر لە ناوەڕاستی سەدەی دووەم دانـراون، بۆ ئەوەی لەنێو خەڵکی ئاڵوگۆڕی پێبکرێت، بـەڵام ئایا کـێ ئـەم فەرموودانـەی دانـاون؟ ئـەو ئامرازانـە چـی بـوون کـە تـوانرا ئـەو هـەموو فـەرمووده فیقهییـە جیاوازانـە ڕەواج پێبـدەن؟ ئایـا کەسـایەتی ئـەوانیان دۆزیـەوە، یـاخود توانیـان خۆیان ون بکەن؟ ئەی ئەو سەدان زانایانە لە کوێ بوون کە لە هەموو ناوچەکانی دەوڵــەتی ئیســلامی هــەبوون بــۆ وەڵامدانــەوە و بەرەنگاربوونــەوەی ئــەم کەسایەتیانە، چونکە هەر ئەو زانایانە بوون بـەرەنگاری هـەموو لادان و سـتەمێك دەبوونەوە، جا ئەگەر ئەو بەرەنگاربوونەوەیە بووبایە هـۆی زینـدانیکردن یـاخود مردنیان؟![1].

جا چۆن ئەمە لە ناوەڕاستی دووەمی سەدەی دووەمی کۆچی ڕوویدا، کە لـەو ماوەیەدا جۆرەها زانست و هونەر و پەرتووك و نووسین دەرکەوتن، بەبێ ئـەوەی یەکێك لە مێژوونووسـان، یـاخود زانایـان لـەو سـەردەمدا ئاگـاداری ئـەم ڕووداوە زانستی و ڕۆشنبیرییە ترسناکە بن؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستی بە کۆمەڵێك گریمانەی نالۆژیکی هەیـە بۆ ڕاڤە و شیکردنەوەی ئەم ڕووداوانە.

بینیمـان چـۆن موعتەزیلـە – کـە سـەر بـە قوتابخانـەی عـەقڵی بـوون – ناکۆکبوون لەگەڵ ئەهلی سوننە – کە نوێنەرایەتی قوتابخانەی نەقڵییان دەکـرد – لە زۆر بابەتی بیروباوەڕدا، بـەڵام لـە ڕووی فیقهییـەوە پـەیڕەوکاری مەزهـەبی ئەبو حەنیفە، یاخود شافیعی یاخود مالیکی بوون. زەمەخشەری (٤٦٧– ٥٣٨ك)

---

١– بڕوانە: پێشەکی: عبد الوهـاب عبـد اللطيـف، بـۆ کتـێبی (تنزيـه الشـريعة المرفوعـة عـن الأخبـار الشنيعة الموضوعة) ص/ أ– ع، ط١، ١٩٧٩، دار الكتب العلمية، بيروت، لە باسی گرنگیـدانی زانایـانی فەرمووده بە سوننەوە و بەرگریکردنیان لێی.

حەنەفی بوو[1]، قـازی مـاوەردی موعتـەزیلی (٣٦٤- ٤٥٠ك) شـافیعی بـوو[2]، بـە هەمان شێوە قازی عەبدولجەباری موعتەزیلی (٣٠٥- ٤١٥ك) شـافیعی بـوو[3]، چ شتێك ڕێگـر بـوو لـەوەی ئـەم زانـا گەورانـە کـە لـە هەنـدێك بابـەتی بیروبـاوەڕی ناکۆکبوون لەگەڵ ئەهلی سـوننە لـە ڕووی فیقهییـەوە پێچـەوانەی ئـەوان نـەبن. بۆچی ڕەخنەیان لە(موطأ)ی مالیـك و سـەحیحی بوخـاری و موسـلیم نـەگرت... تاد؟ ئەی لە بابەتە فیقهییەکان ئەو فەرموودانەیان بـە بەڵگـە نەدەهێنایـەوە کـە فەرموودەناسان گێڕاویانەتەوە؟!

بـــەڵکو هـــەتا فەیلەســـوفە موســـڵمانەکانیش پابەنـــدبوون بـــەم مەزهەبـــە فیقهییانەوە، وەك: ئیبن ڕوشدی فەیلەسوف کە مالیکی بـوو، ئـەو فەرموودانـەی کە زانایانی فەرموودە بە سەحیحیان داناون بە بەڵگەی دەهێنانەوە[4]؟

زۆر سەختە ڕاڤەی ئەم هەڵوێستانە بکرێت، ئەگەر کارەکە بەم شێوەیە بوایـە کە (گۆلدزیهەر و شاخت) دەیڵێن، کەواتە ئەو هۆکارە لۆژیکییـە چییە؟ کـە وای لـــەم زانایانـــە کـــردووە لەگـــەڵ جیـــاوازی لـــە ڕەوتـــی فیکـــری و قوتابخانـــە بیروباوەڕییەکانیان، کە لە ڕووی فیقهی و فەرموودە فیقهییەکانەوە هەڵوێستێکی پێچەوانەیان هەبێت، کـە بریتیـە لـە پابەنـدبوون و پەیوەسـتبوون بـەو مەزهەبـە فیقهیانەوە بە بەڵگەکانیەوە؟!

ئەم زانایانە بوێرییان کەم نەبوو، ئەگەر نا چـۆن لـە بابەتـە بیروباوەڕییـەکان ناکۆك دەبوون لەگەڵ پێشەواکانی ئەم مەزهەبە فیقهییانە، کە زۆر مەترسیدارترە لە بابەتە فیقهییەکان، چۆن ڕووداوێکی زانستی وا مەترسیدار لای موعتەزیلـەکان

---

١- بڕوانە: سیر الأعلام (٢٠/ ١٥١)، تذكرة الحفاظ (٤/ ١٢٨٣).

٢- سیر الأعلام (١٨/ ٦٤)، میزان الإعتدال (٣/١٥٥).

٣- تأريخ بغداد (١١/ ١٣)، سیر الأعلام (١٧/ ١٤٤).

٤- سیر الأعلام (٢١/ ٣٠٧)، هەروەها بڕوانە کتێبەکەی (بداية المجتهد).

ون و نادیاربوو، کە لە ململانێ و بەرەنگاربوونەوەیەکی هێزی زۆر توندبوون لەگەڵ ئەهلی سوننە و فەرموودەناسان، لە کۆتاییەکانی سەدەی دووەمی کۆچی؟ چۆن بەبەرچاویانەوە شەرعناسان لە ئەهلی سوننە، وەك؛ مالیك و شافیعی و ئەحمەد، ئەم فەرموودانە دروستدەکەن و سەنەدیان بۆ دادەنرێت – وەك گۆلدزیهەر و شاخت بانگەشەی بۆ دەکەن – بەبێ ئەوەی وەلامیان بدەنەوە؟ یاخود کاریان ئاشکرا نەکرێن، بەتایبەت موعتەزیلەکان کە گەیشتنە دەسەلات لە سەردەمی مەئمونی عەبباسی، تاکو سەردەمی واسق[1].

چ شتێك ڕێگربوو لەوەی موعتەزیلەکان ڕەخنە لە ڕاستگۆیی و دەستپاکی زانایانی فەرموودە و فیقه نەگرن، وەك: شافیعی و ئەحمەد؟!

هۆکاری لۆژیکی کە دەتوانێت ئەم ڕووداوەمان بۆ ڕاڤە بکات، ئەو باوەڕە پتەوە بوو لای زانایانی (قوتابخانەی عەقڵی) بە دروستی ئەو فەرموودانەی کە زانایانی ئەهلی سوننە (قوتابخانەی نەقڵی) کۆیانکردبووەوە و ڕەخنەیان لێگرتبوو، هەروەها ئەو باوەڕە قووڵە بوو کە زانایانی فەرموودە هەیانبوو لە دەستپاکی و وردیدا، ئەوانەی بەم ئەرکە بە بەڵگەنامەکردنە هەڵسان[2]، بەلام ئەوان لە تێگەیشتن لەم فەرموودانە ناکۆکبوون لەگەڵ ئەهلی سوننە، بە لێکدانەوە و ڕاڤەیەکی عەقڵی ڕاڤەیان دەکرد، کە لەگەڵ بنەما عەقڵییەکانی ئەوان بگونجێت.

---

١– بڕوانە: سير الأعلام (١١/ ٢٣٦ – ٢٦٥).

٢– بڕوانە: العواصم من القواصم للإمام الزيدي محمد بن الوزير اليماني (٢/ ٣٣٢ – ٣٣٦)، (٢/ ٣٧٩ – ٤٠٠).

**٤. سەبارەت بەو بۆچوونەی کە دەڵێت: درەنگ دەرکەوتنی سەنەد بەڵگەیە لەسەر هەڵبەستنی سەنەد لە سەدەی دووەمدا و پێکهێنانی دەقی جۆراوجۆر، دواتر دانە پاڵی کەسایەتی گەورە و سەرچاوەی بەرز بۆ پەسەندکردنی.**

لە چەند ڕوویێکەوە وەڵامی ئەمە دەدرێتەوە:

١. ئەم بۆچوونە وادادەنێت کە سەنەد تەنها لە سەدەی دووەمدا بوونی هەبووە[1]، هەروەها وادادەنێت کە نەبوونی سەنەدی فەرموودەیەك لە فەرموودەکان بەڵگەی نادروستی و ناڕاستییەتی بە تەواوی، بەم شێوەیەش وادادەنێت کە بە هیچ شێوەیەك زانا و شەرعناس و فەرموودەناسان و مێژوونووسان دەستپاك نەبوون لە سەدەی دووەم، هەر یەکێك ویستبایە بۆچوونی خۆی بسەپێنێت و پاڵپشتی بۆ پەیدا بکات، ئەوا فەرموودەیەکی دروستدەکرد، سەنەدێکیشی بۆ فەرموودەکە پێکدەهێنا لەپێناو پاڵپشتیکردنی بۆچوونەکەی؟!.

هەموو ئەم گریمانانەش ئاسان نییە بسەلمێنرێن، هیچ یەکێکیش لەو مێژوونووسانەی کە لەو سەردەمە ژیاون باسیان نەکردووە، هەتاوەکو مەقبول بێت.

ئەگەر بە بەڵگەی مێژوویی سەلمێنرا، کە هەندێك لە هاوەڵان لە سەردەمی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ)، فەرموودەیان نووسیوەتەوە، هەروەها ئەگەر بە بەڵگەی مێژوویی سەلمێنرا، کە زۆرێك لە قوتابیانی هاوەڵان ئەو فەرموودانەی هاوەڵان بۆیان خوێندۆتەوە لە کۆڕە زانستییەکانی خۆیان، ئەوانیش نووسیویانەتەوە، لەکاتێکدا هاوەڵان ڕاستەخۆ لە پێغەمبەرەوە (دروود

---

١- بڕوانە: تأريخ ابن خلدون (١/ ٤٢٢) لە گرنگیدانی زانایان بە سەنەد لە فەرموودە و فیقهدا لەبەر هەستیاریی و گرنگیان، هەروەها بڕوانە: تأريخ التراث العربي (١/ ١٤٤) لە باسی دەرکەتن و گەشەکردنی ئیسناددا.

و سڵاوی خـودای لـێبێ) نووسـیویانەتەوە، یـاخود گوێبیسـتی بوونـە، هـەروەها ئەگـەر بـە بەڵگـەی مێـژوویی سـەلمێنرا کـە عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز (٩٩–١٠١ك) بە فەرمی فەرمانی کرد بە زانایان کە سوننە و فـەرموودەکان بنووسـنەوە کە کۆیانکردبوونەوە و نووسـیبویانەوە – خۆشـی یـەکێك بـوو لـەو زانایانـە[1] – ئەگـەر هــەموو ئەمانــە لــە ســەدەی یەکــەم ئــەنجام درابــن، کــە ئــەم ئەنــدازە فەرموودەیــەی کــە نووســراونەتەوە ئەصــلەن پێویســتیان بــە ســەنەد نییــە[2]، لەبەرئـەوەی بـە نووسـین پـارێزراو بـوون، پـەرتووکی زوهـری (٥٠– ١٢٣ك) کـە فەرموودەکانی پێغەمبەری (درووd و سڵاوی خودای لـێبێ) تێـدا کۆکردبوونـەوە، دەیان کەس بۆیان خوێندۆتەوە، بۆ خۆیان دانەیان لەبەرگرتووەتـەوە، لـە بـازاڕ دەفرۆشـرا، هــەزار فــەرموودەی بــە ســەنەد لــە پێغەمبــەرەوە (درووd و ســڵاوی خودای لێبێ) تێدا بوو.

هەورووەها سەحیفەی هـەممام لـە ئـەبو هـوڕەیڕەوە، سـەحیفەی سولـەیمانی یەشکوری لە جابیرەوە و سەحیفەی نافیع لە ئیبن عومەرەوە.. تاد.

هەموو ئەم سەحیفانە بە هیچ شێوەیەك ئەصلەن پێویستیان بە سـەنەد نیـە، لەبەرئەوەی بەناوبانگ بوون و دەستاودەستیان پێـدەکرا، لای زانایـانی سـەدەی یەکەم ناسراو بوو، هەتاوەکو بوونە بەشێك لە نووسراوەکانی سەدەی دووەم، کە

---

١– بڕوانە: سير الأعلام (١١٤/٥– ١١٦).

٢– بڕوانە: الهداية تخريج أحاديث البداية للغماري (٤٣٨/١)، کە لـە بـارەی سـەحیفەی عـەمری کـوڕی حەزم دەڵێت: "ئەگەر سەحیفەکە بەبێ سەنەد و گێڕانەوە بووایە، ئەوا هەر ڕاست و دروست دەبوون، وەك ئەو پەرتووکانەی کە بەشێوەیەکی دڵنیابەخش دەدرێنە پاڵ نووسەرەکانیان، وێـڕای ئـەوەی کـە گێڕانــەوە نییــە، دەی چـۆنە ئەگــەر ســەحیفەکە بــە ســەنەدی نەبچــڕاو لــە ناســراوترین پــەرتووکی فــەرموودەدا گێڕدراوەتــەوە"، هــەروەها دەڵێـت: "پــەرتووکیان لابـوو لــە مـاڵی خۆیـان، لـە هــەموو ڕاویەکان دەیگێڕایەوە، پاشان لەگـەڵ ناسـراویەکەی بێنیـازە لـە سـەنەد، هـەروەك تـەحقیقکاران لـە زاناکان و لەبەرکاران وا دەڵێن".

هەموو ئەوەی لەو سوحوفانەدا بوو، هەمووی لەخۆگرت، کە بووە هۆی بێنیـازی لە سوحوفەکان و پێشوازیکردن لەو پەرتووکانەی کە ئەوانی لەخۆدەگرت، وەك: (موطأ)ی مالیك و (جامع)ی موعەممەر و (جامع)ی ئیبن جورەیج.. تاد.

کاتێك زانایانی سەدەی دووەم دێن و سەنەدی خۆیان بۆ سـەحیفەی هـەممام بـاس دەکـەن، یـاخود سـەحیفەی سـوهەیلی کـوڕی ئـەبی سـالح[1]...تـاد، ئـەوا مەبەستیان سەلماندنی ڕاستی ئەو سوحەفانە نیە، بۆئەوەی بە بەڵگە بیهێننەوە، چونکە ئەمانە سەحیفەی ناسراو بوون و هەمووان دەیانگێڕایەوە و هـەر مرۆڤێـك دەیتوانی لەبەرییبگرێتەوە، دانەیەکی لەبەرگیراوەی بۆ خۆی ببات، بەڵکو زانایانی فەرموودە مەبەستیان لە باسکردنی ئەو سەنەدانە بـۆ سـەلماندنی ئـەوە بـوو کـە ئــەوان لــە مامۆســتاکانیان گوێبیســتبوون، یــاخود بەدەســتهێنانی مۆڵــەتی مامۆستاکەیان بۆ گێڕانەوەی ئـەو فەرموودانـەی کـە تێیـدان – هـەروەك ڕێگـەی فەرموودەناســان بــەم شــێوەیە بــوو – لەگــەڵ ئــەوەی ئــەم ســەنەدە هــیچ کاریگەرییەکی نییە بۆ سەلماندنی ڕاستی یا ناڕاستی ئـەم سـوحوفە، بـۆ نموونـە دەبیــنین ئەحمــەدی کــوڕی حەنبــەل دەڵێــت: عەبــدولڕەزاق بــۆی گێڕاینــەوە، موعەممەر بۆی گێڕاینەوە، ئەبو هورەیرە بۆی گێڕاینەوە کە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێت دەفەرموێت: ...تاد[2].

ئەم سەحیفەیە لە موسنەدی ئەحمەد و موسەنەفی عەبدولڕەزاق و لە جامیعی موعەممەر و لە سەحیحی موسلیمدا هەیە.. تـاد، لەگـەڵ ئـەوەی جیـاوازی نییـە لەوەی لـەم پەرتووکـەدا هـەبێت، یـاخود لـەو پەرتووکـەدا، هـیچ جیـایی یـاخود بەهێزی بۆ دروست نەدەبوو، لەبـەر ئـەوەی سـەحیفەی هـەممام ناسـراو بـوو لـە سـەدەی یەکـەم، بـەڵکو خاوەنـانی پـەرتووکی فـەرموودە باسـی سـەنەدەکانیان

---

١- بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/٤٧٣) دەربارەی نوسخەکەی سوهەیلی کوڕی ئەبی صالح.

٢- بڕوانە: المسند (٢/ ٣١٢ - ٣١٩).

کـردووه کـه بیسـه‌لمێنن ئـه‌وان گوێبیسـتی فـه‌رمووده‌کان بـوون، یـاخود بـۆ ماموستاکانیان خوێندۆته‌وه، مۆڵه‌تیان پێـداون بـۆ گێڕانـه‌وه‌ی فـه‌رمووده‌کانیان به‌گوێره‌ی په‌یڕه‌وی زانستیی توندوتۆڵ، که به هیچ شێوه‌یه‌ك په‌سـه‌ندی ناکـات ته‌نها به وه‌رگرتنی ڕاسته‌وخۆ نه‌بێت له زانایانه‌وه، ڕازی نابێت به‌وه‌ی زانست له په‌رتووکێك، یاخود سه‌حیفه‌یه‌ك یاخود فێربوونی خودی وه‌رگیرێت[1].

سـه‌نه‌ده‌کان لـه‌م دۆخـه‌دا تـه‌نها وه‌ك ئـه‌و بڕوانامـه زانسـتییانه وایـه کـه ده‌یسه‌لمێنێت ئه‌م قوتابیه ئه‌م په‌رتووکه و لای ئه‌م ماموستایه‌ی خوێندووه.

ئه‌وه‌ی ئه‌م ڕاستییه دوپات ده‌کاته‌وه ئه‌وه‌یه که زانایانی فه‌رمووده به‌رده‌وام سه‌نه‌دیان به‌کارده‌هێنا، هه‌تاکو هه‌ردوو سـه‌ده‌ی دووه‌م و سـێیه‌م، هـه‌ر یـه‌کێك ویستبایه فه‌رمووده‌یـه‌ك باسـبکات – هـه‌تا ئه‌گـه‌ر لـه (موطـأ)ی مالیـك، یـاخود له‌سـه‌حیحی بوخـاری، یـاخود له‌سـه‌حیحی موسـلیم، یـاخود جیـا له‌مانـه‌ش لـه په‌رتووکـه ناسـراوه‌کان هه‌بوونایـه – ئـه‌وا سـه‌نه‌ده‌که‌ی لـه (موطـأ)، یـاخود بوخاری، یاخود موسلیم باسده‌کرد، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی ئه‌م سـه‌نه‌ده هـیچ به‌هایـه‌کی نه‌بوو، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م په‌رتووکانه له سه‌رده‌می نوسه‌ره‌کانیان ناسـراون، هـه‌ر ئه‌و کاته‌ی ئه‌وان له ژیاندا مـابوون سـه‌دان دانـه‌ی له‌بـه‌رگیراوه، وه‌ك پـه‌رتووکی چاپکراویان لێهاتبوو که ئه‌مڕۆ هه‌یه[2]، ئه‌وه‌نده به‌سبوو یه‌کێکیان ئاماژه‌ی به‌وه به‌وه بدات که ئه‌م فه‌رمووده‌یه، یاخود ئه‌و فه‌رمووده‌یه بوخاری یـاخود موسـلیم یاخود مالیك گیراویه‌تییـه‌وه، بـه‌ڵام ئـه‌وان به‌مـه‌وه نه‌ده‌وه‌سـتان، بـه‌ڵکو باسـی سـه‌نه‌ده‌که‌یان و ئـه‌و ماموستایانه‌شـیان ده‌کـرد، کـه مۆڵـه‌تیان پێـداون بـه گێڕانـه‌وه‌ی ئـه‌و فه‌رموودانـه‌ی کـه لـه‌و په‌رتووکـه ناودارانـه‌دا هـه‌ن، جـا ئه‌گـه‌ر سـه‌نه‌ده‌کان تـه‌نها درۆیـه‌کی ڕووت بوونایـه و دروسـتکراو بـن، بـۆ ئـه‌وه‌ی ئـه‌م

---

١– بڕوانه لاپه‌ڕه (١٥١).

٢– بڕوانه : الفصول في الأصول للجصاص (٣/ ١٢٩)، مجموع فتاوى ابن تيمية (١٨/ ٣٦).

فەرموودانە بدەنە پاڵ سەرچاوەی باڵا وەك ئـەوەی (ڕوبسـۆن) بۆچـوونی وایـە، ئەوا هیچ پێویست نەبوو پاش سـەدەی سـێیەم ئـەو سـەنەدانە بمێننـەوە – کـە تێیـدا هــەموو ئــەو فــەرموودە پەرتوبڵاوانــەی کــە لــە پــەڕاو و ســوحوفەکان نووسرابوون نووسرانەوە – هیچ پێویست نەبوو بۆ گێڕانەوەی ئـەم نووسـینانەی کە لە ژیانی نووسەرەکانیان ناسران و ناوبانگیان دەرکرد، تـا ئـەمڕۆش دەبیـنین زانایــانی فــەرموودە پەرتووکــەکانی فــەرموودە بــە ســەنەدەکانیان بــۆ نووسەرەکانیان دەگێڕنەوە. لێکۆڵەر – بە حوکمی پسپۆڕییەکەی لە فەرموودەدا – هەر شەش پەرتووکەکە و موسنەدی ئەحمەد و (موطأ)ی مالیك، جیا لەمانەش لە پەرتووکەکانی فەرموودە بە سەنەدەکانیان لە مامۆستاکانیان بـۆ نووسـەرانی ئەم پەرتووکانە دەگێڕێتەوە.

٢. گێڕانــەوەی زارەکــی مانــای ئــەوە نییــە کــە نووســینەوە بــوونی نــەبووە، فەرموودەناسان زاراوەی (بۆمانی باسکردووە: حـدثنا)یـان بـەکارهێناوە، کاتێـك مامۆستاکە لە پەرتووکەکەی خۆی دەیگێڕایەوە و بۆ قوتابیەکانی دەگێڕایـەوە و ئەوانیش دەیاننووسییەوە، زاراوەی (پێی ڕاگەیاندین: أخبرنا) ئەوەیە کە ئەگـەر یەکێك لە قوتابیان پەرتووکی مامۆستاکەی بخوێنێتەوە و ئەویش گوێی لێبگرێت و هەڵــە بــۆ خوێنــەرەکان ڕاســت بکاتــەوە، هــەموو قوتابیــەکانی تــریش بینووسنەوە[1].

یــان قوتابیــەکان پــێش هــاتنی وانەکــە پــەرتووکی مامۆســتاکەیان لەبەردەگرتـەوە، پاشـان مامۆسـتاکە پەرتووکەکـەی بـۆ دەخوێندنـەوە، یـاخود

---

١– بڕوانە: فتاوی ابن تیمیة (١٨/ ٢٨)، فتح الباري (١/ ١٥٣)، البحر المحیط (٤/ ٣٨٢– ٤٠٢).

قوتابیــەکان پەرتووکەکــەیان بــۆ دەخوێنــدەوە، لــەو کاتــەدا هەڵــەکانیان لــەو پەرتووکە لەبەرگیراوەی بەردەستیان ڕاستدەکردەوە[1].

بەڵام کاتێك ئەم قوتابیانە ببوونایە مامۆستا، ئەوا تەنها (حدثنا) و (أخبرنا)یا بــەکاردەهێنا، کــە لای فەرموودەناســان بەڵگەیــە لەســەر لکــان و نەپچــڕانی سەنەدەکە، ئەمە لەلای ئەوان گرنگتربوو لە بابەتی نووسینەوە، لەبەر ئــەوە ئــەو گێڕانەوەیــەیان پەســەند نــەدەکرد ئەگــەر لــە پــەرتووکێك بیگێڕایەتــەوە، ئەگــەر گێڕەرەوەکە بە خۆی ئەم پەرتووکــەی لــە نووســەرەکەی گوێبیســت نــەبووبێ — ئەگەرچی پەرتووکەکە بەناوبانگ و سەحیحش بێ —، یــاخود دانەرەکــەی یــاخود یەکێك لەو مامۆستایانەی کە ئەم پەرتووکــەی خوێندبێتــەوە، یــاخود گوێبیســت بووبێت لە مامۆستاکانیان، چونکە دڵنیانــەبوون لــە هەڵــە و کــەم و کوڕییەکــەی، ئەگەر بۆ مامۆستایەکی لێهاتوو و شارەزا و وردەکار نەیخوێندبێتەوە[2].

زاناکانی تر کاریگەر بــوون بــە ڕێگــەی فەرموودەناسان، دواتــر پشــتیان بــەم ڕێگەیــە بەســتووە و ئــەم زاراوانــەیان (حــدثنا) و (أخبرنــا) بــەکارهێناوە لــە پەرتووکــەکانی ئــەدەب و شــیعر و مێــژوو[3]، دیــارە کــە ئــەم زاراوانــەش بــوونی نووسین ڕەتناکەنەوە.

هەروەها وتنی فەرمووده لەلایەن مامۆستاکە بە لەبەر، مانای ئــەوە نییــە کــە پـــەرتووکی لانـــەبووە، ئـــەو فەرموودانـــەی کـــە لەبـــەری کـــردوون تێیـــدا نەینووسیونەتەوە و پێش ئەوەی بچێت بۆ وانەکەی چاوی پێنەخشاندۆتەوە[4]،

---

١- بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/ ٣٤٢ - ٣٦٠).

٢- بڕوانە: علل أحمد - رواية أبي داود - (ص: ٢٢١)، الجرح والتعديل (٥/ ٣٨٢) لە ڕەخنەگرتنی لە ئیبن حەزم.

٣- الأنوار الكاشفة (ص: ٣٤).

٤- بڕوانە: سير الأعلام (٣/ ٢٣٨) لە ئیبن عومەرەوە.

ئەمــەش ڕێگەیــەکی بــاوە لــە وتنــەوەی زانســتە ئیســلامیەکان و عەرەبیــدا، تــا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە، مامۆستاکان وانەکانی خۆیـان وتۆتـەوە بـێ ئـەوەی لـە کاتی وانە وتنەوەکە پەرتووکیان لەگەڵدا بێت، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر توانـای زانستیی و کارامەییان لە لەبەرکردنی پسپۆڕییان لە مێشکی خۆیان.

هەڵەیـە وا گومـان ببـەین کـە وێـژەی (حـدثنا) و (أخبرنـا) بـوونی وتنـەوە و نووسین ڕەتدەکاتەوە[1]، ئـەوەی جـەخت لەسـەر ئەمـە دەکاتـەوە، ئەوەیـە کـە پێشەوا ئەحمەد سەحیفەی هـەممامی لـە موسـنەدەکەی خـۆی گێڕاوەتـەوە بـێ ئــەوەی ئامــاژە بــدات کــە ئــەم پەرتووکــەی لــە لەبــەرگیراوەی مامۆســتاکەی (عەبـدولڕەزاق) لەبەرگرتۆتــەوە، بـەڵکو بـەوە وازی دەهێنـا کـە بڵێـت (حـدثنا عبدالرزاق) واتە عەبدولڕەزاق بۆی گێڕاینەوە، بەم شـێوەیەش عەبـدوڵڵای کـوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کاتێك موسنەدەکەی گێڕاوەتەوە، دەڵێت: (حدثنا أبي) باوکم بۆی گێڕاینـەوە، لەگـەڵ ئـەوەی موسـنەدەکە نووسـراو بـوو، ئەحمـەد لـە پەرتووکەکەی خۆی فـەرموودەی بـۆ عەبـدوڵڵای کـوڕی دەوتـەوە، عەبـدوڵڵا کـە دەڵێــت: (حــدثنا أبــي)، بــوونی نووســین و خوێندنــەوە ڕەتناکاتــەوە، بــەڵکو ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموودەی نەدەوتەوە، تەنها لە پەرتووکەکـەی خـۆی نەبێت لەگەڵ ئەوەی موسنەدەکەی لەبەر بوو[2].

هــــەروەها لــــە عەبــــدولڕەزاقی مامۆســــتای فــــەرموودەی گێڕاوەتــــەوە و پەرتووکەکـەی لەبەرگرتۆتـەوە، ڕازی نـەبووە ئـەو فەرموودانـەی عەبـدولڕەزاق وەرگرێت کە تەنها لەبەری بوون لەگەڵ ئەوەی لەبەرکاریش بوو[3]، بەڵام دەبینن

---

١- بڕوانە: دراسـات في الحـديث النبـوي (١/٨٨)، تـأريخ الـتراث العربـي (١/ ١٤٧)، التـأريخ العربـي والمؤرخون د. شاكر مصطفى (١/ ٧٥/ ٨٢)، ط. ١٩٧٩م، دار العلم- بيروت.

٢- فتاوى ابن تيمية (١٨/ ٣٠).

٣- الأنوار الكاشفة (ص: ٨٠).

لە موسنەدەکەیدا دەڵێت: (أخبرنا عبد الرزاق)، وەك ئەوەی نووسین بوونی نییە لەگەڵ ئەوەی سەلمێنراویشە بەبێ ڕاجیایی، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی وێژەی: (حدثنا) و(أخبرنا) هەرگیز مانای ئەوە نییە کە نووسین نەبووە. موسنەدی ئەحمەد بە خەتی خۆی، تا سەردەمی خەتیبی بەغدادی هەر مابوو، بەخۆی بینیویەتی و باسی کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا موسنەدە چاپکراوەکە پێش هەموو فەرموودەیەك بە وتەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد دەستپێدەکات، کە دەڵێت: (حدثنا أبي)، وەك ئەوەی نە نووسین بوونی هەبووبێ و نە پەرتووك.

٣. ئەگەر واماندانا کە تا سەدەی دووەم سەنەد بوونی نەبووە، یا ئەگەر گریمان هیچ هاوەڵێك هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەری نەنووسیوەتەوە، هەروەها قوتابیەکانی ئەوانیش هیچ فەرموودەیەکیان نەنووسیوەتەوە، ئەوا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ناڕاستی هەموو فەرموودەکان، کە زانایان باسیان کردووە، بەڵکو لەوانەیە هەندێکیان ڕاست بن لە درانە پاڵ پێغەمبەر (درووود و سلاوی خودای لێبێ)، لەوانەیە هەندێکی تریشیان ڕاست نەبن. ئەگەر زانایەك لە زاناکانی ئەم سەردەمە، یاخود بیرمەندێکی ناودار بە دەستپاکییەکی زانستی قسەی لەسەر فەلسەفە، یاخود بۆچوونی مامۆستای مامۆستاکەی کرد، هەندێك تیۆر و بۆچوونی دایە پاڵ، بەبێ ئەوەی باسی ئەوە بکات کە مامۆستاکەی ئەم تیۆر و بۆچوونانەی لە مامۆستاکەی وەرگرتووە، ئەمە ڕێگر نییە لە بە ڕاست دانانی قسەکانی، باسنەکردنی نێوەندگیری و سەنەد مانای ناڕاستی ئەوە نییە کە پێمان دەڵێت، دەستپاکیە زانستییەکەی ڕێگرە لەوەی تیۆرێك، یاخود بۆچوونێك بداتە پاڵ ئەم مامۆستایە، بێ ئەوەی دڵنیانەبێت لە ڕاستییەکەی، جا ئەگەر هاوڕێی هەبن کە لەگەڵی بووبن، لارییان نەبووبێت لەوەی کە بە ئێمە وتراوە، ئەوا ئەمە دڵنیایی زیاد دەکات بەو وتەیەی کە بە ئێمە وتراوە، هەروەها بە درانە

پالْ مامۆستای مامۆستای مامۆستاکەی کە پێینەگەیشتووین و نەشمان بینیـوە، ئەگەر هاوڕێکانی تریش هەمان ئەوەیان وت کە بـە ئێمـە وترابـوو لـە مامۆسـتای مامۆستاکەی وتەکەیان هاوشێوەبوو، ئەوکاتە دڵنیایی و متمانەمان بە ڕاستگۆیی ئەو وتەیە زیاتر دەبێت، لەبـەر ئـەوە فەرمووده‌ناسـان کـۆکن لەسـەر وەرگرتنـی هەندێك فەرموودەی مورسەل[1]، وەك فەرموودە مورسـەلەکانی سـەعیدی کـوڕی موسەیب[2]، کە یەکێك بوو لە گەورە زانایانی شوێنکەوتووانی هـاوەڵان، زۆربـەی جار زۆر فەرموودەی ڕاستەخۆ لە پێغەمبەرەوە (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) بۆ قوتابیەکانی دەوتەوە، بەبێ باسـکردنی نێوەنـدگیری یـاخود سـەنەد، لەگـەڵ ئەوەی زانایانی فەرموودە کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم گێڕانەوانە کـە دەدرێنـە پـاڵ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) سـەحیحن، چـونکە بـە بەدواداچـوون و هەڵێنجان بینیویانە کە ئەم فەرموودانە نەدراونەتە پاڵ پێغەمبـەر، تـەنها ئەگـەر سەحیح نەبووبن، نەبوونی سەنەد ڕێگر نییـە لـە پەسـەندکردنی فـەرموودە و بـە بەڵگەهێنانەوەی.

بـەڵکو فەرموودەناسـان لـەپێناو پاراسـتنی فـەرموودە سـەنەدیان بـە مـەرج دانـاوە، زۆریـش پێـداگیریان لەسـەر کـردووە لـە مەرجـەکانیان بـۆ پاراسـتنی فــەرموودە[3]، وەك دادگــەری گێــڕەرەوە و ڕێکــی و وردی لەبەرکارییەکــەی و گوێبیستبوونی لە سەرووی خۆیەوە – واتە مامۆسـتاکەی –، هـەروەها نـەبوونی گێڕەرەوەیەکی تـر کـە پێچـەوانەی ئـەو بێـت، گێڕانەوەکەشـی لەگـەڵ دەقێکـی

---

١- بڕوانە: إحكام الأحكـام (٢/٧٠)، فتـاوى ابـن تيميـة (١٨/ ٤٩) دەربـارەی فـەرموودەی (لا وصـية لوارث).

٢- بڕوانە: الفصول في الأصول (٣/ ١٤٥)، البحر المحيط للزركشي (٤/ ٤٠٨).

٣- بڕوانە: إحكام الأحكام (١/ ١٣٨)، (٢/ ١٤٦)، مجمـوع فتـاوى ابـن تيميـة (١٨/ ٤٥)، تـأريخ ابـن خلدون (١/ ٤٤١)، البحر المحيط (٤/ ٢٦٧- ٣٦٧)، الأنوار الكاشفة (٩٠/ ٩١).

قورئانی، یاخود کۆدەنگی زانایان یاخود ئەو فەرموودانەی بە ڕێژنەیی هاتوون لە پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) تێکنەگیرێت.

لەگەڵ نەبوونی زۆرێك لەو مەرجانە مانای ناڕاستی ئەو هەواڵ و فەرموودەیە نییە، بەڵکو ئەگەری ڕاستبوونەکەی هەر دەمێنێتەوە، تا ئەوەی بەڵگەیەکی تر لەسەر ناڕاستییەکەی نەبێت، زۆرێك لە ڕووداوەکانی مێژووی مرۆڤایەتی کە مێژوونووسان باسیان کردووە زۆرێك لەو مەرجانەی تێدا نین لەگەڵ ئەوەش لێکۆڵەران لە لێکۆڵینەوەکانیاندا پشتی پێدەبەستن، ئەمەش بە پشتبەستن بە دەستپاکی مێژوونووسەکە کە لەوانەیە بەخۆی ڕووداوەکەشی نەدیبێت، باسی ئەو نێوەندگیرییەشی نەکردبێت کە ئەم زانیارییەی لێوەرگرتووە.

٤. هەواڵەکان دابەش دەبن بۆ هەواڵە ڕێژنەییەکان (موتەواتیر)، ئەوانەی گومان هەڵنەگرن و بڕاوەن (قطعية الثبوت)، لەگەڵ ئەو هەواڵانەی کە کەمتر گێڕەرەوەیان هەیە (آحاد) کە گومان هەڵگرن (ظنية الثبوت)، سەنەدیش زانایان بە مەرجیان نەگرتووە، تەنها لە یەك باردا نەبێت، ئەویش ئەگەر فەرموودەکە ئاحاد بێت، واتە: لە گێڕانەوەی یەك کەسەوە لە یەکێکی ترەوە، یاخود لە گێڕانەوەی ژمارەیەك کە نەگاتە ئاستی ڕێژنەیی، بەڵام ئەگەر بە ڕێژنەیی (متواتر) بوو لای زانایان و خەڵکی ئاسایی، هەمووان لە هەمووان گێڕابێتیانەوە، موسوڵمانان نەوە دوای نەوە دەستاودەستیان پێکردبێ، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) تا سەردەمی نووسینەوە، وەك زۆرێك لە ڕێسا و یاسا و واجیب و سنوورە زانراوەکانی ئیسلام[1]، ئەمانە زانایان پێویستیان بە سەنەد نییە بۆی، نموونەی ئەمەش ژیاننامەی پێغەمبەر (دروود و

---

١- بڕوانە: إحكام الأحكام (١/ ١٠٤)، (٤/ ١٧٣)، فتاوى ابن تيمية (١٨/ ٤٨ -٥١).

سڵاوی خودای لـێبێ) و تێکۆشـان و جەنگـەکانی و هـەموو ڕووداوە گەورەکانـە، ئەمانە ناسراوترن لەوەی سەنەدیان هەبێت، لەبـەر ئـەوە نووسـەرانی ژیاننامـەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) گرنگییان بە باسکردنی سەنەد نـەداوە، لە ڕووداوە سەرەکییەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خـودای لـێبێ)، چونکە هیچ بەهای نییـە، موسـوڵمانان پێویسـتیان بـەوە نییـە کـە یـەکێك بێـت بیسەلمێنێت کـە پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) بـۆ مەدینـە کۆچـی کردووە، ئازادکردنی مەککە، ئاشتەوایی کردووە لەگەڵ مەسیحییەکانی نـەجران، حەجی ماڵئاوایی کردووە... تاد. لەبەر ئەوەی ئەمانە ڕووداوگەلێکن بـە ڕێژنـەیی هاتوون و گومان هەڵنەگر و بڕاوەن، دەیان هەزار کەس بەشـداری تێـدا کـردووە، ملیۆنـان کەسـیش لـەو سـەردەمەدا ژیـاون، پێویسـتیان بـەوە نییـە یـەکێك بـە سەنەدێك بۆی بسەلمێنێت.

ئەمەش وەك ئەوەی مێژوونووسـێك لـەم سـەردەمەدا پـەرتووکێك بنووسـێت، دواتر بیگێڕێتەوە و بڵێت لە مامۆستاکەی گوێی لێبووە کە لە سـەدەی حەڤـدەم شۆڕشێکی گەورە لە فەڕەنسـا هەڵگیرسـا، پادشـایەتی ڕووخـا، دواتـر مافـەکانی مـرۆڤ ڕاگەیـەنرا... تـاد. ئەگـەر هەنـدێك لـە نووسـەرانی ژیاننامـە ئـەم کارەیـان کردبێت ئەوا بە باسکردنی سەنەد ڕاسـتێتی ئـەم هەواڵانـەیان زیـاد نـەکردووە[1]، ئەمە ڕێگەیەکی کۆنە تەنها بۆ ئەوەیە نووسـەر دەیـەوێت بیسـەلمێنێت کـە ئـەم زانیارییانەی لەم زانایە یاخود لەو مێژوونووسە وەرگرتووە.

هەروەها فەرموودەناسان سەنەدیان بە مەرج دانەناوە، بۆ ئـەو فەرموودانـەی کە بە لای زانایان بەناوبانگن، لای هیچ یەکێکیان ون نییە کـە ئـەم زانیارییـە لای هەمووان هەیە، لەبەر ئەوەی ناسراوییەکەی پێویستی بەوە نییە بەدوای سەنەدی

---

١- بڕوانە: إحکام الأحکام (٢/ ٧٠).

ئەم فەرموودەیە بگەڕێیت. زۆربەی فەرموودە سەحیحەکان لای فەرموودەناسان لەم جۆرە فەرموودانەن، لەبەر ئەوە بوخاری و موسلیم لە سەحیحەکەی خۆیان تەنها ئەوەی فەرموودەناسان لەسەری کۆکبوون ئەوەیان وەرگرتووە، ئەمەش لەبەر ناسراوی ئەم فەرموودانە لای هەموو زانایان لە سەدەی دووەم، لەبەر ئەوە مەزهەبە جیاوازەکانی فیقھ ئەم فەرموودانەیان پەسەندکردووە. خەڵکی عێراق و خەڵکی حیجاز هەموویان کۆکبوون لەسەر ڕاستی ئەوەی لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە، هەروەك پێشتر کۆکبوون لەسەر ڕاستی ئەوەی لە (الموطأ)دا هاتووە[1]، هەروەها توندگیری مالیك و وەڵامدانەوەی ئەو بۆ شەرعناسانی عێراق و ڕەخنەگرتن لێیان[2]، ڕێگر نەبوو لەوەی دانبنێن بە ڕاستی ئەو فەرموودانەی کە لە پەرتووکەکەی ئەودا بووە، بەهەمان شێوەیە ڕەخنەگرتنی بوخاری کە لە پێشەوا ئەبو حەنیفە، ڕێگر نەبوو لە بەڕاست دانانی ئەو فەرموودانەی کە لە سەحیحەکەیدا کۆیکردبوونەوە، لەبەر ئەوەی لای هەمووان ناسراوبوون[3] پێش ئەوەی بوخاری لە پەرتووکەکەی خۆی کۆیبکاتەوە – پاش ئەوەی ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویهی مامۆستای ئەم بیرۆکەیەی بۆ خستتەڕوو – ئەم فەرموودانە ڕاستی و هێزیان تەنها بە کۆکردنەوەی بوخاری لە پەرتووکەکەی بەدەستنەهێناوە، بەڵکو هێز و ڕاستییان لەبەر ناسراوی و یەکدەنگبوونی زانایان لەسەر ڕاستی درانە پاڵیان بووە بۆ پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ)،

---

١– بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية (١٨/ ١٦– ١٧، ٤١، ٤٨– ٤٩، ٥١، ٧٠)، (٢٠/٢٣٠)، هەروەها: صحيح مسلم (١/ ٣٠٤) کە دەڵێت: ئەوەم لە پەرتووکەکەی خۆمدا داناوە، کە هەمووان لەسەر ڕاستی و دروستییەکەی یەکدەنگن.

٢– بڕوانە: سير الأعلام (٨/ ٦٨).

٣–تأريخ ابن خلدون (١/ ٤٤٢) کە باسی ئەوەی کردووە بوخاری ئەو فەرموودانەی کۆکردوونەتەوە کە زانایانی حیجاز و عێراق و شام هاوڕان لەسەر ڕاستییەکەی.

پـێش سـەردەمی بوخـاری بەدەسـتی هێنـاوە، لەبـەر ئـەوەی لـەنێو قوتابیـانی هاوەڵان لە عێراق ناسراو بوو، هەروەها قوتابیانی هاوەڵان لە حیجاز کـە خۆیـان لە هاوەڵان وەریانگرتبوو، بەڵکو هێزی بەوە زیاد بـوو لـە دەرهێنـان (تخـريج)ی بوخاری، کە مەرجی توندی دانابوو، ئەمەش وای کرد پەرتووکەکەی لە بەرزترین پلەی ڕاستی و دروستیدا بێت.

٥. ئەگەر واماندانا ئەم بانگەشەیەی کـە پێـی وایـە سـەنەدەکان لـە سـەدەی دووەم دروستکراون ڕاست بێ، بەم سەنەدانە فەرموودەیان پێکهێناوە لەپێناو بە بەڵگەهێنانەوە و ڕەواجپێـدانی، چـۆن نـەبوونی فـەرموودە بـۆ زۆرێـك لـە بابەتـە فیقهییەکان کە مەزهەبەکان ڕاجیان لەسەری ڕاڤە بکەین؟ بۆچی فەرموودەیان بۆ دروست نەکردووە، هـەروەك بـۆ شـتی تـر دروسـتیان کـرد؟ بۆچـی شەرعناسـان پێوانەکردن (القياس)، یاخود وتەی هاوەڵان یاخود بەرژەوەندی ڕەهایان (قاعدة المصـالح) کردۆتـە بەڵگـە[1]... تـاد. لەکاتێکـدا توانیویانــە فــەرموودە لــە پێغەمبــەرەوە (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) دروسـت بکـەن، کـە پاڵپشـتی بۆچوونی ئەوان بکات؟ بەڵکو چۆن حوکمیان لەسـەر هەنـدێ لـە فـەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) داوە کە لاوازە، لەگەڵ ئەوەی پاڵپشتی مەزهەبی ئەوانی دەکرد[2]؟ بۆچی دەبینین شەرعناسان جیاوازن لەگەڵ مەزهەبە فیقهییەکانی خۆیان و پاڵپشتی بۆچوونی جیاوازی مەزهـەبی خۆیـان دەکـەن[3]؟ بەڵکو سوودی ئەم هەموو پەرتووکانە چین کـە بـێ ژمـار زۆرن؟ کـە تێیـدا نـاوی

١- بڕوانە: الفصول في الأصول (٣/ ٣٦١).

٢- بڕوانە: العواصم في القواصم للإمام الزيدي: محمد بن ابراهيم الوزير (٢/٣٧٩) - تحقيـق الأرنـؤوط، ط. ١٩٨٦م، الأردن.

٣- مجموع فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ١٠)، (٢٠/ ٣٠٤ - ٣٠٦).

هەزاران گێڕەرەوە و ڕەخنەلێگرتنی و بەهێزکردنی تێدایە، ئەگەر لە ئەهلی سوننەش نەبوبن، گێڕانەوەی هەندێکیان ڕەتکردۆتەوە ئەگەر لە ئەهلی سوننەش بووبن[1]؟ کۆششی ئەم هەموو زانایانە چییە کە فەرموودەناسان خەرجیان کردووە، لەپێناو کۆکردنەوەی سوننە و پاراستنی و ڕەخنەگرتن لە پیاوانی سەنەد و ڕوونکردنەوەی فەرموودەی سەحیح لە فەرموودەی لاواز... تاد، مادام بابەتەکە هەمووی دروستکردن و درۆ و بەدەمەوە هەڵبەستن بێت؟!.

ئایا ئەوپەڕی ساویلکەیی ئەو کەسانە نییە کە هەواڵێك دروستدەکەن و بەدەمیەوە هەڵدەبەستن، دواتر سەنەدێکی بۆ دروست دەکەن، پاشان بێن ڕەخنە لەم سەنەد و ئەو پیاوانەی ئەم سەنەدەیان دروستکردووە بگرن و حوکم لەسەر ئەم هەواڵەی کە دروستیان کردووە بدەن کە سەحیح نییە؟

ڕەخنە لە هەزاران گێڕەرەوە گیراوە، وەسفیان کراوە بە لاواز یاخود زۆر هەڵەکردن و خەیاڵکاری و وردەکار نەبوون و ناڕێکوپێکی و تۆمەتبارکردنیان بە درۆکردن... تاد، لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵەکانیان هەبوون و بوونی نەوەکانیشیان دوای ئەمە بەردەوام بوو، ئەوان ناوی باپیرانیان لە دەیان پەرتووك دەبینیت کە بەم وەسفە وەسفیان دەکردن بەبێ نارازیبوونی هیچ یەکێك[2]؟

بەڵکو دەبینین عەلی کوڕی مەدینی (١٦١- ٢٣٤ك) کە یەکێکە لە زانایانی فەرموودە، ئەم زانایە حوکم لەسەر گێڕانەوەی باوکی دەدات بەوەی لاوازە[3]!! ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ڕادەی بابەتیبوون و دەستپاکی زانستیی ئەم زانایانە کە

---

١- العواصم من القواصم (٢/ ٣٩٤ - ٤٠٠)، هەروەها بڕوانە: الميزان للذهبي (١/ ١٣٢، ١٣٦)، (٢/ ٢١٩).

٢- بڕوانە: الأنوار الكاشفة (٩٠ - ٩١) لە بەلاواز دانانی گێڕانەوەی هەندێك خەلیفە و میر و ئەوانەی چوونەتە لایان لە لایەن فەرموودەناسانەوە.

٣- بڕوانە: تهذيب التهذيب (٥/ ١٨٧).

هەیان بووە، ئەمە هۆکارێك بوو بۆ متمانەی هەموو شەرعناسان بە حوکمی زانایانی فەرموودە و گەڕانەوە بۆیان بۆ زانینی فەرموودەی سەحیح و فەرموودەی لاواز[1].

هەر لێکۆڵەرێکی بابەتی نابێت ئەم هەموو کۆششە بە بەڵگەنامەکردنە، هەموو ئەم کارە ڕەخنەییە کە فەرموودەناسان پێی هەڵسان ڕەچاونەکات، بۆ ئەوەی لە کۆتایی هەموو ئەو کارەی هەزاران زانایانی فەرموودە کە پێی هەستاون نەبێتە پوچی لەپێناو پووچی، هەموو ئەو فەرموودانەی لەبەر دەستی ئێمەدان هیچیان نەسەلماون، بەڵکوتەنها دروستکراون و بەدەمەوە هەڵبەستراون و هیچ ڕاستییەکیان نەبێت.

لێکۆڵەری بابەتی چۆن مامەڵە لەگەڵ پەرتووکێکی وەك (الموطأ)دا دەکات، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەم ساڵی (١٤٣ك) نووسراوە کاتێك مالیك دەڵێت: (نافیع بۆی گێڕاینەوە، کە گوێی لە ئیبن عومەر بووە دەیوت: پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) فەرموویەتی:..)، یان دەبێت مالیك ئەم دەق و ئەم فەرموودانەی دروستکردبێت و بەخۆی داینابێت، دابێتیە پاڵ نافیعی مامۆستای، کە هیچ زانایەکی موسوڵمانانیش ئەم قسەیەی نەکردووە، بەڵکو یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی مالیك ڕاستگۆ، متمانەپێکراو و وردبین بووە، دەستپاکی زانستی بە گەواهی مامۆستاکانی، نزیکەکانی، دژەڕاکانیشی هەبووە[2]، ناتوانین تۆمەتباری بکەین بەوەی درۆی کردووە بەبێ بوونی بەڵگە، یا دەبێت ئەو دروستکردنە لەلایەن نافیعی مامۆستایەوە بووبێت، کە یەکێك بووە

---

١- بڕوانە: مجموع فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣١٧) دەڵێت: "زانایانی موسوڵمانان هاوڕان لەسەر بە بەڵگەهێنانەوەی ئەو فەرموودانەی فەرموودەناسان بە سەحیحیان داناوە"، طبقات الحفاظ للذهبي (١/ ١٩٨).

٢- بڕوانە: فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣٢٠ - ٣٢٥).

لە زانایانی سەدەی یەکەم (٣٠-١١٧ك)، نەوەك زانای سـەدەی دووەم، ئەگـەری ئەوەی ئەم فەرموودانە دروستکراون و دراونەتە پاڵ ئـیبن عومـەر ئەگـەرێکی زۆر لاوازە، لەبـەر ئـەوەی ئەوانـەی ئـەم بۆچـوونەیان هەیـە دەڵـێن: دروسـتکردن و داهێنانی ئەم سەنەدانە لە نیوەی سەدەی دووەم دەرکەوتن، لەکاتێکدا نافیع لـە ئیبن عومەر مامۆسـتای لـە پێغەمبـەرەوە (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) بـۆی گێڕاوینەتەوە، لە زانایانی سەدەی یەکەم بوو، حەفتا ساڵ لـە سـەدەی یەکەمـدا ژیاوە - کە تیایدا سی ساڵ لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومـەر بـووە (٧٤ك کۆچـی دوایی کردووە)[1]، خزمەتکاریشی بوو، هـەموو زانایـانی سـەردەمی ئـەو گـەواهی دەستپاکی زانستی و ڕاستگۆییان بۆ داوە.

کەواتە هیچ شتێك لەبەردەم لێکۆڵەری بابەتی نامێنێتەوە، تەنها بە ڕاستدانان نەبێت کاتێك دەڵێت: شێخ و مامۆستاکەم ئیبن عومەر لە پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) پێمانی وتووە کە فەرموویەتی: ....

بەڵێ، لەوانەیە هەڵە و وەهم و کەم و کـووڕی بـێ مەبەسـت لـە مالیـك یـاخود نافیع یاخود ئیبن عومەر ڕوویدابێت، ئەمە شتێکی چاوەڕوانکراوە، هـیچ کەسـێك ناتوانێت نکۆڵی لێبکات، بەڵام مالیك درۆ بەدەم نـافیع بکـات، یـاخود نـافیع درۆ بەدەم ئیبن عومـەری مامۆسـتایەوە بکـات، هـەموو ئەمانـە بەڵگـە مێژووییـەکان ڕەتیدەکەنەوە، بەڵکو بە ڕاستگۆیی و دەستپاکی زانستیی گەواهی بۆ دەدەن.

تۆمەتبارکردنی هەر مرۆڤێك، بەوەی متمانەپێنەکراوە، یاخود دەستپاك نییە، بەبێ بەڵگە، ئەوە قسە بۆ هەڵبەستنە، ناکرێت لـەو کەسـە قبـوڵ بکرێـت، تـەنها ئەگەر بە بەڵگەیەکی بڕاوە و بێگومان ئەم تۆمەتە بسەلمێنێ، چ جای ئەوەی ئەم

---

١- بڕوانە لاپەڕە (٩٤).

تۆمەتە ئاڕاستەی زانایەك بكرێت، كە خەڵكانی سەردەمی ئەو بە پێچەوانەی ئەم گەواهییان بۆ دابێت؟!.

كەواتە هیچ نەمایەوە، تەنها ئەگەری ڕوودانی هەڵەی بێ مەبەست لە مالیك، یاخود ئیبن عومەر نەبێت، بە نموونە وەك: ئەوەی مالیك گوێی لە مامۆستایەكی تر بووبێت ئەویش لە ئیبن عومەرەوە، گومانی وابوو بێت كە ئەو مامۆستایە نافیع بووە لەكاتێكدا ئەم كەسە قوتابیەك بووە لە قوتابیەكانی تری ئیبن عومەر. ئەمە ئەو ئەگەرەیە كە دەكرێت گریمانە بكرێت، واتە: ڕوودانی هەڵەی بێ مەبەست، بەڵام ئەم ئەگەرە لاواز دەبێت و نامێنێت ئەگەر ئەمەی خوارەوە سەلمێنرا:

أ/ مالیكی كوڕی ئەنەس یەكێكە لەو لەبەركارانەی گەواهی بۆ دراوانە، كە توانای لەبەركردن و وردی و ڕێكی زۆر بەهێز بووە، یەكێك بووە لە گەورە زانایانی سەدەی دووەم، زانراویشە كە گەواهیدانی زانایانی سەردەمی ئەو لە مامۆستا و هاوەڵ و قوتابی و دژەڕاكانی ئەو لەسەر ئەوە بووە كە لێیان بینیوە و هەستیان پێكردووە، لەسەر هەڵسەنگاندنیان بووە بۆ ئەم زانایە، كە بینیویانە سەدان فەرموودەی لەبەرە و نووسیویەتییەوە، ساڵانێكی زۆر لە مامۆستاكانیەوە بۆ قوتابیەكانی دووبارە كردۆتەوە، كە لە هەموو شار و ناوچەكان بۆ خوێندنەوەی دەهاتن بۆ لای[1]، بێ ئەوەی هەڵە بكات و تووشی وەهم ببێت، یاخود لەبیری بكات، یاخود فەرموودەیەك لەگەڵ یەكێكی تر تێكەڵ بكات... تاد، كە وای لێكردن هەموویان سەرسام بن بە توانای مێشك و لەبەركارییەكەی، هەروەها گەواهیشی بۆ بدەن لەسەر ئەمە.

ئەمەش وا دەكات ئەگەری ڕوودانی هەڵە لەوەوە ئەگەرێكی لاواز بێت.

---

١- فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣٢٤).

ب/ ماليك له گێڕانهوهى پیتاوپیتى زۆر توند بوو، بـه مانـا نهیدهگێڕایـهوه[1]، نه پیتێكى زیاد دهكرد نه كهمیشى دهكرد، ئهگـهر گومـانى لـێ ههبایـه وازى لـه فهرموودهكه دههێنا، ئهگهر سهلما كه زۆر سـووربووه لهسـهر نووسـین و خسـته ناو پهرتووك و پاراستنى ئهوهى نووسیبوویهتى، ههر لهو كاتهى كه گهنج بـووه، تا نووسینى پهرتووكهكهى (موطأ) ئهوا ئهو كاته ئهگهرى ڕوودانى ههڵه زۆر لاواز دهبێ.

ج/ ئهگهر ئهوهش بخرێتهسـهر ئـهوهى پێشـتر، كـه ماليـك يـهكێك بـووه لـهو قوتابيانهى كه زۆرترين كات لهگهل نـافيع بـووه و لـه تايبـهتترينى قوتابيـهكانى نافيع بووه، پێكهوه لـه مزگـهوتێك نوێـژيان دهكـرد، تـا ئـهوهى فـهرموودهكانى نافيعى چهندين جار گوێبيست دهبوو، هـهر كاتێـك قوتـابى نـوێ بهاتنايـه، ئـهوا ماليـك لهگـهڵيان لـه وانـهكانى مامۆسـتاكهى دادهنيشـت، جـارێكى تـر گـوێى لـه فهرموودهكان دهبوو، تا ئـهوهى لهبهركردنهكـهى لـه مێشـكى جێگيرتـر دهبـوو، ئهويش لهبهر ئهوهى زۆر جـار گوێبيسـتى فـهرموودهكان دهبـوو، لـهم دۆخهشـدا ئهگهرى ڕوودانى ههڵه له ماليك له گێڕانـهوهى لـه نافيعـهوه ئهگـهرێكى زۆر لاواز دهبێت.

د/ ئهگهر لێكۆڵهر بينى دهيان گێڕهرهوه ههيـه، كـه زۆرێكيـان گـهوره زانـاى سـهردهمى مـاليكن، هـهمان ئـهو فهرموودانـهى كـه ماليـك لـه نافيعـهوه گێڕاويهتييهوه، ئهمانيش له نافيعهوه گێڕاويانهتهوه[2]، هاوشـانهكانى مـاليكيش

---

١- سير الأعلام (٨/ ٧٥).

٢- بڕوانه پله و ڕيزبهندى قوتابيهكانى نافيع له: سـير الأعـلام (٥/ ٩٦)، تهـذيب الكمـال للمـزي (٢٩/ ٣٠٤)، شرح علل الترمذي (٢/ ٦٦٧).

لـه گێڕانـەوەیان لـە مامۆسـتاکەیان (نـافیع) جیـاواز نـەبوون لەگـەڵ مالیکـدا[1]، هەندێك لەو زانایانەش پەرتووکی وەك (الموطأ)یان نووسیوە، وەك: موحەمـەدی کوڕی ئەبی زیئب و موعەممەری کوڕی ڕاشید و ئیبن جورەیج... تاد – ئەو کاتە توێژەر دەگاتە پلەی دڵنیایی بەوەی مالیك هەڵەی نەکردووە و لـە گێڕانەوەکـەی لە نافیعەوە تووشی وەهم نـەبووە –، بـەم ڕێگەیـە کـە بـە بـەراوردکردنی نێـوان گێڕانەوەکانی قوتابیەکان لە مامۆستاکەیانەوە دێتەجێ، فەرموودەناسان دەزانن کە ئایا تووشی هەڵە بـووە یـاخود نـا، هـەروەها دەتـوانن سەرچـاوەکەی دیـاری بکەن، ئایا ئەمە لە قوتابیەکانەوە یاخود لە مامۆستاوەیە، ئەگەر لە قوتابیـەکان بووە، ئەوا ئەو کەسە کێیە؟ ڕاستەکەی چییە؟ ... تاد[2].

ئەگەر ئەمە بۆ توێژەر سەلما، ئەوا هیچی لەبـەردەم نامێنێـت، تـەنها گومـان نەبێت لـە گێڕانـەوەی نـافیع، لەوانەیـە هەڵەیـەکی بـێ مەبەسـت لـە گێڕانـەوەی هاوەڵی بەڕێز عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕوویدابێت، لەبەر ئەوەی هەڵەکردنی مرۆڤ شتێکی چاوەڕوانکراوە، بەڵام ئەم ئەگەری هەڵەیە نامێنێت، ئەگەر توێژەر بینـی دۆخی نافیع وەك دۆخی مالیکە چونکە:

أ/ یەکێك بوو لە زانایانی قوتابیانی هاوەڵان لە سەدەی یەکەم.

ب/ شارەزاترین کەس بوو بە ئیبن عومەر، کەسێك بوو زۆرترین فەرموودەکان و وتە و بۆچوونە فیقهییەکانی لەبەر بوو، هەتا ئەوەی سالیمی کوڕی عەبـدوڵڵای کـوڕی عومـەر، کـە یـەکێك بـوو لـە گـەورە زانایـانی مەدینـە، دانـی بەمـەداناوە،

---

١– بڕوانـە : التمییـز للإمـام مسـلم (٢١٩– ٢٢٠) کـە هەڵەیـەکی مـالیکی لـە فەرموودەیەکـدا کـە لـە زوهریەوە دەیگێڕێتەوە دۆزیەوە، ئەویش بە بەراوردکردنی گێڕانەوەکەی بە گێڕانـەوەی هاوشـانەکانی کە فەرموودەیان لە زوهریەوە دەگێڕایەوە.

٢– التمییز لمسلم (١٧٠– ١٧٢)، إحکام الأحکام (١/ ٣٧)، فتاوی ابن تیمیة (٤٥– ٤٦).

هـەروەها دانینـاوە بـەوەی کـە نـافیع زانـا و شـارەزا و لەبـەرکارترە لـەو، لـە فەرموودەکانی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری باوکی[1].

ج/ سی ساڵ لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەری مامۆستای بووە، خزمـەتکاری ئەویش بوو، ئەمەش ماوەیەکی درێژە، کـە بەسـبێت نـافیع هـەموو فـەرموودە و بۆچوونەکانی عەبدوڵڵای مامۆستای لەبەربکات.

د/ ئەگەر ئەوەی بـە بەڵگـەی مێـژوویی سـەلمێنراوە زیـاد بکـەین، کـە نـافیع سەحیفەی خۆی هەبوو، هەموو فەرموودەکانی ئیبن عومەری تێدا دەنووسینەوە، زاناکان ئەم سەحیفەیان بۆ دەخوێندەوە[2]. ئەویش ڕێگەی پێدەدان فەرموودەی لێوە بگێڕنەوە[3]، پاش ئەوەی داوایان لێکرد چەند دانەیەکی لەبەرگرتـەوە و بـۆ هەندێك لە زانایانی نارد.

هـ/ ئەگـەر سـەلمێنرا کـە قوتابیـەکانی تـری ئـیبن عومـەر هـەمان ئـەو فەرموودانەیان گێڕابووەوە کە نافیع گێڕاویەتەوە، وەك سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، کە هەمان ئەو فەرموودانەی گێڕاویەتەوە کە نافیع گێڕاویەتەوە[4]، وەك سەعیدی کوڕی جوبەیر کـە فـەرموودەکانی ئـیبن عومـەری نووسـیوەتەوە، ئەوا هیچ شتێك لەبەردەم توێژەر نامێنێتەوە جگە لە دانانی نەبێت بە ڕاستی ئەو فەرموودانەی کە مالیك لە نافیعەوە گێڕاویەتییەوە ڕاستی ئەوەی نافیع لـە ئـیبن عومەرەوە گێڕاویەتییەوە، چونکە هەر یەکێك لەم دوانـە کۆمـەڵێك هـاوەڵ تێیـدا

---

١- بڕوانە: الجرح والتعديل (٨/ ٤٥٢)، شرح علل الترمذي (٢/ ٦٦٥).

٢- سير الأعلام (٥/ ٩٨، ٩٩).

٣- لەوانەی کە فەرموودەکانی نافعیان نووسیوەتەوە موسای کوڕی عوقبـەی قوتـابی بـوو، هـەروەك لـە: تـأريخ بغـداد (٦/٣٢٣)دا هەیـە. تـا ئێسـتاش دوو دەسـتنووس لـە دانەیـەکی لەبـەرگیراوە و سەحیفەی نافیع کە عوبیدوڵای کوڕی عومەر و جوەیرەی کوڕی ئەسما گێڕاویانەتـەوە، لـەلای دکتـۆر ئەعزەمی هەن، بڕوانە: دراسات في الحديث النبوي (٢/ ٤٧١).

٤- بڕوانە: سير الأعلام (٥/ ٩٨)، شرح علل الترمذي (٢/ ٦٦٥).

بەشدار بووە و یەکڕابوون لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودانە. هیچیان نامێننەوە تەنها ئیبن عومەر نەبێت، لەوانەیە لە گێڕانەوەدا تووشی هەڵە یاخود وەهم بووبێت، لێرەدا ئێمە پێمان وایە کە ئەم ئەگەرە زۆر لاوازە، ئەگەر ئەمانەی خوارەوەمان زانی:

أ/ ئیبن عومەر زانای هاوەڵان و لەبەرکاریان بوو، ئەمەش بەخودی داننانی ئەوان بۆ ئیبن عومەر.

ب/ توندترین کەس بوو بەوەی زۆر لاسایی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) دەکردەوە، لە هەموو کەس زیاتر شوێنکەوتەی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) بوو، هەتا لە شتی ئاسایی کە لە شەریعەت نین، کە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) وەك خەسڵەتێکی مرۆیی دەیکرد، وەك: ڕۆیشتن و خواردن... تاد[1].

ج/ سەحیفە و پەڕاوی هەبوون هەندێك فەرموودەی تێدا نووسیبوونەوە.

د/ ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاویەتییەوە، زۆربەیان ئەوانەن کە هاوەڵانی تریش گێڕاویانەتەوە، وەك ئەبو هورەیرە و ئەنەس و جابیر و عائیشە – کە ئەو هەڵانەی کە هاوەڵان لە فەرموودەکان دەیانکرد، بۆی ڕاست دەکردنەوە –.

ئەگەر توێژەر بینی فەرموودەیەك لە فەرموودەکان کە ئیبن عومەر گێڕاوەتییەوە، هاوەڵێکی تر یاخود زیاتر هەمان فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) گێڕاوەتەوە، ئەو کاتە هیچ شتێك لەبەردەم توێژەر نامێنێتەوە، تەنها داننان نەبێت بە ڕاستی ئەو فەرموودانە کە دراونەتە پاڵ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، لەدوای هەبوونی ئەم هەموو

---

١- بڕوانە: سیر الأعلام (٢١٣/٣).

دەستەبەرییانە کە مێژوونووسان بە مەرجیان دانەناوە بۆ ئەو ڕووداوە مێژووییانەی کە پشتی پێ دەبەستن، لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە دەستەبەرییەکانی تێدانین، کە فەرموودەناسان دایانناوە و بە مەرجیان گرتووە بۆ پەسەندکردن و پشت پێ بەستنی.

بەدڵنیاییەوە زۆربەی ئەو فەرموودە سەحیحانە لەم جۆرەن، زیاتر لە هاوەڵێك گێڕاویەتیەوە –دوو یان زیاتر– لە هەموو یەکێك لەمان کۆمەڵێك قوتابی گێڕاویانەتەوە، هەندێکیان ڕاستەخۆ گێڕاویانەتەوە، هەندێکی تریش ڕاستەخۆ لەبەریان کردووە[1].

٦. مەزهەبە فیقهییەکان، لەگەڵ جیاوازی بۆچوونیان لە زۆرێك لە بابەتە فیقهییەکاندا، هیچ جیاواز نییە، یاخود گومانیان نییە لە ڕاستی و دروستی ئەم فەرموودانەی کە فەرموودەناسان یەکدەنگبوون لەسەر ڕاستییان، لەوانە: شەرعناسانی حەنەفی، شافیعی، مالیکی، حەنبەلی و زاهیری، بەڵکو هەتا شیعەی زەیدیش هاوڕابوون لەسەر ڕاستی ئەو فەرموودانەی کە فەرموودەناسان لەسەری یەکدەنگبوون، وەك ئەو فەرموودانەی لە (الموطأ) و بوخاری و موسلیمدا هەن[2]، لەبەر ئەوە هیچ یەکێك لە شەرعناسانی ئەم مەزهەبانە نابینین گومانی هەبێت لە ڕاستی سەلمێنراوی ئەم فەرموودانە لە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، هەتا ئەگەر کاریشیان بە هەندێك لەو فەرموودانە نەکردبێت ئەوا بانگەشەی ناڕاستی ئەو فەرموودانەیان نەکردووە، بەڵکو دەڵێن: ئەم فەرموودانە بە فەرموودەی تر هەڵوەشێنراونەتەوە (نەسخکراون) کە دواتر هاتوون، یاخود

---

١– بڕوانە: الأنوار الكاشفة (٨٠)، (٨٢)، هەروەها بڕوانە: ئەو توێژینەوە کرداریەی کە دکتۆر ئەعزەمی پێی هەڵساوە لەسەر نوسخەکەی سوهەیلی کوڕی ئەبی ساڵح لە پەرتووکەکەیدا: دراسات في الحديث النبوي (٢/ ٥٠١– ٥٨٥).

٢– بڕوانە: فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣١٧)، العواصم من القواصم (٢/ ٣٣٢).

دەڵێن: ئەمانە لێکدانەوەی تریان بۆ دەکرێت، بە ڕووکاری خۆیان وەرناگیرێن، جیا لەمانەش لە هۆکاری تر کە لە پەرتووکەکانی زانایاندا باسکراوە[1].

موحەمەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی – یەکێك بووە لە پێشەواکانی حەنەفییەکان – و موحەمەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی (موطأ)یان بۆ مالیك خوێندەۆتەوە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش بۆ شافیعی خوێندۆتەوە، شافیعیش لەبارەی (موطأ)قوە دەڵێت: "لە دوای قورئانی پیرۆز ڕاستترین پەرتووکە"[2].

ئەم چوار پێشەوایە (موحەمەدی کوڕی حەسەن و مالیك و شافیعی و ئیبن حەنبەل)، لەگەڵ ڕاجیاییان لە زۆرێك لە بابەتە فیقهییەکان، ئەوا لە ڕاستیی ئەم فەرموودانە جیاوازییان نەبووە کە لە (موطأ)دا هەبوون، ئەگەر جیاوازیش بوون لە تێگەیشتن لە ماناکەیان، هەڵوێستی شوێنکەوتووانیشیان لەو فەرموودانەی کە ئەهلی حەدیس لەسەر ڕاستییان هاوڕابوون لە بوخاری و موسلیمدا، هیچ هۆکارێکی لۆژیکی نەبوو ببێتە پاڵنەر بۆ ڕێککەوتنی شەرعناسانی ئەم مەزهەبە فیقهییە جیاوازانە، لەسەر ڕاستیی و دروستی ئەم فەرموودانە ئەگەر ڕاست نەبوونایە، لەگەڵ ئەوەی ئەم مەزهەبانە لە شوێنی جیاواز (مەدینە، کوفە، بەغداد، میسر) لە سەدەی دووەمی کۆچی دروستبوون و گەشەیان کرد.

٧. ئەو فەرموودانەی سەحیحن و هەمووان کۆکن لەسەر ڕاستی و دروستیان لەنێوان شەرعناساندا گەلێك زۆرن، زیاترن لەوەی ناچاربن فەرموودەی درۆ، یاخود فەرموودەی ناڕاست دروست بکەن[3]، چونکە شەرعناسانی عێراق کە

---

١- بڕوانە: إحكام الأحكام (٢/ ١٢٨ – ١٢٩)، فتاوى ابن تيمية (١٩/ ١٩٨- ١٩٩).

٢- بڕوانە لاپەڕە(١٢٢-١٢٣)، سير الأعلام (١٠/ ٧، ١١، ٥٤) لە لەبەرکردنی پەرتووکی (موطأ) لەلایەن شافیعیەوە و خوێندنەوەی بۆ مالیك، هەروەها بڕوانە: الموطأ- رواية محمد بن حسن الشيباني، تحقيق: عبد الوهاب عبد الطيف، ط١٠، المكتبة العلمية- القاهرة .

٣- مقدمة صحيح مسلم (١/ ٢٨).

شوێنکەوتەی ئـەبو حەنیفـە بـوون و شەرعناسـانی حیجـاز شـوێنکەوتەی مالیـك بوون، فەرمووده‌ی مورسەلیان بە بەڵگە داناوە[1]، ئەمەش ئەو فەرموودانەیە، کە یەکێك لـە زانایـانی سـەدەی یەکـەم یـاخود دووەم ڕاسـتەوخۆ لـە پێغەمبـەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) گێڕاویەتەوە بەبێ سەنەد، وتوویانـە: سـڕینەوەی سـەنەد بـۆ کورتکردنـەوە بـووە، ئەگـەر یـەکێك لـە زانایـان فەرموودەیـەکی بـە مورسەلی بگێڕایەتەوە و بیدایە پاڵ پێغەمبەر (دروود و سڵاوی خودای لـێبێ) بـە وتــە و کــردار، ئــەم کــارە تــەنها لەبــەر ئــەوە بــووە کــە بــاوەڕی وابــووە ئــەم فەرموودەیـە بەدڵنیاییـەوە لـە پێغەمبـەرەوە (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) سەلمێنراوە، ئەو کات دەیکردە مورسەل و بـۆ کورتکردنـەوە نێوەندگیرییەکـەی دەسڕییەوە. بەڵکو هەندێکیان پێیان وابوو کە فـەرموودەی مورسـەل بـەهێزتر و ڕاستترە لـەو فەرموودەیـەی کـە سـەنەدی هەیـە، لەبـەر ئـەوەی ئەگـەر زانایـەك فەرموودەیەکی بکردایەتە مورسەل و سەنەدەکەی سڕیبایەوە، وەك ئـەوە وابـوو دەسـتەبەری ڕاسـتی ئـەو فەرموودەیـەی کردبێـت، بـەڵام ئەگـەر سـەنەدەکەی هێنابێتەوە، ئەوا وەك ئەوە وایە کە لە ئەستۆی خۆی لایدابێت و بەرپرسـیارێتی گێڕانەوەی فەرموودەی خستبێتە ئەستۆی پیاوانی سەنەدەکە[2].

ئەگەر کارەکە بەم شێوەیە بێـت، چ شـتێك وای لـە شەرعناسـان دەکـات کـە سەنەد پێکبهێنن و دروستی بکەن، مادەم فەرموودەی مورسەل لای ئەوان بەڵگە بێت، بەڵکو بەهێزتر و ڕاستترە لای هەندێکیان لـەو فەرموودەیـەی کـە سـەنەدی هەیە؟!.

٨. ئـەم گریمانەیـە لەوانەیـە پەسـەندکراو بوایـە، ئەگـەر ڕاجیـایی لـە بابەتـە فیقهییەکان زۆر گەورە بوایە پێویستی بەم جۆرە دروستکردنەی سەنەد هەبوایە،

١- الفصول للجصاص (٣/ ١٤٥)، البحر المحيط للزركشي (٤/ ٤٠٣- ٤٠٨).

٢- الفصول للجصاص (٣/ ١٤٩)، (٣/ ١٨٩).

دواتر درانه پاڵ سەرچاوەی باڵا بۆ بەڵگەهێنانەوە بۆی، بەڵام واقیع پێچەوانەی ئەمەیە و ئەوە دەسەلمێنێ زۆربەی بابەتە فیقهییەکان هەموو زانایان لەسەری کۆکن، لەبەرئەوە ئیبن تەیمیە دەڵێت: "لە فیقهدا لەو بابەتانە ڕاجیایی دروست دەبێت کە بابەتی ورد و لاوەکین، بەڵام ئەوانەی بنچینە و بنەمان ناکۆکییان لەنێودا نییە"[1].

زەرکەشی دەڵێت: "ئەو بابەتانەی کە کۆدەنگیان لەسەرە بیست هەزار بابەتن، چەندین لقی هەن کە کۆدەنگی لەسەر دروست بووە، ئەمانەش لەو سەرچاوانە دروست بوون کە کۆدەنگییان لەسەرە، کە نزیکەی سەد هەزار فەرموودەن، ئەو بابەتە فیقهییانە کە ڕاجیاییان لەسەرە نزیکەی هەزار بابەتن"[2].

هەروەك باسی ئەوەی کردووە کە زۆربەی ئەو بابەتانەی کە ڕاجیاییان لەسەرە، ئەوانەن کە دەکرێت جیاوازی تێدا هەبێت، نەنگی نییە کە هەر کەسێك یەکێك لەم دوو بۆچوونەی هەبێت، لەبەر ئەوەی بابەتی کۆششکارین، بەتایبەت سەلمێنراوە کە زاناکانی ئەم مەزهەبانە فەرمانیان بە قوتابیەکانیان کردووە کە شوێنی بەڵگە بکەون، نەوەك لاساییان بکەنەوە[3]، لەبەر ئەوە دەمارگیری مەزهەبی تەنها لە سەردەمی دوای پێشەواکانی ئەم مەزهەبانە دروستبوون، یاخود سەردەمی دوای قوتابیە کۆششکارەکانیان، واتە: پاش سەدەی سێیەم، پاش نووسینەوەی هەموو سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، هیچ بوارێك نەماوەتەوە بۆ دروستکردنی سەنەد و پێکهێنانی، لەبەر ئەوەی لەلایەك مەزهەبە فیقهییەکان تەواو جێگیربوون، لەلایەکی تریشەوە

---

١- فتاوى ابن تيمية (١٩/ ٢٨٤).

٢- البحر المحيط (٤/ ٤٣٩).

٣- فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ١٠).

هـەموو سـوننەت و فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) نووسرانەوە.

ئەوەی جـەخت لەسـەر ئەمـەش دەكاتـەوە، ئەوەیـە كـە ڕاجیـایی زۆرێـك لـە قوتابیانی ئەو زانا و پێشـەوایانە بـوو، لەگـەڵ ئـەو زانایانـە و هەڵبـژاردنی وتـەی زاناكانی تر لە زۆرێك لە بابەتەكان، ئەمەش بەهۆی باوەڕبوونیان بوو بـە بنـەمای كۆشش و شوێنكەوتنی بەڵگە و سوننەت[1].

٩. ئەگەر واماندانا كە ئەم بانگەشەیە ڕاستبێ، گریمـان هـیچ فەرموودەیـەكی ڕاست لە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) نییە، ئەوا وتـە و فـەتوای هـاوەڵان و بۆچـوونی فیقهـی و ڕاڤـە و تێگەیشـتنیان بـۆ دەقـەكانی قورئـان، بەڵگەیەكی تەواوە لەلای شەرعناسان، چونكە لەسەر دەستی پێغەمبەر (درووود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) فێركـراون، جێبـەجێكردنی شـەریعەتیان لەلایـەن پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) بینیوە، لەبەر ئەوە زانـاترین كـەس بوون بە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و قورئانی پیرۆز، وتەكانیشیان گەلێك زۆرن، هەتاوەكو ئەحمەدی كوڕی حەنبـەل دەڵێـت: "هـیچ بابـەتێك نییـە هاوەڵان قسەیان لەسەر ئەم بابەتە و هاوشێوەی ئەم بابەتە نەكردبێت"[2].

هەروەك شەرعناسان كۆدەنگی زانایانیان بـە بەڵگـە زانیـوە، هـەروەها وتـەی تەنها هاوەڵێكیان بە بەڵگە زانیوە، ئەگەر هاوەڵێكی تر ڕاجیا نەبووبێت[3].

هیچ هۆكارێك نییە بۆ دروستكردن و پێكهێنانی سەنەد، تەنها ئەگەر گریمانەی ئەوە بكـەین كـە لـە هـاوەڵان هـیچ شـتێك نەسـەلمێنراوە، هـەتاوەكو بۆچـوونە فیقهییەكانیشیان، ئەمەش لەخۆباییبوونـە هـیچ كـەس نـەتوانێت بانگەشـەی بـۆ

---

١- فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ١١).

٢- فتاوى ابن تيمية (١٩/ ٢٨٥).

٣- بڕوانە: الفصول للجصاص (٣/ ٣٦١).

بکات، جا ئەگەر هیچ شتێك نەبێت، ئەوا تەنها فیقه و ڕاڤەی ئیبن عەبباس (٦٨ك کۆچی دوایی کردووە) بەسە، کە زانایەکی گەورە بووە، هاوەڵان بۆ ڕاڤەی قورئان بۆ لای ئەو دەگەڕانەوە[(١)]، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود گەواهیداوە کە زانایەکی گەورە بووە و ڕاڤەی بەهێز بووە[(٢)]، هەروەك ئیبن عەبباس زاناترین کەس بووە بە دادوەری پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی[(٣)]، شەرعناسێکی گەورە بوو، ئەگەر یەکێك لە هاوەڵان لە بابەتێکی فیقهی لەگەڵی ڕاجیابووایە، گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد تا ئەوەی باوەڕی پێدەهێنا کە بۆچوونی ئەو دروستترە[(٤)]، هەروەك یەکێك بووە لە لەبەرکارانی فەرموودە و سوننەت، هەتاوەکو لەبارەی بابەتێك، یاخود یەك فەرموودە لە سی هاوەڵی دەپرسی، بۆ ئەوەی دڵنیابێت لە ڕاستی ئەو فەرموودەیە کە لە پێغەمبەرەوەیە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)[(٥)].

لەبەر ئەوە ناویان نابوو زانای ئوممەت و دەریای زانست، لەبەر زۆری زانستەکەی، چونکە کۆکەرەوەی زانستی ڕاڤە و فەرموودە و فیقه و دادوەری بوو، ژمارەی قوتابیە ناسراوەکانی نزیکەی (٢٠٠) زانا دەبوون[(٦)]، دواتر بوونە زانای سەردەمی خۆیان، لە مزگەوتی مەککە وانەکانی دەوتەوە، بۆ قوتابیەکانی دەخوێندەوە و ئەوانیش دەیاننووسییەوە، لە کۆتایی ژیانی پەرتووکەکانی

---

١- بڕوانە: فتح الباري (٨/ ٩٩)، الإصابة (٢/ ٣٣٠)، تذكرة الحفاظ (١/ ٣٧).

٢- سير الأعلام (٣/ ٣٤٧).

٣- سير الأعلام (٣/ ٣٥٠)، مقدمة صحيح مسلم (١/ ١٣).

٤- سير الأعلام (٣/ ٣٥١).

٥- سير الأعلام (٣/ ٣٤٤).

٦- سير الأعلام (٣/ ٣٣٣) .

ئەویان بۆ دەخوێندەوە و ئەویش بۆی ڕاستدەکردنەوە[1]، فەتوا فیقهییەکانی دوگەنە نزیکی بیست جەڵد[2].

مێژوونووسی گەورە موسای کوڕی عوقبە – کە یەکێك بوو لە قوتابی قوتابیەکانی ئبین عەبباس – دەڵێت: "کوڕەیب بە ئەندازەی بارە هێیسترێك لە پەرتووکەکانی ئیبن عەبباسی لەلای ئێمە دانا"[3].

ئەگەر هەموو ئەمانە سەلمێنران و هیچ گومانێکی تیا نەما، ئەگەر گریمان لە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و هاوەڵان هیچ فەرموودەیەك، یاخود بۆچوونێکی فیقهی، یاخود حوکمی دادوەری نەسەلمێنرا، ئەوا ئەوەی لە ئیبن عەبباسەوە بە تەنها لە فەرمووده و ڕاڤەی قورئان سەلمێنراوە بەسە، چونکە ئەو فەرموودانە هەر لە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و گەورە هاوەڵانەوە وەریگرتوون، لەبەرئەوەی لەوانەوە ئیبن عەبباس ئەم هەموو زانستانەی وەرگرتووە. ئەگەر گریمان ئیبن عەبباس هەموو ئەمەی وتووە و نەیداوەتە پاڵ پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، ڕوونکردنەوەی بەناوی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، یاخود هاوەڵانی نەداوە، ئەوا ئەو کاتە ئەوە بە خەیاڵدادێت کە ئەم زانستە شەرعییانەی لە پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ)، یاخود گەورە هاوەڵەکانەوە وەریگرتووە، چونکە تەنها لەسەر دەستی ئەوان خوێندویەتی و فێربووە. زاناترین کەس بوو بە پێغەمبەر و هاوەڵان و بۆچوونە فیقهییەکان، دادوەرییەکانیان، ئەگەر هیچ نێوەندگیرییەك لەنێوان پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) و هاوەڵانی و شوێنکەوتووانی نەبێت، تەنها ئیبن عەبباس نەبێت، ئەوا بەسە، ئەی چی لەبارەی سەدان بەڵکو هەزاران

١– سير الأعلام (٣/ ٣٥٤).

٢– إحكام الأحكام (٩٢/٥)، سير الأعلام (٣/ ٣٥٨).

٣– بڕوانە: سير الأعلام (٤/ ٤٨٠)، فتاوى ابن تيمية (٢٠/ ٣٢٠ – ٣٢٥).

هاوەڵ کە لە هەموو شوێنێك بڵاوببوونەوە، هەتا شارێکی وەك کوفە نزیکەی سێ سەد هاوەڵی گەورەی لێبوو، خەڵکی کوفە قورئان و سوننەت و فیقهیان لێوەردەگرتن، ئەم هاوەڵانە هیچ شتێکیان لانەبوو پیشانی شوێنکەوتووانی بدەن تەنها ئەوە نەبێت کە لە پێغەمبەرەوە (دروود و سڵاوی خودای لێبێ) فێربووبوون[1].

لە کۆتاییدا بۆچوونەکانی (گۆلدزیهر) و (شاخت) و (ڕوبنسون) دەربارەی سوننەت دەکرێت قبوڵبکرێت، ئەگەر توانییان بەڵگەی بڕاوە و دڵنیاکەرەوەیان لەسەر بۆچوونەکانیان بهێنن، بەڵام ئەگەر هەر گومان و ئەگەر بێت و مادام هیچ یەکێك لە مێژوونووسانی ئەو سەردەمە ئاماژەیان بەو شتە نەکردبێت کە ئەوان باسی دەکەن، هەروەها مادام سەدان دەق و بەڵگەی مێژوویی لە دەیان سەرچاوە هەر لە سەدەی یەکەمی کۆچی هەبوونی پەرتووکی فەرموودە و سوننەت دەسەلمێنن، ئەوا هیچ شتێك لەبەردەم توێژەری بابەتیی نامێنێتەوە تەنها داننان نەبێت بە هەڵەی دەرئەنجامی ئەوانە کە ئەم بۆچوونانەیان هەیە، بەڵکو دەبێت پابەند بن بەوەی کە مێژوونووسان دوپاتی دەکەنەوە، کە زۆر باسی ئەو پەرتوك و سەحیفانەیان کردووە، هەروەها ئەوەی کە زانایانی فەرموودە لێیانەوە نەقڵیان کردووە و خستویانەتە ناو کتێبەکانیانەوە، یان لێین وەرگرتووە، کە تا ئەمڕۆش هەندێکیان هەر دەستنووسن.

---

١- بڕوانە: الفصول للجصاص (٣/ ٣٢٣).

## پەرتووكەكانی ( فەرموودەكانی ئەحكام ) و قۆناعەكانی بەرەوە پێشچوونیان

پەرتووكەكانی (فەرموودەكانی ئەحكام)، ئەو پەرتووكانەن كە گرنگی بە كۆكردنەوەی فەرموودەكانی پێغەمبەر (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) دەدەن، كە تایبەتن بە فیقهی ئیسلامی، كە شەرعناسان پێویستیانە بۆ هەڵێنجانی حوكمە شەرعییەكان. ڕۆژهەڵاتناسان هەوڵیان داوە بەتایبەت گومان لەبارەی فەرموودە فیقهیەكان دروست بكەن، بۆ گەیشتن بە سەلماندنی ئەو بۆچوونەیان، كە دەڵێن فیقهی ئیسلامی لەسەر بەڵگەی سەحیحی سەلمێنراو لە پێغەمبەرەوە (درووود و سڵاوی خودای لێبێ) دانەمەزراوە. بۆیە پێویست بوو چاودێری قۆناغەكانی دەركەوتنی ئەم جۆرە لە نووسین بكرێت لە هونەری فەرموودە، بۆ سەلماندنی پووچەڵیی ئەم بانگەشەیە، هەروەك بەشێوەیەكی گشتی لە دوو بەشی پێشووتر، پووچەڵیی گومانەكانی ئەوانمان دەربارەی فەرموودە سەلماند.

لێكۆڵەر دەقێكی مێژوویی دیاریكراوی نەبینیوە، ئاماژە بە یەكەم بكات نەداوە كە پەرتووكی تایبەتی لەبارەی (فەرموودەكانی ئەحكام) نووسیبێ، كە فەرموودەی تایبەتن بە بەڵگەكانی فیقهی ئیسلامی، جیا لەمە دەتوانین بڵێین هاوەڵی ڕێزدار، عەبدوڵڵای كوڕی عەمر، یەكەم كەس بوو گرنگی بە كۆكردنەوە و نووسینەوەی ئەم فەرموودانە داوە، لە سەحیفەكەی خۆی كە ناوی (الصادقة) بووە[(١)]، ئیبن تەیمیە لەبارەی ئەم سەحیفەیەوە كە لای عەمری كوڕی شوعەیب بوو[(٢)] – نەوەی هاوەڵی بەڕێز عەبدوڵڵای كوڕی عەمر بووە –، دەڵێت: "ئەو نوسخەیەی عەمری كوڕی شوعەیب ئەندازەیەك فەرموودەی فیقهی تێدابوو، كە پێویست بێت بۆ زانایانی موسوڵمانان"[(٣)].

١- بڕوانە لاپەڕە (٥٥-٥٦).

٢- بڕوانە لاپەڕە (٩٦-٦٧).

٣- مجموع فتاوى ابن تيمية (١٨/ ٨- ٩).

ئەمــە زۆر ڕوون و ئاشــكرایە، هــەروەك لــە بەدواداچــوون بــۆ سەرچــاوە فەرموودەییــەكان دەردەكــەوێ، وەك موســنەدی ئەحمــەد، یــاخود موســەنەف، یاخود سونەن، كە هەموو فەرموودەكانی ئەم سەحیفەیان لەخۆگرتبوو[1].

وا دەردەكەوێت كە قــازی عــامیری شــەعبی (٣٠– ١٠٦ك) كــە یــەكێك بــوو لــە قوتابیانی هاوەڵان[2] گرنگی بە كۆكردنەوەی فەرموودەكانی ئەحكام دەدا لە یەك پەرتووكدا، ئەمــەش لــە وتــەی قوتابیەكــەی عاســم دەردەكــەوێت كــە دەڵێــت: "فەرموودەكانی فیقهمان بۆ شــەعبی خوێنــدەوە و ئــەویش مۆڵــەتی پێــداین"[3]، ئەمــە دەقێكــی ڕاشــكاوە لەســەر ئــەوەی قوتابیــەكانی شــەعبی پــەرتووكێكی تایبەتیان لەبارەی (فەرموودەكانی فیقه) بــۆ خوێندۆتــەوە، دواتــر مۆڵــەتی داوە ئەم فەرموودانە لەوەوە بگێڕدرێنەوە.

ئەمەش مانــای واناگەیــەنێت كــە زانایــانی تــر ئــەم فەرموودانــەیان نــەزانیوە، چــونكە ناكرێــت یــەكێك ببێتــە شــەرعناس و دادوەر و بێئاگــاش بێــت لــە فەرموودەكانی ئەحكام[4]، شــافیعی دەڵێــت: "بنــەماكانی ئــەحكام پێــنج ســەد و شتێك فەرموودەن، هەموویان لای مالیك هەبوون تــەنها ســی فــەرموودە نــەبێت، هەموویان لای ئیبن عویەینە هەبوون، تەنها شەش فەرموودە نەبێت"[5].

---

١– بڕوانە: أطراف المسند لابن حجر (٤/ ٢٦– ٥٣).

٢– بڕوانە لاپەڕە (٨٨–٨٩).

٣– المعرفة والتأريخ (٢/ ٨٢٦).

٤– بڕوانە: البحر المحيط للزركشي (٦/ ٢٠٠)، الفصول في الأصول للجصاص (٤/ ٢٧٣) .

٥– سير الأعلام (٨/ ٤٥٧، ٤٥٩)، واتای (أصول الأحكام) ئەو فەرموودە سەرەكییانە دەگرێتەوە كــە فیقهی ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت، ئەمەش بوونی فەرموودە لە لقەكان ڕەتناكاتەوە، كە گوزارشــتە لە زیاتر ڕوونكردنەوە و درێژەدان، یاخود دووبارەبوونــەوەی فــەرموودە ســەرەكییەكانە كــە شــافیعی ناوی ناون (أصول الأحكام).

گومانی تێدا نییە کە (موطأ)ی مالیك شرۆڤەی ئەم فەرموودە فیقهییانەن، ئەمەش پەرتووکێکی کۆکەرەوەیە لە فەرموودە و فیقه، کە زیاتر لە پێنج سەد فەرموودە لەخۆدەگرێت[1]، هەروەك ئەو فەرموودە فیقهییانەی کە لای سوفیانی کوڕی عویەینە بوون، نزیك بوون لەم ژمارەیە، ئەمەش لە موسنەدی حومەیدی بوون کە لەڕاستیدا پەرتووکی سوفیان بوو بۆ حومەیدی قوتابی دەخوێندەوە و ئەویش دەینووسییەوە[2]. هەروەك ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموودەکانی مامۆستاکەی (سوفیانی کوڕی عوەینە)ی دەنووسییەوە و لە موسنەدەکەی گێڕاویەتییەوە، هەروەها شافیعیش ئەم کارەی کرد کە لێهاتووترین قوتابی مالیك و سوفیانی کوڕی عویەینە بوو، وانەی لای ئەوان دەخوێند و پەرتووکەکانی ئەوانی لەبەر دەکرد، لەو کاتەی کە لە حیجاز بوو[3]، فەرموودەکانی ئەم دوو مامۆستایەشی لە پەرتووکی (الأم)دا گێڕاوەتەوە، لەگەڵ هەموو ئەمانە نە مالیك و نە سوفیان و نە شافیعی، خۆیان پەرتووکێکی تایبەتیان بە فەرموودەکانی ئەحکام نەنووسیوە، لەوانەیە هۆکارەکە بگەڕێتەوە بۆ پێویست نەبوونیان بەم جۆرە پەرتووکە تایبەتە لەم بابەتەدا، لەبەرئەوەی پەرتووکەکانیان گشتگیر بوون، لەگەڵ فەرموودەکانی ئەحکام و فەرموودەی تر لە ئاداب، یاخود ژیاننامەی پێغەمبەر یاخود ڕاڤەی قورئان، یاخود بیروباوەڕ لەخۆدەگرت، هەروەك ڕاڤەی مانای ئەم فەرموودانەشی تێدایە، هەر بۆیە پەرتووکەکانیان لە پەرتووکەکانی فیقه هەژمار دەکرێن نەوەك فەرموودە.

---

١- بڕوانە: فضل الموطأ: محمد بن علوي بن عباس (ص٣١٥)، ط١، ١٩٧٨، دار السعادة- مصر.

٢- بڕوانە: مسند الحميدي.

٣- بڕوانە: سير الإعلام (٨/ ٤٥٧ - ٤٥٩).

پێویستبوونی نووسینی تایبەت لەم بابەتەدا دەرنەکەوت، تەنها پاش سەدەی دووەمی کۆچی نەبێ، کە لەو کاتدا پەرتووکی تایبەت بە فەرموودەکانی ئەحکام و بەڵگەی فیقهی ڕێکخراو لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی دەرکەوتن.

دەکرێت پەرتووکی (المنتقى في الأحكام)ی[1] لەبەرکار عەبدوڵڵای کوڕی عەلی کۆڕی جارود (٢٣٠– ٣٠٧ك) بە یەکێك لە پەرتووکە یەکەمەکانی فەرموودەکانی ئەحکامی تایبەت بە فەرموودەکانی فیقھ دابنرێت، زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت: "یەك بەرگ بوو لە ئەحکام، هەرگیز لە پلەی حەسەن نایەتەخوار، تەنها لە حاڵەتی ڕیزپەڕدا نەبێت، لەو فەرموودانە ڕای ڕەخنەگران تێیدا جیاوازن"[2]، بۆیە ناوی نابوو (المنتقى)، ژمارەی فەرموودەکانی دەگاتە (١١١٤) فەرموودە، ڕێکخراوە لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی، بە پاك و خاوێنی دەستپێدەکات، دواتر نوێژ، بە (فيء) و خەراجیش کۆتایی پێدێت.

ئەم فەرموودانەی لە مامۆستاکەی بە سەنەدەوە گێڕاوەتەوە، کە قوتابی قوتابی مالیکی کوڕی ئەنەس و شافیعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو، پەرتووکەکەشی وردبینیکراوە و لە چاپدراوە[3].

لەوانەیە ئەم پەرتووکە بێت ڕێگەی خۆشکردبێت بۆ بەرەوپێشچوونی نووسینەوەی پەرتووکەکانی (ئەحکام)، کە تایبەتن بە بەڵگە، کە لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی لە ئەندەلوسدا ناسراو بوو، کە بووە هۆی ئەوەی حافز قاسمی کوڕی ئەسبەغ (٢٥٠– ٣٤٠ك) فەرموودەناس و شەرعناسی قورتوبە، پەرتووکێك بنووسێت بە ناونیشانی (المنتقى) لەسەر شێوازی پەرتووکی ئیبن

---

١– تذكرة الحفاظ (٣/ ٧٩٤).

٢– سير الأعلام (١٤/ ٢٣٩).

٣– بڕوانە: غوث المكدود بتخريج منتقى ابن الجارود لأبي إسحاق الحويني، ط١، ١٩٨٨م، الكتاب العربي– بيروت.

جاروود، تایبەت بە فەرموودەکانی ئەحکام، بە هەمان ڕێگە و ڕێکخستنی ئەو[1]، فـەرموودەکانی بـە سـەنەدەکانەوە دەگێڕایـەوە کـە لەسـەر چـەندین دەروازەی فیقهی ڕێکخراو بوو.

پەرتووکەکانی قاسمی کوڕی ئەسبەغ لە ناسـراوترین پەرتووکـەکان بـوون لـە ئەندەلوسـدا هـەر لـە سـەدەی چـوارەمی کۆچـیەوە، گـەورە زانایـان سـوودیان لێبینیوە، وەك ئیبن عەبدولبەڕ (٣٦٨- ٤٦٣ك) و ئیبن حـەزم (٣٨٤- ٤٥٦ك) و جیـا لەمانـەش[2]، تـا ئـەوەی ڕێگـای خۆشـکرد بـۆ دەرکـەوتنی نووسـینەکانی عەبدولحـەقی ئیشـبیلی ئەندەلوسـی (الأحكـام الكـبرى) و (الأحكـام الوسـطى) و (الأحكام الصغرى) — کە دواتـر باسـیان لێـوە دەکـەین — کـە کاریگـەر بـوو بـە ڕێگەی قاسمی کوڕی ئەسبەغ و ئیبن جـاروود، کـە دواتـر زیـاتر گەشـەی پێـدا و باشتر ڕێکیخست.

لەو ماوەیەی کە لـە ئەنـدەلوس پـەرتووکی قـاسمی کـوڕی ئەسـبەغ بـەناوی: (المنتقى) دەرکەوت، هەر لەو سـەردەم و ماوەیەشـدا پـەرتووکێکی تـر لـەبارەی فەرموودەکانی (ئـەحکام) بەناونیشـانی: (المنتقـى) کـە هـی لەبـەرکار سـەعیدی کوڕی عوسمان ئیبن سەکەنی بەغدادی (٢٩٤- ٣٥٣ك) بوو دەرکەوت، لـە میسـڕ دادەنیشت و هەر لەوێش کۆچی دوایـی کـرد، لـەوێش پەرتووکـەکانی ناسـران[3]. پەرتووکێکی بەناوی (صحيح المنتقى) لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی ڕێکخـراو بـوو، کــە تایبــەت بــوو بــە ئــەحکام، بــەڵام ســەنەدەکانی ســڕیبوونەوە،

---

١- الرسالة المستطرفة (ص: ٢٥).

٢- سير الأعلام (١٥/ ٤٧٣).

٣- سير الأعلام (١٦/ ١١٧).

کورتکرابــووەوە، ئــەو دەق و بەڵگــە فیقهییانــەی کــە شەرعناســان لەســەری یەکدەنگن تیا دانا بوو، یاخود هەندێکیان بە بەڵگەیان هێنابووەوە[1].

پاشان دوای سـەدەی چـوارەم نووسـین لـەم هونـەرە بەرەوپێشچـوو و زیـاتر گشتگیر بوو، زیـاتر پشـتی دەبەسـت بـە سەرچـاوە سـەرەکییەکانی فـەرموودە، زاناکـان لـەم ماوەیـەدا لـە پەرتووکـەکانی فـەرموودە کـە ناسـراوبوون، وەك؛ سەحیحی بوخاری، سەحیحی موسلیم و سـونەنی ئـەبی داود و تورمـوزی و ئـیبن ماجە و نەسائی و موسـنەدی ئەحمـەد، جیـا لەمانـەش مـادەی پەرتووکـەکانیان کۆدەکردەوە و (فەرموودەکانی ئەحکامیان) دەنووسییەوە.

لەگـەڵ ئـەوەی نووسـەرانی ئـەم پەرتووکانـە (فـەرموودەکانی ئـەحکام) لـەم ماوەیـەدا لـە قوتابخانـە فیقهییـە جیاوازەکـان بـوون. ئـەم پەرتووکانـە بوونـە سەرچاوەی فێرکاریی گرنگ کە قوتابیەکان لە مێشکی خۆیان لەبـەریان دەکـرد. زۆرێـك لـە شەرعناسـان لەگـەڵ جیـاوازی مەزهەبـە فیقهییـەکانیان لەسـەریان دەخوێند و شرۆڤەیان دەکرد، لەبەر ئەوەی سەرچاوە سەرەکییەکان لە بنەڕەتدا سەرچاوەی هاوبەشـن لـەنێوان هـەموو مەزهەبـە جیاوازەکـان، هـەموویان پشـت دەبەستن بە هەردوو سەحیحەکە و چوار سونەنەکە و موسنەدی ئەحمەد... تاد، لەبـەر ئـەوەی زۆرێـك لـە (فـەرموودەکانی ئـەحکام) ئـەو بەڵگانـەن کـە هـەموو مەزهەبە فیقهییەکان لەسەری یەکدەنگن، جا ئەگەر ڕاجیاش بن لەسەر چۆنیەتی بە بەڵگەهێنانەوەی، هەروەك دۆخی (ئایەتەکانی ئەحکام) بەم شێوەیەیە، وێڕای ئەوەی هیچ ڕاجیایی نییە لەسەر ئەوەی لای هەموو شەرعناسان سەرچـاوەن بـۆ تەشریعی ئیسلامی، جا ئەگەر ڕاجیاش بن لە ڕاڤـەی ئایەتـەکان و تێگەیشـتن لـە ماناکانی و چۆنیەتی بە بەڵگە هێنانەوەی، دۆخی فەرموودە سەحیحەکانیش بەم

---

١- الرسالة المستطرفة (ص: ٢٥).

شـێوەیەیە، تـەواو وەك ڕاجیـایی پسـپۆڕانی یاسـا و دادوەری لـە ڕاڤـەکردن و تێگەیشتنی دەقە یاساییەکان، یاخود ماددەی دەستووری، لەگەڵ ئەوەی ئـەوان هاوڕان لەسەر سەرچاوە بوون و پابەندبوون بەوەی کاری پـێ بکـەن، ئەگـەریش تێڕوانینیان لە تێگەیشتنی جیاواز بێت.

نووسـەرانی ئـەم پەرتووکانـە (فـەرموودەکانی ئـەحکام) لـە دوای سـەدەی چوارەم مەبەستیان بوو کـات و کۆشـش بـۆ پسـپۆڕانی فیقـە کورتبکەنـەوە، بـۆ ئەوەی ئەم پەرتووکانە لەبەربکەن، لەبەر ئەوە لە کورتکرنـەوە و لـە سـڕینەوەی سەنەدەکان هونـەرکارییان کـرد، هـەروەها سـڕینەوەی دووبارەبووەکـان، دواتـر سڕینەوەی هەموو ئەو فەرموودانەی پەیوەست نین بە حوکمی فیقهیەوە.

ئەمـەش کورتەیـەکی مێژوویـە دەربـارەی پەرتووکـەکانی (فـەرموودەکانی ئەحکام) لەو قۆناغەدا، بەناوبانگترین ئەم پەرتووکانەش ئەمانە بوون[١]:

١- (الأحکام الشـرعیة): دانـراوی موحەمـەدی کـوڕی عەبدولحـەقی ئیشـبیلی (٥٨١ك کۆچی دوایی کردووە)، کـە سـێ پـەرتووکن: گـەورە، ناوەنـد و بچـووکی کورتکراوە[٢]، یەکەم جـار (الکـبری)ی نووسـی، سـەنەد و گێڕانـەوەکانی هـەموو فەرموودەکانی بە سەنەدەکانی خاوەن سەرچاوەکان کە لێوەی وەرگـیراوە تێـدا باسکرد، دواتر بە (الوسطی) کورتیکردەوە، سەنەدەکان و هەنـدێك فـەرموودە و گێڕانەوەی سڕینەوە، هەروەك هەندێك نووسین و شرۆڤەی خۆی سڕینەوە[٣].

دواتر (الوسطی)ی بۆ (الصغری) کورتکردەوە، کە فەرموودە لاوازەکانی تێـدا سـڕینەوە، تـەنها فـەرموودە سـەحیحەکانی هێشـتنەوە، کـە لـە پێشـەکی

---

١- بڕوانە: الرسالة المستطرفة للکتاني (١٧٨- ١٨٠)، أصول التخریج: د. الطحان (١٢٤).

٢- بڕوانە پێشـەکی توێـژەر (خالـد العنـبري) بـۆ (الأحکـام الشـرعیة الصـغری) (١/ ٥٣- ٦٢)، سـیر الأعلام النبلاء للذهبي (٢١/ ١٩٩).

٣- مقدمة خالد العنبري (١/ ٥٥).

(الصــغرى)دا دەڵێــت: "ئــەو فەرموودانــەی کــە ســەنەدەکانیان ســەحیحن هەڵمبژاردوون، کـە لای ڕەخنـەگران ناسـراون، ئەوانـەی کـە ئـەم فەرموودانـەیان ســەلماندووە هێناویانـــە، متمانـــەپێکراوەکانیش ئاڵوگۆڕیـــان پێکـــردووە و گێڕاویانەتەوە، لە پەرتووکەکانی زانایان و پێشەنگانی ئوممەت وەرگیراوە.."[١].

لە کۆتایی پێشەکییەکەیدا باسی ئامـانجی ئـەم کورتکردنـەوەی کـردووە، بـۆ ئەوەی بووە ئەم فەرموودانە ئاسان بکات بـۆ ئەوانـەی دەیانـەوێت لەبەریبکـەن، ساکارکردن بۆ ئەوانەی دەیانەوێت لێی تێبگەن و لە ماناکانی ڕابمێنن[٢].

دەکرێـت عەبدولحـەقی ئیشـبیلی ئەندەلوسـی بـە یەکـەم کـەس دابنرێـت لـە نووســینەوە دەربــارەی ئــەم هونــەرە*، هــەروەك خۆیشــی گەشــەی پێــدا و ڕێکیخســتەوە، دوای ئــەوەی (الکـبری)ی کـورتکردەوە بـۆ (الوسـطی)، پاشـان (الصـغری) بـووە نموونەیـەك کـە زانایـان لەسـەر ئـەم شـێوازە بنووسـنەوە. تـا ئێستاش (الأحکام الکبری) دەستنووسە، کە دانەیـەکی لـە (دار الکتـب المصـریة (٢٩ حدیث) هەیە[٣].

---

١- الأحکام الشرعیة الصغری (١/ ٧١).

٢- هەمان سەرچاوە (١/ ٧٢).

* لـە پـێش ئـەوەوە ئەحمـەدی کـوڕی ئـەبی مـەڕوانی مامۆسـتای لـەم هونـەرەی نووسـیوە، کـە شەرعناسێکی زاهرییە، لەبـەرکار و فەرموودەناسـێکی گەورەیـە، کتـێبی (المنتخـب المنتقـی)ی دانـا، لەســەر ئەمــە عەبدولحــەقی ئیشــبیلی پەرتووکەکــەی (الأحکــام)ی نووســی، قوتــابی ئــەو بــوو، لــە ئەندەلوس ساڵی (٥٤٩ك) کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: السیر للذهبي (٢٠/ ٢٤٩)، (٢١/ ١٩٩)..

٣- بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشتر (١/ ٥٤)، برکلمان (٦/ ٢٧٩).

سەبارەت بە (الأحكام الوسطى) دانەی زۆری هەن لە زۆر شوێندا: لە پەرتووكخانەی (الظاهرية) لە دیمەشق، (الخديوية) لە میسر، گەنجینەی گشتی و پادشایی لە ڕیبات، گەنجینەی (القرويين) لە فاس لە مەغریب[1].

بەڵام (الأحكام الصغرى) لە دوو بەرگدا چاپكراوە[2].

عەلبدولحەقی ئیشبیلی ئەگەریش شەرعناسێك بێت لەسەر مەزهەبی پێشەوا مالیك[3]، بەڵام پەرتووكەكەی (الأحكام) كۆكەرەوەی بەڵگەی فیقهی گشتییە، بەبێ كۆت و بەندكردن بۆ مەزهەبێك، یەكێك بوو لەو زانا گەورە نوێیانەی كە دەمارگیر نەبوون بۆ مەزهەبەكانیان، بەڵكو شوێنی فەرموودەی سەحیح دەكەوت[4].

كۆمەڵێك لە زانایان پەرتووكی (الأحكام الشرعية الصغرى)یان شەرح كردووە[5]:

(أ) موحەمەدی كوڕی ئەحمەدی كوڕی مەرزوقی تەلمەسانی مالیكی (٧٨١ك كۆچی دوایی كردووە).

(ب) موحەمەدی كوڕی عومەری كوڕی مورەحەلی شافیعی (٧١٦ك كۆچی دوایی كردووە).

(ج) عەبدولعەزیزی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی بەزیزە(ساڵی ٦٦٢ك كۆچی دوایی كردووە).

---

١- بڕوانە: بركلمان (٦/ ٢٧٩)، پێشەكی (العنبري) لەسەر (الأحكام الصغرى) (١/ ٥٨)، هەروەها ڕاڤە و كۆمێنتەكانی (عبد الرحمن بن عقيل الظاهري) (١٣٠ - ١٣٣).

٢- تحقيق الهليس وإشراف العنبري، ط١، ١٩٩٣، مكتبة ابن تيمية.

٣- الديباج المذهب لابن فرحون (١٧٥).

٤- بڕوانە: مقدمة العنبري (اللأحكام الصغرى) (١/ ٣٣).

٥- سەرچاوەی پێشتر (١/ ٦٠).

(د) عەبدولعەزیزی کوڕی خەلەف کوڕی ئیدریسی سولەمی شاتیبی (٦٦٢ك کۆچی دوایی کردووە).

٢/ (الأحكام الكبري) و (عمدة الأحكام) دانراوی لەبەرکار عەبدولغەنی کوڕی عەبدولواحیدی مەقدیسی حەنبەلی (٦٠٠ك کۆچی دوایی کردووە).

زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت: "خاوەنی (الأحكام الكبرى) و (الصغرى)"[1]، مەبەستی لە (الصغرى) پەرتووکە ناسراوەکەی بوو (عمدة الأحكام)، ئەم پەرتووکە چاپکراوە و لەبەردەستە[2]، کورتیکردۆتەوە تەنها لەو فەرموودانەی کە بوخاری و موسلیم لەسەری یەکدەنگن، ئەمەش لەپێناو کورتکردنەوە، ژمارەی فەرموودەکانی دەگاتە (٤٣٠) فەرموودە، لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی ڕێکخراوە، سەنەدەکانیشی سڕیوەتەوە، بە ناوهێنانی هاوەڵێك لە سەرەتای فەرموودەکە وازیهێناوە، زۆر جاریش هەندێ وێژەی نامۆی ڕاڤەکردووە، باسی هەندێك گێڕانەوەی کردووە کە بەبێ درێژکردنەوە مەبەستەکەی ڕوونکردۆتەوە، وا دەردەکەوێت کە پەرتووکی (عمدة الأحكام) کورتکراوەی (الكبرى) بێ، کە ئەویش بەبێ سەنەد بوو و بەناوی (الأحكام على أبواب الفقه) بوو[3]، کە لە حوکمی نەبووندایە، گومان دەکرێت کاریگەر بووبێت بە شێوازەکەی ئیشبیلی، شوێن ڕێگەکەی کەوتبێت، زانایان گرنگی زۆریان بە (عمدة الأحكام) داوە، هەریەك لەمانە شرۆڤەیان کردووە[4]:

أ. ئیبن دەقیقی عید (٧٠٢ك کۆچی دوایی کردووە) لە پەرتووکەکەیدا بەناوی (إحكام الأحكام) شەرحی کردووە، کە چاپکراوە و لەبەردەستە.

---

١- سير الأعلام النبلاء (٢١/ ٤٤٤).

٢- سير الأعلام النبلاء (٢١/ ٤٤٤).

٣- بڕوانە پێشەکی ئەحمەد شاکیر بۆ: إحكام الأحكام شرح عمدة الأحكام (١/ ٤٦).

٤- بڕوانە پێشەکی عەبدولقادیر ئەڕنائوت بۆ: عمدة الأحكام (١٠)، والرسالة المستطرفة (١٨٠).

ب. عومــەری کــوڕی عــەلی فاکیهــانی (٧٣٤ك کۆچــی دوایــی کــردووە) لــە پەرتووکەکەیدا بەناوی (رياض الأفهام في شرح عمدة الأحكام) شڕۆڤەی کردووە.

ج. موحەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەرزوقی تەلمەسانی مالیکی (٧٨١ك کۆچی دوایی کردووە) کە لە پەرتووکەکەیدا بەناوی (تيسير المرام في شرح عمدة الأحكام)دا شڕۆڤەی کردووە.

د. عومــەری کــوڕی عــەلی، ئـیبن مولـەقینی شـافیعی (٨٠٤ك کۆچـی دوایـی کردووە)، لـە پەرتووکەکەیـدا بـەناوی (الإعلام بفوائد عمدة الأحكام) شـڕۆڤەی کردووە[١].

هـ. موحەمەدی کوڕی یەعقوبی فەیروزئابادی شافیعی (٨١٧ك کۆچـی دوایـی کردووە) لە (عدة الحكام)دا شرۆڤەی کردووە.

و. ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلای عامیری غەززی دیمەشقی (٨٢٢ك کۆچی دوایی کردووە)، کوڕەکەی موحەمەدی کوڕی ئەحمەدی غـەززی (٨٦٤ك کۆچـی دوایـی کردووە) تەواوی کردووە.

ز. موحەمەدی سەفارینی حەنبەلی (١١٨٨ك کۆچی دوایی کردووە).

ح. عەبــدولقادری کــوڕی بــەدران (١٣٤٦ك کۆچــی دوایــی کــردووە) لــە پەرتووکەکەیدا (موارد الأفهام) شرۆڤەی کردووە.

٣/ (الأحكام الكبرى) و (المنتقى من أحاديث الأحكام)، کە هەر دووکیان هـی ئەلمەجد عەبدولسەلامی ئیبن تەیمیەی حەڕانی حەنبەلییە (٦٥٣ك کۆچـی دوایـی کـردووە). پەرتووکەکـەی (المنتقـى) ناسـراوە و چـاپکراوە و لەبەردەسـتە، لـە

---

١- دانەیەك لە پەرتووکخانەی زاهرییە بە ژمارە (٥٣٣٧) هەیە، پەرتووکخانەی ناوەنـدی لـە زانکـۆی (أم القـرى) بـە ژمـارە (٢١٦٠- ٢١٦٤) هەیـە، بڕوانـە: كشـف الظنـون (١٠٣)، مقدمـة محقـق (تحفـة المحتاج) لابن الملقن (١/ ٧٠)

پەرتووكەكــەی خــۆی (الأحكــام الكــبری) ڕێكــی خســتۆتەوە[1]، ژمــارەی فــەرموودەكانی (المنتقــی) گەیشــتۆتە (٥٠٢٩) فــەرموودە[2]، لەســەر دەروازەی فیقهی ڕێكخراوە، گەورەترین پەرتووكی چاپكراوە لە فـەرموودەكانی ئەحكامـدا، پێكدێت لـە كۆمـەڵێك فـەرموودەی پێغەمبـەر، كـە بنـەماكانی ئـەحكامی لەسـەر دادەمەزرێن، زانایانی موسـوڵمانان پشـتی پێدەبەسـتن[3]، لـە حـەوت پەرتووكـە ناسـراوەكەی فـەرموودە و دارەقـوتنی و بەیهـەقی، جیـا لەمانـەش لەسەرچـاوە سەرەكییەكانی فەرموودە هەڵێنجراوە، بەڵام سەنەدەكانیانی سڕیوەتەوە، لە زۆر شوێندا بۆچوونە فیقهییەكانی خۆی تێدا باسكردووە، كۆمەڵێك زانا هەڵسـاون بـە شرۆڤەكردنی پەرتووكی (المنتقی) لەوانە[4]:

أ. موحەمەدی كوڕی ئەحمەدی كـوڕی عەبـدولهادی حەنبـەلی (٧٤٤ك كۆچـی دوایی كردووە).

ب. ئەحمەدی كوڕی موحسینی كوڕی قازی لجەبەلی حەنبـەلی (٧١ك كۆچـی دوایی كردووە) و تەواوی نەكردووە.

ج. عومـەری كـوڕی عـەلی، ئـیبن مولـەقین (٨٠٤ك كۆچـی دوایـی كـردووە)، ئەویش تەواوی نەكردوە.

د. موحەمەدی كوڕی عەلی شەوكانی یەمەنی (١٢٥٠ك كۆچی دوایی كردووە)، لە پەرتووكەكەی خۆیدا (نیل الأوطار شرح منتقى الأخبار) شرۆڤەی كردووە، ئەم پەرتووكە لەچاپدراوە.

---

١- ذيل طبقات الحنابلة (٢/ ٢٥٢).

٢- بڕوانە: المنتقى من أخبار المصطفى، تحقيق محمد حامد الفقي.

٣- سەرچاوەی پێشتر (١/ ٣).

٤- المصدر السابق مقدمة المحقق (ص/ ت).

٤/ (الخلاصة في أحاديث الأحكام)[١] دانراوی ئەبو زەکەریا یەحیای کوڕی شەریفی نەوەوی شافیعی دیمەشقی، هەروەها پێشی دەگوترێت: (خلاصة الأحكام في مهمات السنن و قواعد الإسلام).

٥/(الإمام بأحاديث الأحكام) و (الإلمام بأحاديث الأحكام)، هەردووکیان دانراویی تەقییەدین، موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی دەقیقی عیدی مالیکی شافیعیە (ساڵی ٧٠٢کۆچی دوایی کردووە).

پەرتووکی (الإلمامی) لە پەرتووکی (الإمام) کورتکردۆتەوە[٢]، حاجی خەلیفە دەڵێت: "تێیدا دەقی ئەو فەرموودانەی کە تەنها پەیوەستن بە ئەحکامەوە بەبێ سەنەد کۆکردۆتەوە"[٣]. فەرموودەکانی (الإلمام) گەیشتۆتە (١٤٧١) فەرموودە و چاپیشکراوە، لە پێشەکی ئەم پەرتووکەدا وتوویەتی: "مەرجی من تێیدا ئەوەیە کە هیچ فەرموودەیەك نەهێنم ئەگەر چاکترین پێشەوای متمانەپێکراوی گێڕەرەوەی هەواڵ پشتڕاستی نەکردبێتەوە، سەحیح بوو لەسەر ڕێگەی ئەهلی حەدیسی لەبەرکار، یاخود پێشەوا شەرعناسانی وردبینکار".

هەندێکی شرۆڤەکردووە، بەڵام تەواوی نەکردووە، وتراوەیشە تەواوی کردووە، لە دوای مردنی تەنها هەندێکی دۆزراوەتەوە[٤]، کەتتانی دەڵێت: "هەندێکی لە کورتکراوەکە زۆر باش شرۆڤەکردووە، تێیدا داهێنانی کردووە، ناوی ناوە (الإمام في شرح الإلمام)"[٥].

---

١- دانەیەکی دەستنووسی لە (دار الكتب المصرية)ە بە ژمارە (٢٠٩) هەیە، کە (١٣٤) پەڕەیە، بڕوانە: كشف الظنون (١/ ٧١٧) .

٢- الرسالة المستطرفة (١٨٠)، بڕوانە: تذكرة الحفاظ (٤/ ١٤٨٢).

٣- كشف الظنون (١/١٥٨).

٤- سەرچاوەی پێشتر.

٥- الرسالة المستطرفة (١٨٠)، وتذكرة الحفاظ (٤/ ١٤٨٢)، ئێستا یەکێك لە خوێندکاران هەڵساوە بە تەحقیقکردنی بۆ وەرگرتنی پلەی دکتۆرا لە زانکۆی ئیمام موحەمەدی کوڕی سوعود لە ریاز.

هــەروەها موحەمــەدی کــوڕی ناســڕەدینی دیمەشــقی (٨٤٢ك کۆچــی دوایــی کردووە) شرۆڤەی کردووە[١].

٦/ (الأحكام الكبرى) و (المحرّر في الأحكام)[٢]. هەر دووکیان دانراوی لەبەرکار موحەمــەدی کــوڕی ئەحمــەدی کــوڕی عەبــدولهادی مەقدیســی حەنبەلیــە (٧٤٤ك کۆچی دوایی کردووە).

(المحــرر) چــاپکراوە، ژمــارەی فــەرموودەکانی دەگاتــە (١٣٠٤) فــەرموودە و لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی ڕێکخــراوە، لــە پێشــەکییەکەیدا دەڵێــت: "ئــەم کورتکراوەیە لە کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەر (دروود و سـڵاوی خــودای لــێبێ) پێکدێت لە بارەی حوکمە شەرعییەکان، لە پــەرتووکی زانــا ناســراو و لەبــەرکارە متمانــەپێکراوەکان وەرمگرتــووە، وەك موســنەدی پێشــەوا ئەحمــەدی کــوڕی حەنبەل، هەر دوو سەحیحی بوخاری و موسلیم..."[٣].

لەبەرکار ئیبن حەجەر ستاییشی پەرتووکەکەی کردووە و دەڵێت: "زۆر ڕێك و باشە"[٤]، بە کــورتکراوەی پــەرتووکی (الإلمــام)ی ئــیبن دەقیقــی عیــدی دانــاوە، هەروەها سیوتیش وا دەڵێت و نــاوی نــاوە (المحــرر في اختصــار الإلمــام)[٥]، بــەم شێوەیەش حاجی خەلیفە (ساڵی ١٠٦٧ك کۆچی دوایی کــردووە)[٦] شــوێنی ئــەم وتەیــە کــەوتووە، لــە کورتکراوەکــانی (الإلمــام)ی دانــاوە، هــەروەها شــەوکانیش هەمان بۆچوونی هەیــە[٧]، ئــەم وتەیەشــی لــە زەهــەبی وەرگرتــووە، بــەڵام ئــیبن

---

١- كشف الظنون (١/١٥٨)..

٢- ذيل طبقات الحنابلة (٢/ ٤٣٧)، والدر المنضد (٤٤)، وحاشيته.

٣- المحرر (١/ ٧٩) تحقيق يوسف المرعشلي.

٤- الدرر الكامنة (٣/ ٣٣٢).

٥- طبقات الحفاظ (٥٢٥)

٦-كشف الظنون (١/١٥٨).

٧- البدر الطالع (٢/ ١٠٨).

عەبدولهادی هیچ شتێکی لەم بارەوە باس نەکردووە، بەڵکو باسی ئەوەی کردووە کە (لە پەرتووکی زانا ناسراوەکانی وەرگرتووە... تاد). ئەمەش دەقێکی ڕاشکاوە لەلایەن نووسەرەکەوە، لەسەر ئەوەی کە دەڵێن ئەمە کورتکراوەی (الإلمام)ە، بەمشێوەیەش ئیبن عەبدولهادی دەقی هێناوەتەوە کە لەسەر ڕێکخستنی هەندێك شەرعناسی سەردەمی خۆی ڕێکیخستوون[1]. ئەگەر کورتکراوی (الإلمام) بوایە، ئەوا لەسەر ڕێگەی ئیبن دەقیقی عید دەڕۆیشت، بە ڕێکخستنەکەی پابەند دەبوو، هەروەك لە کورتکردنەوە بەم جۆرەیە، دواتر قەبارەی پەرتووکەکە و ژمارەی هەر دوو پەرتووکەکە زۆر لێك نزیکن، ئەگەر کورتکراوە بوایە، ئەوا دەبووایە سێیەك یان نیوەی (الإلمام) بوایە.

هەموو ئەمانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە پەرتووکی (الإلمام) هی ئیبن عەبدولهادیی خۆیەتی، لە سەرچاوە سەرەکییەکانی فەرموودە وەریگرتووە و کۆیکردۆتەوە، هەروەك لە پێشەکی پەرتووکەکەی باسی کردووە. سەبارەت بە پەرتووکەکەی (الأحکام الکبری) هیچ زانیارییەکی تەواو لەبارەیەوە نییە، ئیبن ڕەجەب لەبارەیەوە دەڵێت: "لەسەر ئەحکامەکانی لەبەرکار زیاء ڕێکخراوە"[2]، سیوتی دەڵێت: "(الأحکام) لەفیقهدایە"[3]، لەوانەیە لە پەرتووکەکانی (فەرموودەکانی فیقه بێت)، ئەمەش لە نووسینەکانی ئیبن عەبدولهادی دەردەکەون، کە زۆرینەی لەبارەی زانستی فەرموودە بوون، ئەگەریش هەیە لە پەرتووکەکانی فیقه بێت، هەروەك سیوتی دەڵێت. زانراویشە کە فەرموودەکانی فیقه لە پێناو فیقهدا دانراون، لەوانەیە سیوتی ئەم مانایەی مەبەست بووبێت کە دەڵێت (لەبارەی فیقهەوەن).

---

١- المحرر (١/ ٧٩).

٢- ذيل طبقات الحنابلة (٢/ ٤٣٧).

٣- طبقات الحفاظ (ص: ٥٢٥).

وتەی ئیبن ڕەجەب لەم بارەیەوە کە دەڵێت: "لەسەر ئەحکامەکانی لەبەرکار زیاء ڕێکخراوە"، مەبەست پێی موحەمەدی کوڕی عەبدولواحیدی مەقدیسی حەنبەلیە (٦٤٣ك کۆچی دوایی کردووە)، ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە مەبەستی ئیبن عەبدولهادی لە پێشەکی (المحرر)دا کە دەڵێت: (لەسەر ڕێکخستنی هەندێ شەرعناسی سەردەمی خۆمان ڕێکمانخستووە) واتە: زیائی مەقدیسی کە پەرتووکی (الأحكام)ی داناوە لە سێ بەرگدا[1].

ئیبن عەبدولهادی و زیاء هەر دووکیان مەقدیسی حەنبەلی بوون، ئەگەر ئیبن عەبدولهادی (الأحكام الكبرى)ی لەسەر شێوازی ڕێکخستنی زیائی مەقدیسی لە پەرتووکەکەی (الأحكام)دا ڕێکخستبێت، هەروەك ئیبن ڕەجەب وا دەڵێت، وا دەردەکەوێت کە (المحرر)یشی بەم شێوازە ڕێکخستبێت.

سەبارەت بە وتەی لێکۆڵەری پەرتووکی (المحرر): مەبەست لە وتەی ئیبن عەبدولهادی (هەندێك شەرعناسی سەردەمی ئێمە) ئەلمەجد ئیبن تەیمیە بووبێت لە پەرتووکەکەی (المنتقى)دا[2]، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە، بەڵکو ڕوانینێکی خێرا لە پێڕستی هەر یەکێکیان ئەم وتەیە پووچەڵ دەکاتەوە، هەروەك لە بەشی پاك و خاوێنی لە (المحرر)دا ڕێکخستن بەم شێوەیەیە: (دەروازەی ئاو، دەروازەی قاپ و ئامرازەکانی خواردن و خواردنەوە، دەروازەی سیواك، دەروازەی خەسڵەتی دەستنوێژ، دەروازەی مەسحکردنی سەر خوففەکان، دەروازەی هەڵوەشێنەرانی دەستنوێژ، دەروازەی حوکمی لەش پیسی، دەروازەی ئادابەکانی دەست بەئاوگەیاندن... تاد).

لەکاتێکدا ڕێکخستنەکە لە (المنتقى)دا بەم شێوەیەیە: (دەروازەی ئاو، دەروازەی پاکردنەوەی پیسییەکان، دەروازەی قاپ و ئامرازەکانی خواردن و

---

١- ذيل طبقات الحنابلة (٢/ ٤٣٨)، والدر المنضد (٣٥)، هەروەها بڕوانە: (السير) للذهبي (٢٣/ ١٢٨).

٢- المحرر (١/ ٧١).

خوداردنـــــەوە، دەروازەی خۆخاڵیکردنــــەوە، دەروازەی ســــیواك، دەروازەی خەسڵەتی دەستنوێژ.. تاد). بەڵکو ئیبن تەیمیە خۆی لە پێشەکی (المنتقى)دا[1] دەڵێــت: "فـــەرموودەکانی ئـــەم پەرتووکـــەم لەســـەر شـــێوازی ڕێکخســـتنی شەرعناسانی سەردەمی خۆمانم ڕێکخستووە..".

٧/ (تحفة المحتاج إلى أدلة المنهـاج) و(البلغـة في أحاديـث الأحكـام) نووسـینی عومەری کوڕی ئەحمەد، ئیبن مولەقینی شـافیعی میسـڕی (سـاڵی ٨٠٤ك کۆچـی دوایی کردووە).

بۆ خزمەتکردنی پەرتووکی (منهاج الطالبين) لە فیقهی شـافعیدا دایـناوە، کـە لە نووسینی موحییەددینی نەوەویە، بە هەمان ڕێکخستن و دەروازەدانانی بابەتی (المنهاج) دایناوە، لە پێشەکی (التحفة)دا باسی کردووە، کە هیچ فەرموودەیەکی تێدا نەنووسـیوە، تـەنها فـەرموودەی سـەحیح و حەسـەن نـەبێت، فـەرموودەی لاوازی نەهێناوەتـەوە، تـەنها ئەگـەر زۆر پێویسـتی پێـی نـەبووبێت، لەگـەڵ ڕوونکردنـەوەی لاوازییەکـەی[2]. ژمـارەی فـەرموودەکانی گەیشـتۆتە (١٨٢٥) فەرموودە، ئیبن مولـەقین پەرتووکەکـەی (التحفـة)ی کورتکردۆتـەوە و ناوینـاوە (البلغـة في أحاديـث الأحكـام)[3]، تـەنها لـە فـەرموودەکانی بوخـاری و موسـلیم کورتیکردۆتەوە، هەروەك عەبدولغەنی مەقدیسی لە (عمدة الأحكام)دا ئەم کارەی کرد.

لە پێشەکی (البلغة)دا وتویەتی: "ئەم پەرتووکـە پێکـدێت لـە فـەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سـڵاوی خـودای لـێبێ) ، کـە هـەردووك پێشـەوا موحەمـەدی

---

١- المنتقى (١/ ٣).

٢- تحفة المحتاج (١/ ١٢٩ - ١٣١) تحقيق اللحياني.

٣- دانەیەکی دەستنووس لە پەرتووکخانەی زاهرییە هەیە بە ژمارە (٣٥٨) فـەرموودە، وێنەیەکیشـی لە زانکۆی ئیسلامی لە مەدینەی پیرۆزە بە ژمارە (١٤٩١)، مقدمة اللحياني ل(تحفة المحتاج) (١/ ٧٤).

کوڕی ئیسماعیلی بوخاری و موسلیمی کوڕی حەججاج لەسەری یەکدەنگن، لەسەر شێوازی پەرتووکی (المنهاج) ڕێکخراوە، کە هی پێشەوا موحییەددینی نەوەویە، هەڵمبژاردووە لە پەرتووکەکەم (تحفة المحتاج إلى أدلة المنهاج).

٨/ (تقريب الأسانيد وترتيب المسانيد) دانراوی لەبەرکار زەینەدین عەبدولڕەحیمی کوڕی حوسەینی عێراقییە (٨٠٦ك کۆچی دوایی کردووە)، لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی ڕێکخراوە، لە پەرتووکەکەی خۆی (طرح التثريب في شرح التقريب) شەرحی کردووە، تەواویشی نەکردوە، کوڕەکەی لەبەرکار ئەبو زەرعە وەلییەدین ئەحمەد عەبدولڕەحیم (٨٢٦ك کۆچی دوایی کردووە)[١] تەواوی کردووە.

٩/ (دلائل المنهاج)[٢] نووسینی عەبدولمەلیکی کوڕی عەلی شافیعی حەلبی (٨٣٩ك کۆچی دوایی کردووە)، ئەمەش هەر بۆ خزمەتکردنی پەرتووکی (المنهاج) بوو، وەك پەرتووکی ئیبن مولەقین، نووسەرەکەی لە پێشەکییەکەیدا دەڵێت: "ئەو فەرموودانەی لەم پەرتووکەدایە لە سێ پەرتووك وەرمگرتوون، پەرتووکی (الإلمام)ی زانا تەقییەدین، ئیبن دەقیقی عید، پەرتووکی (المنتقى)ی زانای ئەلمەجد عەبدولسەلام ئیبن تەیمیەیە (ڕەحمەتی خودای لێبێت) و پەرتووکی (تحفة المحتاج إلى أدلة المنهاج)ی شێخ سیراجەددین، ئیبن مولەقین".

١٠/ (بلوغ المرام من أدلة الأحكام)ی لەبەرکار ئەحمەدی کوڕی عەلی، ئیبن حەجەری عەسقەلانی شافیعی میسرییە (٨٥٢ك کۆچی دوایی کردووە). کە لە بەناوبانگترین پەرتووکەکانی فەرموودەکانی ئەحکامە، لەچاپدراوە و لەبەر

---

١- ئەم پەرتووکە لە دیمەشق لە چوار بەرگ چاپکراوە، كشف الظنون (١/٤٦٤)

٢- دانەیەکی لە سەنتەری زانستیی لە زانکۆی ئومولقورا لە مەککەیە لە (٢١٥) پەڕاو بە ژمارە (٢٩٣) هەندێك لە قوتابیان لە خوێندنی باڵا وەك نامەی زانستی تەحقیقیان کردووە: دراسة اللحياني لـ (تحفة المحتاج) (١/ ١١٦)، (الضوء اللامع) (٥/٨٧).

دەستە، ژمارەی فەرموودەکانی دەگاتە نزیکەی (١٥٠٠) فەرموودە، لەسەر چەندین دەروازەی فیقهی ڕێکخراوە، بە دەروازەی (جامع في الآداب) کۆتایی پێ هێناوە.

قازی حوسەینی کوڕی موحەمەدی مەغربی سەنعانی (١١١٩ کۆچی دوایی کردووە) شرۆڤەی کردووە، ناویناوە (البدر التمام شرح بلوغ المرام)، سەید موحەمەدی کوڕی ئیسماعیل، ئەمیری سەنعانی (ساڵی ١١٨٢ك کۆچی دوایی کردووە) ئەم شرۆڤەیەی کورتکردۆتەوە و ڕێکیخستووە و شتی زۆر گرنگی تێدا نووسیوە[1]، لە پەرتووکە بەناوبانگەکەیدا (سبل السلام)، کە چاپکراوە و لەبەردەستە، ئەمیر سدیق حەسەن قنوجیش (١٣٠٧ك کۆچی دوایی کردووە) لە پەرتووکەکەی خۆیدا (فتح العلاّم) کورتی کردۆتەوە[2].

ئەمە بەناوبانگترین پەرتووکەکانی (فەرموودەکانی ئەحکام) بوون، کە ڕادەی گرنگیدانی فەرموودەناسان بەو هونەرە و بەرەوپێشچوونی هەر لە سەردمی هاوەڵان و دواتر شوێنکەوتووان و دواتر شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان، ئەوانەشی دوای ئەوان هاتن دەردەخات، کە دەستیان کرد بە کۆکردنەوە و نووسینەوە و ڕێکخستن و بەدواداچوونی، کە پووچەڵی بانگەشەی ڕۆژهەڵاتناسان و گومانەکانیان لەبارەی فەرموودە بە گشتی، فەرموودەکانی فیقهیش بە تایبەتی دەسەلمێنێت.

---

١- بڕوانە: مقدمة سبل السلام (٢١/١).

٢- بڕوانە پێشەکیەکەی: (٢/١).

# دەرئەنجامی توێژینەوەکە و ڕاسپاردەکان

١. به بەڵگەنامەکردنی فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (درووود و سـڵاوی خـودای لێبێ) به چوار قۆناغـدا دەڕوات، قۆنـاغی نووسـین (الکتابـة) نـویکی (١- ٧٠ك)، قۆناغی خسـتنه نـاو دوو تـوێی پـەرتووکێك (التـدوین)، لـه (٧٠- ١٢٠ك)، دواتـر قۆنــاغی ڕێکخســتن و دەروازه بۆدانــان (التصــنیف) (١٢٠- ١٥٠ك)، پاشــان دەرکەوتنی فەرهەنگه فەرموودەییەکان (١٥٠- ٢٠٠ك).

٢. تێنەگەیشـتنی گوزارشـت و زاراوەکـانی فەرموودەناسـان، بۆتـه هـۆی ئەوەی که ئەو دەرەنجامەی ڕۆژهەڵاتناسان پێیگەیشتوون هەڵە بێـت دەربـارەی مێژووی نووسینەوەی فەرمووده، وا تێگەیشتوون که وێژەی خستنه ناو دووتوێی بەرگێك (التدوین)، هەمان واتای نووسینەوه (الکتابة)ی هەیە.

٣. (موطأ)ی پێشەوا مالیك و (جامع)ی موعەممەری کوڕی ڕاشید، کـه هـەر دووکیان بەچاپگەیەنراون، له قۆناغی دەروازه بۆدانـان (التصـنیف)دا نووسـراون واته: پێش نیوەی دووەمی سەدەی دووەم.

٤. هــەروەها ســەحیفەی هــەممامی کــوڕی مونەبیــه، ئــەم پەرتووکــەش چاپکراوه، له کۆتایی قۆناغی یەکەم نووسراوه، که قۆناغی نووسینەوەیە.

٥. تا ئێستاش زۆر له دەستنووسەکان ماون، تا ئێستاش چاپنەکراون، کـه هی قۆناغی نووسینەوه و خسـتنه نـاو پەرتووکـه، توێـژەران و سـاغکەرەوان لـه هەوڵدان بۆ ئەوەی لەچاپ بدرێن.

٦. یەکێك لەو هۆکارانەی که وای کردووه گرنگی بـه سـوحوف و پەرتووکـه کۆنــەکان نــەدرێت: دەرکــەوتنی پــەرتووکی ڕێکخــراو بــه دەروازەی فیقهــی و فەرهەنگه فەرموودەییەکانن، که زۆرێك لـه فـەرموودەکانی پێشـتر لـەخۆدەگرن،

زانایانیش زیاتر پەرتووکە ڕێکخراو و فەرهەنگە فەرموودەییانەیان گرنگی پێدا و سوحوف و پەرتووکە کۆنەکانیشیان وەلانان، کە لەناو ئەو پەرتووکە فەرهەنگییانەدا هەبوون، وەك موسنەدی ئەحمەد و موسەنەفی عەبدولڕەزاق و موسەنەفی ئیبن ئەبی شەیبە.

٧. هەروەها دەرکەوتنی پەرتووکە سەحیحەکان و سونەنەکان، وای کرد زاناکان گرنگی زیاتر بەمانە بدەن، و ئەوانەی پێشتر پشتگوێ بخەن.

٨. بوونی هەر دوو زاراوەی (حدثنا) و (أخبرنا)، بووەتە هۆی ئەوەی وا بزانرێت، کە فەرموودە بەردەوام تەنها بە زارەکی گوازراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەش فەرموودەناسان ئەم زاراوانەیان بەکارهێناوە، بۆ سەلماندنی ئەوەی ئەم قوتابییە ڕاستەوخۆ لە پەرتووکی مامۆستاکەی و لە زاری مامۆستاکەی گوێبیست بووە، یاخود سەلماندنی خوێندنەوەی پەرتووکەکەی بووە بۆ نووسەرەکەی، یاخود بۆ ئەو کەسەی کە لە نووسەرەکەی وەرگرتووە، بوونی زاراوەی (حدثنا) و (أخبرنا) مانای بوونی نووسینەوە ڕەتناکاتەوە.

٩. لەبەر ئەوە توێژەر ئەو ڕاسپاردەیە دەخاتەڕوو، کە ئەنجامدانی توێژینەوە بۆ زانینی سەرچاوە فەرموودەییە کۆنەکان گرنگن، کە خاوەنی موسنەد و سەحیح و سونەنەکان کەرستەی پەرتووکی خۆیانیان لێوەرگرتوون.

١٠. هەروەك توێژەر ئەو ڕاسپاردەیەش دەخاتەڕوو، گرنگی بدرێ بە خوێندنەوەی توێژینەوەی ڕۆژهەلأتناسەکان، دەربارەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروود و سلاوی خودای لێبێ) و توێژینەوەیان بەشێوەیەکی بابەتی و زانستی، هەماهەنگی کردن لەگەڵ سەنتەرەکانی توێژینەوە ڕۆژهەلأتناسییەکان بۆ ئەوەی ئەم توێژینەوانە ببینن و بیخوێنەوە، هەروەها بەستنی کۆنگرەی زۆر دەربارەی دۆزینەوە زانستییە نوێیەکان لەم بوارەدا.

# پێرستی سەرچاوەکان


١. إحكام الأحكام، ابن حزم، تحقيق: أحمد شاكر، طبعة سنة ١٩٨٧م، كراتشي، الهند.

٢. أخبار القضاة، ابن وكيع، طبعة عالم الكتب، بيروت.

٣. أسد الغابة، ابن الأثير، طبعة أولى – سنة ١٨٦٩م، القاهرة.

٤. أصول التخريج، د. محمود الطحان، طبعة أولى– سنة ١٩٨٣م، المعرفة، الرياض.

٥. أطراف المسند، ابن حجر، تحقيق: زهير الناصر، طبعة أولى – سنة ١٤١٤هـ، دار ابن كثير، بيروت.

٦. إعلام الموقعين، ابن القيم، تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد، طبعة دار الفكر، بيروت.

٧. أهمية المخطوطات، جورج مقدسي، طبعة سنة ١٩٩٢م، مؤسسة الفرقان للتراث، لندن.

٨. الإحسان بترتيب صحيح ابن حبان، ابن بلبان، تحقيق: الأرنؤط، طبعة أولى– سنة ١٤٠٨هـ، الرسالة، بيروت.

٩. الإرشاد، الخليلي، تحقيق: محمد سعيد إدريس، طبعة أولى– سنة ١٩٨٨م، دار الرشد، الرياض.

١٠.الإصابة، ابن حجر، طبعة أولى– سنة ١٩١٠م، السعادة، القاهرة.

١١. الإعلان بالتوبيخ، السخاوي، تحقيق: فرانز لوزنترال، طبعة أولى– سنة ١٩٨٦م، بيروت.

١٢. الأم، الشافعي، طبعة ثانية– سنة ١٤٠٣هـ، دار الفكر، بيروت.

١٣. الأنوار الكاشفة، المعلمي، طبعة أولى، أنصار السنة، القاهرة.

١٤. الأوسط في السنن، ابن المنذر، تحقيق: أحمد حنيف، طبعة أولى– سنة ١٩٩٤م، طيبة، الرياض.

١٥. البحر المحيط، الزركشي، طبعة ثانية– سنة ١٩٩٢م، وزارة الأوقاف– الكويت.

١٦. البداية والنهاية، ابن كثير، تحقيق: أحمد ملحم، طبعة خامسة– سنة ١٩٨٨م، دار الكتب العلمية، بيروت.

١٧. البداية والنهاية، ابن كثير، طبعة سنة ١٩٨٢م، بيروت.

١٨. تاريخ ابن خلدون، ابن خلدون، طبعة أولى، دار الأعلمي للمنشورات، بيروت.

١٩. تاريخ الأدب العربي، بروكلمان، طبعة أولى- سنة ١٩٣٨م.
٢٠. تاريخ الذهبي، الذهبي، تحقيق: التدميري، طبعة سنة ١٩٨٨م، دار الكتاب العلمي، بيروت.
٢١. تاريخ التراث العربي، فؤاد سزكين، ترجمة: محمد فهمي، طبعة سنة ١٩٨٣م، الرياض.
٢٢. التاريخ العربي والمؤرخون، مصفى شاكر، طبعة ثانية- سنة ١٩٧١م، العلم، بيروت.
٢٣. التاريخ الكبير، البخاري، طبعة أولى- ١٩٤٢م، دائرة المعارف العثمانية.
٢٤. تاريخ بغداد، الخطيب البغدادي، تصوير دار الكتب العلمية، بيروت.
٢٥. التدوين في تاريخ قزوين، الرافعي، تحقيق: عزيز الله عطاري، طبعة أولى- سنة ١٤٠٨هـ، دار الكتب العلمية، بيروت.
٢٦. تذكرة الحفاظ، الذهبي، طبعة سنة ١٩٥٧م، دار المعارف العثمانية.
٢٧. التراتيب الإدارية، الكتاني، طبعة أولى- ١٩٢٧م، الأهلية، المغرب.
٢٨. تقييد العلم، الخطيب البغدادي، تحقيق: يوسف العش، طبعة ثانية، سنة ١٩٧٤م، دار إحياء السنة، مصر.
٢٩. التمهيد، ابن عبد البر، طبعة ثانية- سنة ١٤٠٢هـ، وزارة الأوقاف المغربية.
٣٠. التمييز، مسلم، تحقيق: مصطفى الأعظمي، طبعة ثالثة- سنة ١٩٩٠م، الكوثر، الرياض.
٣١. تهذيب التهذيب، ابن حجر، طبعة أولى- سنة ١٩٠٧م، تصوير الكتاب الإسلامي- بيروت.
٣٢. تهذيب السنن، ابن قيم، بحاشية مختصر السنن للمنذري، تحقيق: أحمد شاكر ومحمد الفقي، طبعة أولى، مكتبة السنة، القاهرة.
٣٣. تهذيب الكمال، المزي، تحقيق: بشار عواد، طبعة أولى- سنة ١٩٩٢م، الرسالة، بيروت.
٣٤. الثقات، ابن حبان، طبعة أولى- سنة ١٣٩٣هـ، دائرة المعارف العثمانية، الهند.
٣٥. الجامع، معمد بن راشد، بآخر مصنف عبد الرزاق، تحقيق: حبيب الرحمن، طبعة أولى- سنة ١٩٨٢م، بيروت.
٣٦. الجامع الصحيح، البخاري، مع فتح الباري، تحقيق: محب الدين الخطيب و ترقيم عبدالباقي، طبعة أولى، السلفية، القاهرة.
٣٧. جامع بيان العلم، ابن عبد البر، طبعة ثانية- سنة ١٩٨١م، دار الكتب الإسلامية، القاهرة.

٣٨. الجرح والتعديل، ابن أبي حاتم، طبعة أولى– سنة ١٩٥٢م، دائرة المعارف العثمانية، الهند.

٣٩. حضارة العرب، جوستاف لوبون، ترجمة: عادل زعيتر، طبعة أولى، القاهرة.

٤٠.حلية الأولياء، أبو نعيم الأصفهاني، تصوير دار الكتب العلمية، بيروت.

٤١.دراسات في الحديث النبوي، د. محمد الأعظمي، طبعة ثالثة، سنة ١٩٨١م، الطباعة، الرياض.

٤٢. الرسالة، الشافعي، تحقيق: أحمد شاكر.

٤٣. الرسالة المستطرفة، الكتاني، طبعة رابعة– سنة ١٩٨٦م، دار البشائر، وأيضا نسخة تصوير دار الكتب المصرية، بيروت.

٤٤.زاد المعاد، ابن القيم، تحقيق: الأرنؤوط، طبعة: ٢٣– سنة ١٩٨٨م، الرسالة، بيروت.

٤٥. السنة قبل التدوين، عجاج الخطيب، طبعة سنة ١٩٨١م، دار الفكر، بيروت.

٤٦. السنن، ابن ماجة، ترقيم عبدالباقي، طبعة أولى، المكتبة الإسلامية، اسطنبول.

٤٧. سنن أبي داود، سليمان بن الأشعث، بعناية عزت الدعاس، طبعة أولى– سنة ١٩٦٨م، بيروت.

٤٨. سنن الدارمي، الدارمي، تحقيق: مصطفي البغا، طبعة أولى– سنة ١٩٩١م، دمشق.

٤٩. السنن الصغرى، النسائي، عناية عبد الفتاح أبو غدة، طبعة ثانية– سنة ١٩٨٨م، دار البشائر، بيروت.

٥٠. السنن الكبرى، البيهقي، طبعة أولى، دائرة المعارف العثمانية.

٥١. سير الأعلام، الذهبي، طبعة تاسعة، سنة ١٩٩٣م، بيروت.

٥٢. شرح معاني الأخبار، الطحاوي، تحقيق: محمد النجار، طبعة ثانية– سنة ١٩٨٦، بيروت.

٥٣. صحيح ابن خزيمة، ابن خزيمة، تحقيق: مصطفى الأعظمي، طبعة ثانية– سنة ١٩٧٥م، مكة المكرمة.

٥٤. صحيح مسلم، مسلم بن الحجاج، ترقيم: عبد الباقي، طبعة المكتبة الإسلامية، اسطنبول.

٥٥. الطبقات، ابن سعد، تحقيق: عبد القادر عطا، طبعة أولى– سنة ١٩٨٩م، دار الكتب العلمية، بيروت.

٥٦. العلل، أحمد بن حنبل، رواية: أبي داود، تحقيق: محمد منصور، طبعة أولى– سنة ١٩٩٣م، دار العلوم، المملكة العربية السعودية.

٥٧. العلل، أحمد بن حنبل، رواية المروذي، تحقيق: وصي الله عباسي، طبعة أولى– سنة ١٤٠٨هـ، الدار السلفية، الهند.

٥٨. العلل، ابن أبي حاتم الرازي، تحقيق: محب الدين الخطيب، طبعة رابعة– سنة ١٩٨٤م، المعرفة، بيروت.

٥٩. العلل، ابن المديني، تحقيق: مصطفى الأعظمي، طبعة ثانية، سنة ١٩٨٢م، المكتب الإسلامي، بيروت.

٦٠. العلل ومعرفة الرجال، أحمد بن حنبل، رواية: عبد الله، تحقيق: وصي الله عباسي، طبعة أولى– سنة ١٩٨٧م، المكتب الإسلامي – بيروت.

٦١. علوم الحديث، ابن الصلاح، تحقيق: نور الدين عتر، طبعة سنة ١٩٨٦م، دار الفكر، دمشق.

٦٢. العواصم من القواصم، ابن الوزير، تحقيق: الأرنؤوط، طبعة أولى– سنة ١٩٨٦م، الأردن.

٦٣. عيون الأثر، ابن سيد الناس، طبعة أولى– سنة ١٩٩٢م، دار التراث، المدينة المنورة.

٦٤. فضل الموطأ، عباس محمد العلوي، طبعة أولى– سنة ١٩٧٨م، السعادة، مصر.

٦٥. الفهرست، ابن النديم، تحقيق: جونس ردجر، طبعة أولى– سنة ١٨٧١م.

٦٦. القضاء في عهد عمر، المطرفي، طبعة أولى– سنة ١٩٨٦م، دار المدينة، جدة.

٦٧. الكامل في الضعفاء، ابن عدي، تحقيق: سهيل زكار، طبعة ثالثة– سنة ١٤٠٩هـ، دار الفكر، بيروت.

٦٨. الكفاية، الخطيب البغدادي، تحقيق: عمر هاشم، طبعة أولى، دار الرسالة، بيروت.

٦٩. لسان العرب، ابن منظور، طبعة سنة ١٩٨٩م، دار صادر، بيروت.

٧٠. مجموع الفتاوي، ابن تيمية، طبعة سنة ١٩٩١م، عالم الكتب، الرياض.

٧١. مجموعة الوثائق السياسية، محمد حميد الله، طبعة سادسة– سنة ١٩٨٦م، النفائس، بيروت.

٧٢. مختصر السيرة النبوية، ابن هشام، طبعة سنة ١٩٣٧م، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد، وطبعة دار الكتب العلمية، بيروت.

٧٣. المسند، أحمد بن حنبل، طبعة أولى، الميمنية، مصر، تصوير المكتب الإسلامي، بيروت.

٧٤. مسند أبي يعلى، أبو يعلى الموصلي، تحقيق: سليم أسد، طبعة أولى- سنة ١٩٩٣م، دار الثقافة العربية، بيروت.

٧٥. مصادر الشعر الجاهلي، ناصر الدين الأسد، طبعة أولى- سنة ١٩٧٠م، بيروت.

٧٦. المصنف، ابن أبي شيبة، تحقيق: كمال الحوت، طبعة أولى- سنة ١٩٨٨م، بيروت.

٧٧. المصنف، عبد الرزاق الصنعاني، تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي، طبعة أولى- سنة ١٩٨٢م، المكتب الإسلامي- بيروت.

٧٨. المعجم الكبير، الطبراني، تحقيق: عبد الحميد السلفي، طبعة ثانية، وزارة الأوقاف العراقية.

٧٩. معرفة النسخ الحديثية، بكر بن عبد الله، طبعة أولى- سنة ١٤٢٠هـ، الرياض.

٨٠. المعرفة والتاريخ، البسوي، تحقيق: أكرم ضياء العمري، طبعة أولى- سنة ١٩٨٩م، الدار، المدينة المنورة.

٨١. المفصل في تاريخ العرب، جواد علي، طبعة أولى- سنة ١٩٧٢م، دار العلم، بيروت.

٨٢. منهج النقد عند المحدثين، د. محمد الأعظمي، طبعة ثالثة- سنة ١٩٩٠م، الكوثر، الرياض.

٨٣. ميزان الإعتدال، الذهبي، تحقيق: البجاوي، طبعة دار الفكر.

٨٤. نصب الراية، الزيلعي، طبعة أولى- سنة ١٩٣٨م، المجلس العلمي، الهند.

٨٥. الهداية تخريج البداية، الغماري، تحقيق: يوسف المرعشلي، طبعة أولى- سنة ١٤٠٧هـ، بيروت.

٨٦. هدي الساري، ابن حجر، تحقيق: محب الدين الخطيب، طبعة أولى، السلفية، القاهرة.

٨٧. الوافي في الوفيات، صلاح الدين الصفدي، تحقيق: هلمت رايتر، طبعة أولى- سنة ١٩٦٢م، فسباند.

# سەرچاوە بیانییەکان

1- Gold Ziher, History of Classical Arabic Lit Literature, Trans by J. Desomgyi, Hildesheim 1966.

2- Robson, Muslim Tradition, Manchester Memoris, 1951.

3- Robson, The Isnad in Muslim Tradition Glasgow, Unif. Oriental Society Transaction Quoting Dellislam.

4- Schacht, Arevaluation of Islamic Traditions,J.A.R.S. 1949.

5- Schacht, Introduction to Islamic law, Oxford, 1964.

6- Schacht, Origins of Muhammadan Juris Prudence, Oxford, 1959.

***